کەریمی حسامی

# لە بیرەوەریەکانم

بەرگی - یەکەم

لە مندالیەوە تا سالی ١٩٥٧

کەریمی حسامی

# لە بیرەوەریەکانم

بەرگی - یەکەم

لە منداڵیەوە تا ساڵی ١٩٥٧

## WEŞANÊN JÎNA NÛ

* 1925 KÜRT AYAKLANMASI (Serîhildana Şêx Saîd)
Prof. M.A. Hasretyan, Dr. K.M. Ahmad, M. Ciwan
* RONAHÎ (Hemû Hejmarên wê yên ku di navbera 1942- 1945-an de derketibûn)
* JIYANA REWŞENBÎRÎ Û SIYASÎ YA KURDAN (Di dawiya sedsala 19-an û destpêka sedsala 20-an de)- Bi Kurmancî, Dr. Celîlê Celîl.
* BÜYÜK ANAYURT SAVAŞINDA KÜRTLER 1941-1945, H.M. Çetoev
* KOMARA DEMOKRATÎK A KURDISTAN (MAHABAD)- Bi Kurmancî, Kerîm Husamî
* ROJA NÛ (Hemû hejmarên wê yên ku di navbera 1943- 1946-an de bi hefteyî derketibûn)
* KÜRT MİLLİYETÇİLİĞİ VE ABDULLAH CEVDET–Malmısanij
* DENGE XEZIKAN (Karikatör)-Mamoste
İMAGES DU KURDİSTAN DE TUROUİE ( Hommage a Yılmaz Güney Albuma Fotografan)-Şuayip Adlıg

Navnîşan:
Jîna Nû Förlaget
Post Box 240 12
750 24 Uppsala/ Sweden
Postgiro: 50 37 99- 9

ئه م نوسه ر و پیاوه مه زنانه که ده بوایه بیره وه ری ژیان و به سه ر هاتیان بنوسـ سریته وه به لکوو بەو مه به سته بـوو که نه ته وه که م له ژیان و به سه رهاتـی کـوره جـوتیر و زه حمه تکیشیکی کورد ئاگادار بـی و له پـه نا بیره وه ریه کانـی دا لـه گوشه یه کـی خه بات و تیکوشانـی نه ته وه که ی بـو ئازادی و رزگاری له ساله کانی دوای شه ری دووه مـی جیهانیه وه شاره زابـی . ئـه ز نامـه وی میژوو بـنووسم وله تواناشم دانـیه . من سەر گورزەشت و ژیان و به سه ر هاتـی خـوم ده نـووسمه وه . له به ر ئـه وه له سه ره تای پـه یدا بـوونـی چـوزەرەی خـه باتـی گه له که مان له کوردستانـی ئیران و له ته مـه نـی ۲۰ سالـیه وه له نیو به زم و گیره وکیشه دا بـوم وردەچـی خـوینه ری به ریزی کورد به خـوینده نه وه ی ئه م بیره وه ریانه کەلـیك که لیمن و قوژبنـی خه باتـی گه له که ی بـو روون بنه وه . دیاره له سه ره تاوەزور شتم یاد داشت نه کـردوه و زور شتیشم لـی ون بـوەوه ك دیفاعیاتـی خـوم له دادگای نیزامـی دا که به خـه تـی یوسفـی ریزوانـی نـووسرا بووه . کەلیك بـه سه ر هاتیشم له بیر نه چـوونه وه و لیره دا باسیان کراوه . له به شـی رووداوه سیا سـیه کاندا هـه ولم داوه هیچ شتیکی ناراست و دوور له واقعیه ت نه نوسم .

هیوا دارم ئه م بیره وه ریانه بـوخـوینه ری به ریزی کـورد تام و چـیژی خـوی هـه بـی و ئه گه ر هـه له وچـه وتیکیشیان بـه رچاوکەوی به گـه وره یـی خـویان لـیم ببورن .

۲۱ سەرماوەزی ۱۳٦۳ — ۱۲ دسامبری ۱۹۸٤

کـه ریمی حسـامـی

## بەشی یەکەم

## سەردەمی منداڵی و خوێندنی ناتەواو

وەك باوکم بە دابی کۆنی خوێندەواری کورد لە پشتی قورعان نووسیویە و لە پێناسەدا تۆمار کراوە. ڕۆژی ١٩ بە فرانباری ساڵی ١٣٠٥ ی هەتاوی ٩ ی مانگی ژانویەی ١٩٢٦ ی زایینی لە گوندی (بەمیرەم) ناوچەی مەنگوڕی مەهاباد لە خێزا- نێکی وەرزێر و دیندار لە دایك بووم. ئەوەندەی خۆم لە بیرمە قەت دەوڵە- مەند و دەست ڕۆیشتوو نە بووین. بەلام وەك بیستوومە ماڵە باپیرم (عەولای خدرە هاری) دەوڵەمەندێکی قورسی گوندی قزلجە بوون. خاوەنی مەڕو ماڵات و تاوڵ و - چیغ و هەوار و یانە مەڕ و مەزراو جووت وگا و خەلە خرمانی زۆر بوون.

وەك باس دەکەن کاتێك پاییزان تاوڵی ماڵە باپیرم لە کوێستانی چەکچ و ماڵووك هاتوتەوە خوار هیچ ماڵێکی قزلجە نە بوە کە ڕۆن و ماست و پەنیری ماڵە باپیرەی بۆ نە چوو بێ. دەڵێن هەر کەس بۆ پیداویستی و داخوازێك چوو بێتە ماڵە باپیرم بە ناهومێدی و بە دەستی بە تاڵ نەگەڕاوەتەوە.

بابم (میرزا حامید) پیاوێکی خوێندەوار و بە سەلیقە و تێگەیشتوو لە نێو خەڵك دا خاوەنی قەدرو ڕێزێکی تایبەتی بوو. مامۆستا هێمن شاعیری بەرزی کوردستان دەڵێ: "میرزا حامید تاقە کەسێك بوو کە شێخ الاسلامی باوکی لە بەری هەلدەستا.". ئەوەی من لە بیرمە بابم میرزا وکار بە دەستی میناغای قزلجە بوو. میناغا تەواوی کار وباری خۆی بەو ئەسپارد بوو هەر چی کردبای لێ پرسینەوە نە بوو. میناغا یەکێك لە دەرەبەگە گەورەکانی دێبوکری و خاوەنی گوندەکانی (بەمیرەم و بەرەجوو و قزلجە و کردەبەردان) بوو. سێ کوڕی هەبوون، میرزایەکی ڕاگرتبوو بە ناوی (میرزا ڕەسوڵی پیکولە) کە دەرس بە کورەکانی بڵێ. منیش لەگەڵ برایەکی لە خۆم گەورەتر و کوڕێکی مەلاعەولا بە ناوی ڕەحمان لای میرزا ڕەسول دەمانخوێند.

باش لە بیرم نیە خوێندنم چۆن دەست پێکردوە. ئەوەندە دەزانم منداڵێکی ژیروو ریا بووم. ماموستاکەمان فرە تورە وتوند بوو. زوری لی دەداین. دە فەلاقەی دەکردین. لە بیرمە شەویك چوو بووینە قوماران و ماموستا پێی زانیبوو. بەیانی کە چووینە مەکتەب ماموستا لە کورەکانی ئاغای پرسی :

ـ دەرسەکانتان رەوان کردوە ؟ . شەو لە کوێ بوون ؟ .

یەك بە یەك بە قوتابیان دا هات و لێی پرسین و دەرسەکانی پێ دەگوتنەوە و لە بەریان نەدە بوو.

کاتێك نورەی من هات گوتم : "شەو لە قوماران بووین . دەرسە کەشم لە بەر بوو. فەراشی نارد دەستە شولێکی تەری هێنا و گوتی ئێستا هەموتان لە فەلاقە دەدەم. منداڵەکان زەرد هەڵگەران و دەستیان کرد بە گریان . من رابووم و گوتم

ـ ماموستا خۆمن دەرسم رەوان بوە. بە منیان ببەخشە .

پێکەنی . . . . ئەوە بە ( جرجوکتان دەبەخشم ) .

هەر لە ساڵەکانی هەوەلی منالیم دابوو کە هەستم بە دەست کورتی و نەداری کرد . کورانی ( خاڵ ئوغلی ) کە عەجەمی تەوریز بوون مناغایان لە گوندی ( بەیرەم ) دەر کرد . ئیمەش ناچار بووین لە بەیرەم بار کەین و بچینە قزلجەی خواری . مەکتەب و دەرس و خوێندنمان تێکچوو. بابم برا گەورە کەمی برد بۆ ناوچەی شنو ولە ماڵە خزمێکمان دایناکە لە حوجرەی فەقێیان بخوێنێ .

منیشیان لە بەیرەم لە ماڵی ( مەلا رەحمانی مام جەلال ) بە جێ هێشت کە دەرسم پێ بڵێ . مەلا رەحمان یەکێك لە باشە مەلاکانی کوردستان و لە ماڵی خۆیدا زور بە ئەعیانی دەژیا و خاوەنی خزمەتکار و دەست و پێوەند و ژیانی لەگەل مەلاکانی گوندی فەرقی هەبوو.کورێکی لە من پچوکتری هەبوو. روژێك لە دیوی ژوری دەگریا . ماموستا فەرمووی بچم بیهێنم. کە چووم دایکی نەیهێشت ماموستا توورە بوو.سەرەو خوار لە کولە کە هەڵی ئاوەسیم .نوکە رێکی نارد شولکی تەریان هێنا . ئەوەندەی لە بەری پێیان دام تا خوێنم لە قاچکان هات . چەند روژ نەم دەتوانی باش بروم . روژێك ماموستا بە سەفەر چوو بوو لاقم هاتبونەوە سەرە خووەدەر کە وتم و ملی رێگام گرت کە بچمەوە قزلجە. لە رێگاش دەترسام . هێشتا لە پەنا گوندی بووم ئاشنایەکی بابم بە سواری بو قزلجە دە چوو. وەك

پیاوان سواری پاشتە رکـی خـوی کرد م و برد میە وە مالـی . باوکم بە تاوانـی ئـە و ە کە بە بـی ئیزنی ماموستا هاتوومـەوە د ە ستیکی باشی کوتام. پاشان نە یان نارد مـەوە بە یرە م و لە قزلجـە لە لای ماموستا مـە لا ئە حمە د ی چاو رە ش کە مـە لای گوند ی بوو د ە رسم د ە خـوێند . گولستان و بوستان و یوسف و زولیخای پێ د ە گوتم . زوربـەی شیعرە کانـی یوسف وزولیخام لە بە رکرد بـوون . د یار بوو ماموستا زور شارە زا نە بـو باوکم هیند ی جار مانای شیعرە کانـی بۆ راست د ە کرد مـە وە .

نازانم چ سالیك بوو لە پرِاسارد ی پایزمالمان باری کرد و بو ناوچـەی شنورویشتین. د لکم خـوشکەزایە کـی هـە بوو هات مالە کە ی بار کرد ین و بۆ گوند ی ( جوبریلاوا .

لـە وی بـی خانو وجـی و ری هـە ر لە سە ر مالە پووم د ە ژیایین . پاش ماویـە ك بابم لە گوند ی ( خلتاوی) جیگای خـواستە وە و بوو بە پێش نوێژی ئـە م گوند ە . خەلك زوریان رێز لێ د ە گرت،بە لام نە د اری و هـە ژاری بالـی بە سە ر ژیانمان د ا کیشابو . خـوێند نمان تیکچوو بوو. براکە ئم هاتبو وە مال و بابم جار وبار د ە رسـی پـێ د ەگوـ تین بە لا م لە بە ر فیکری نە د اری و د ە ستکورتـی زور ئاوری وی نە د ە د اين . کە لـیك جارین لە خـۆ وە لـێ ی د ە د اين . بابم کە سە رد ە میك د ەولە مـە ند و بە د ە ستە لا تـو خاوە ن میرد وـمیوان بوو، ئیستا ش لـێ ی قـە وماب‌وو، ناچار بوو بـۆ ژیان پێش نوـ یژی بکا، هـە میشە نارەحـە ت و کز و توورە بوو. جار جار ئە و توورە بیەی بە ئیمە د ە ر د ە کرد .

د لکم ئامـوزایە کـی هـە بوو بەناوی ( قاد ر زەنگە) خـوشکیکی پچـوکـی د ا یکمی مارە کرد بوو. لە گوند ی ( پرد اوی ) نوکە ری کاك عـە ولای پرد اوی بوو. و ە زعـی ژیانـی باش و جوتبە ندیکی حال خـوش بـوو. جار وبار ئارد ی بو د ە نارد ین و بانگی د ە کرد ین . ئەز وکاکم چـە ند روژ لە مالە خالم د ە ماینە وەو لە گە ل کورە کانـی ئە و یاریمان د ە کرد . پاشان د ە ر کە وت ئە و چاکە و د لسوزیە ی قاد ر زە نگە لە بەر خزمایە تـی و پیاو ە تی نە بوە . تاقـە شتیکی لەمالـی ئیمە د ا جێ ی د لخـوشی و شوێنە واری رابرد وو بـوو، سـە ماو ە ریکی میسواری زەرد ی فرە جـوان و بە نرخ بوو . بابم لـە کاتـی خـۆی د ا کریبووی و زینە تـی مال بوو. د لیکیشم جـوونە گواریکی زێری هـە بـوو سە رە رای نە د اری و د ە ستکورتـی نەیان د ە ویست سە ماو ە ر و گوارە کە بفروشن .

لەم نەد اری و د ەست تەنگـیەد ا روژیك قاد ر زەنگە ی خالم کورە گە ورە کە ی نارد و

داوای کرد بوو که میوانم هاتوون وکچه که م ده خوازن سه ماوه ره که م بوو
بنیون پاشان ده یبنیرمه وه. سه ماوه ریان دایه وله گه ل خوّی برد. سه ماوه ر ــ
هیّشتا نه هاتبوه وه روّژیک خالم په یدا بوو. پاش خواردنی نان وچا گوتی.
" ئه وه کچه که م ده گویّزمه وه. هاتووم گواره کانم به ئه مانه ت بده نی و پاشان له
گه ل سه ماوه ره که ده یان نیرمه وه. دایك له به ر خزمایه تی و میرد کردنی
خوشکه زای گواره کانی دایه. چه ند مانگ پیّچوو گواره و سه ماوه ر خه به ریان
نه بوو. روّژیک دایکم له گه ل برا گه وره که م چوو بو داوی سه ماوه ر و گواره کان
بیّتیه وه به لام به ده ستی خالی و به چاوی گریانه وه گه راوه. قادر زم نگه
گوتبووی. " چه ند جار ئاردم بو ناردوون سه ماوه ر و گواران و ه به ر ئاردی ده
خه م ".

قادر زه نگه ی خالمان گواره و سه ماوه ری خواردن و سالیکی سه خت و تووــ
شمان له شنوّیه رابوارد. سه ره به هار بوو کوره پووریکی دیکه م له به ر پیرانانه وه
هاتبوه سه ردانی ئیمه و براکه ی. که چاوی به و ه زعی ئیمه که وت. "گوتی
من زورم هه یه و ده وله مه ندم و ناهیّلم لیره بن. ئه تیّ بیّته لای من و پیکه وه ده ژین
چه ند ولاخیکمان به کری گرت ویّ تالانمان ز به رنامه و جیگا و ریگا به ره و لاجانی
پیرانان که وتینه ری. پاش دوو روّژ گه یشتینه گونده ی (جه مران) که مالی پوورم له وی
ده ژیان. ئیتر له سه ر مالی ئه وان و هه موو شتیکمان له سه ر ئه وان بوو. لیره دا ــ
قه له مي من زور له وه بیّ هیز تره که بتوانی چاکه و جوامیری و پیاوه تی ئه وکوره
پووره م به ناوی ( ره سووی زینه تی ) بنووسی. له بیره وه ریه کانم دا جاریکی
دیکه ش ناوی کاك ره سوو ده یّنه وه نیو ناوان و باسی چاکه و مروّڤایه تی ئه و پیاوه ده کری.

نه ده کرا هه تا هه تایه له سه ر سکی خه لك بژین. برا گه وره که میان ئه و
جارپیش نارده وه نیو فه قی یان. بابم جار وبار له مالی ده رسی بیّ ده گوتم
بابم و ه حه ولان که وت که جیگاوریگایه ك بدوزیته وه. روّژیك ناسه یه کی نووسی بوو
( سعید عه ولای سه ید هه مزه) ئاغای گه سگه سك. سه ید عه ولا له کونه وه له
گه ل بابم ناسیار و ئاشنا بوو. له گوندی شیلاناوی و قزلجه ته نانه ت دراوسیش بوون.
سه ید عه ولا له گه ل چه ند ماله سه یدی دیکه هاتبوونه نیو پیرانان و چه ند گوندــ
یان به ئیجاره گرتبوون. دراویان به قه رز دابوو به خاوه ن ملکه کان و پاشان ورده ورده
گونده کانیان کریبوو.

سه يد عه ولا سى دانگى كمسگمسكى وه به رگه وتبوو. بيجگه له وه مه رو مالا تيكى زور و ده وله مه نديكى قورس بوو. كاتيك چووه ماله سه يد عه ولا و كوتم كورى ميرزا حاميد م بردبانه ژوور ونامه كه م دا به سه يد عه ولا و كوتى بوّم بخوينه وه . كه نامه كه م خويّنده وه گوتى : "ئه وروتو بچووه. سلاو له بابت بكه . خوتان ئاماده كه ن سوزى عاره به ده نيرم و ماله كه تان ئه شيّ بيّته ئيره . توّ ده رس به كوره كان ده لىّى . با بيتت ده ستى له گه ل ده ستى من ده بىّ" . پاشان بانگى كرد وگوتى : "دا كاله كانى كسره ى بوّ بينن )". كوريكى هه بوو به ناوى (رحيم) پىّ يان ده گوت كره. جووته كاليكى نه مامه به ندى جوانيان هينا و هه ر له وى ده پيّم كرد و كه رايته وه بو ( جه ران) .

به يانى سه يد عه ولا كوريكى خوى به عاره به وه نارد و ماله كه يان بار كردين بو گه سكه سك . بابم شه ووروّژ له گه ل سه يد عه ولا بوو . منيش ده رسم به دووكورى سه يد عه ولا ده گوت . پاشان سه يد حه سه نى قه لاتيس دوو كورى خوى نارد ن ده رسم به وانيش ده گوت . هه موومان له ته مه نيك دابووين به لام ئه ز ماموستا بووم . هه وايه كم به سه ردا لىّ ده دان وجار وبار ليّشم ده دان .

هه رچه ند له من به هيزتر بوون له به ر باوكيان زاتيان نه بوو تىّ هه لچنه وه . پاشان كاتيك وه بيرم ده هاته وه كه منالى هاونه مه نى خوم به بىّ ئيزنى من نه ده بوايه له ژوورى بچنه ده ر پيكه نينم ده هات .

ژيانمان به ره و باشى ده چوو. مانيك و دوو مانگامان كريبوو. حه زم له سوارى ده كرد و روژى واهه بوو كه سه يد عه ولا وباوكم له مال نه ده بوون ئه سپى سه يد عه ولامان زين ده كرد و سوار ده بووين وغارغار دينمان ده كرد .

جار و بار فه قىّ ده هاتنه جمعانه شيعريشم له گه لده كردن و بوّيم ده دان . زور جار بابم له مال نه ده بوو نامه كانى سه يد عه ولام ده خويند نه وه و وه لاميشم ده نووسينه وه .

لام وايه پاش دوو سال سه يد عه ولا له گه ل سه يد حه سه نى قوريشى سه وداى ملكى كرد و ماله كه ى چووه ( قه لاتى موتاوى) . مالى ئيمه شى له گه لخوّ برد . زور له وىّ نه بووين بابم له گه ل سه يد عه ولا تيكچوو بارمان كرد و چووينه زيدان لاى سه يد رمسووى زيدان . له ويش ده بوايه ده رس به كورى سه يد ره سوو بليّم . به را كه وره كه تم ده ستى له خويندنى نيو فه قىّ يان هه لگرتبوو هاتبووه مال .

ئیمنا ئیتر خیزانیکی هەوت کەسی کۆبیووینەوە. (دوویرا وسی خوشك و دایك وباب) بەهارکە مالمان چووە زیدان سەید رەسووبابی خەلاتکرد بوو بالتوبەکی رەشی دابوویە. هەر هەوەل سالەگەل بابم تیکچوو. زمستان دەسەری کردبین بالتوکەی لیّ هەستاندینەوە. هیشتنا نەبیوە نەوروز دەسەری کردبین بروین و خانووی بۆچول کەین. سەید زەینە لسی زیدان کە پاشان باری کرد بوو چوبووە زینوی شیخی مالەکەی ئیمەی بردەوە سەر مالی خویان وچەند مانگیك بەهەموو شتەوە بەخیوی دەکردین.

من لە ژیانی خۆمدا هەرگیز چاکەی ئەو دوو برایە(سەید زەینەل وسەید حەمەد) لەبیر ناکەم. سالی ١٩٦٧ کە بەنهێنی بۆکاری حیزبی چووبووەوە عیراق بیستم کە سەید زەینەل نەساخە ولە خەستەخانەکەوتووە. چووم سەر دانی. لەپیشدا نەیناسیمەوە. پاشان کە ناسیمی هەستا و ماچی کردم وگوتی "ئوخەی ئەوە کوردیکم دیتەوە فا بی وچاکەی لەبیر نەچیتەوە ؟

پاش ئەوەکە چەند مانگ لەمالە سەید زەینەل بووین بابم لەگوندی (بەرد ـ کەمران) جیگای دیتەوە وجاریکی تر بووە بەپیش‌نوێژی ئاوایی. خەلکی بەردکمران بەراتیکی پاشیان دا بەبابم. کاك ئارەحمانی بەروتی ئاغای بەرد کەمران پیاویکی تیکەیشتوو باش وحەزی لەزانین وفیر بوون دەکرد. هەمیشە لەلای بابم بوو زوربەی چاوە دیری دەکرد. ئەو سالە کاکم چووبووە قەرەخدر ولای کاك عبدالصمد دامەزرابوو دەرس بەکورە کانی بلیّ. من لەمالی مابوومەوە مایینەکەم دەلەوەراند. زستانی لەبەرد کمران لەگەل خەلك دەچووم مەراو ماسی وماسیان بەمن دەدام. بیجگە لەوە لەماله وەخەریکی خویندنەوە ونوسین دەبووم وبابم یارمەتی دەدام. بەهاری (مام ئایزی سیمانی) ئاغای (کیلی سیپان) هاتە مالە کاك ئارەحمان ولەوێ گوتبووی باکە ریم بیّ دەرس بەمندالەکانم بلیّ. لەگەل بابم قەراری دابوو کە لیباسم بۆبکری و ١٢ پوت کەنمیشمان بداتیّ. هەرچەند منال بووم وبۆیە ئەدەبوو دوور لەدایك و باب لەمالان بژیم، بەلام لەبەر نەداری بابم بریاری داو ناردیانم بۆ (کیلی سیپان). مندالەکانی مام ئایز کەلەلای من دەیانخویند هەموویان لەمن‌گەورەتر بوون. مام ئایز بۆخوی کابرایەکی نەزان، قسوز دەماخ، بەفیز، لەگەل رەعیەتان زار شر وجنیو فروش وترسەنوك.

ئەگەر ژاندارمیك دەهاتە ترەی دەچوو، خوێی دەشاردەوە دەیگوت بلێن

لە مال نیە شتێکی بدەنێ با بروا . زۆربەی ئاغاکانی ماسە نیە تایبە تقوڵە
ئاغاکانی دەوڵی لکبن و دەوروبەشتی چۆمی ئاویژەرو تایفەی سیمانی وتایفەی
بایزی و شیربیژ خۆر هەر وەك مام ئازیز نەزان و قور دەماخ و ترسەنۆکن . ئەوانە
ملك و مەزرایە کی باش و بە پیت و بە رەکەت و بە رناویان هە بوو ، بە لام لە
بەر نەزانی و بیکاری و تەوەزەلی و زار شری لەگەل رەعیە تان ، کاسبیان نە دەکرد
و هەمیشە روتوتە دار و قە رزدار بوون . بەم حالەش زستانان لیك کۆدە بوونەوە
گوند بە گوند دەگەران و میوانی یە کتر دە بوون . دەوسی ئەو لە مالی ئاغا چی
هە بادە یانخوارد ، لە رەعیە تە کانیش حەیوان با ، قەل با ، مریشك بەدەیانپچری
و دە چوون بۆ گوندیکی دیکە و میوانی ئاغایە کی دیکە دە بوون . لە م گە رانە دا
شە و رۆژ قوماریان دە کرد . بە لام هیچ دراو لە گۆری دا نە بوو . دەمکە نوك و بان
کتیە لیان دادە نا و بە دراویان دە قە بلاند . پاشان دە یانکردە سەلەمی گەنم
و کابرای دۆراو دە بوایە لە سە رخرمانان ئە وەندە بارە گەنمە بدا بە وکە سە کە سەلەمی
کردوە .

کاك سلەمانی لاوینی نموونە یەکی بە رچاوی ئەم تاقمە چەوسێنە رە یە بوو .
کاك سلەمان و کاك حەسەن ئاغای گوندی لاوین بوون . لاوین یەکیك لە وگوندە
باشانەی لاجانی ماسەشانە . جیگای سەد بەرە جووتی مەزرای بە رناوی هە بوو .
بە لام لە بە رهیچ و پوچی ئاغاکان گوندە کە هەر دە پازدە مال دە بوو .
کاتێك مالمان لە زیدان بوو روژێك کاك سلەمانی لاوین پیاوێکی لە دوو بابم نارد و
گوتبووی نامە یە کم بۆ هاتوە بێ بۆم بخوێنیتە وە . بابیشی نارد . کە چووم کاك سلەمان
میوانی هە بوون . لە نێو گوند گە را بوون فروجیکیان لە مالە رەعیە تیك هە ستاند
بوو . لە بە رهە یوان دانیشتبووین لە پر بوو بە هە را : " کورە ئەی کە ی ،
هە تیو نە بیە خ ، دە بیکە نێ ، بردی " . کوریکی کاك سلەمان بە ناوی ( ئیلخانی )
تە مەنی دە سال دە بوو دە چێتە وە ژوور و دە بمینێ گوشت مریشك لە سە رئاگرە .
تیێی رۆدێ و دە یبا . لە ژووری بوو بە هە را فراندی . بە بە رهە یوان دا
هات . کاك سلەمان نوکە ری تێ بە ردان . تاگرتیانە وە لاقیکی بە کال و نە کولیوی
خوارد بوو ، ئە وی دیکە شیان لێ هە ستاند بووە و هێنایانە وە .

## کیلی سمیان و ماڵی مام ئایزی

لەسەرەتاوە وڵ وقەرارێ پێشوو بەهاری نارەبانە کیلی سمیان.هەرچەندە لەو تەمەنەدا نەبووم کە بیر لە و شتانە بکەمەوە بەلام ئەوەی لە ماڵی مام ئازیز دەم بینی توووشی دنیایەك فیكر و خەیاڵی دەکردمەوە. لەوە زانی وقوزدەماخی لەزاڵمە تی، لەبێ دەستەلاتی رەعیەتەکان، لەخەمراپەو داوین پیسی ئاغا وکار-داره کانی لە نیو گوند و لە ماڵی ئاغاش. بیجگە لەوە هەر لەروژی هەوەڵەوە لە ماڵی مام ئازیز هەستم بەچارەرەشی و داماوی خۆکرد. منداڵیکی ژیر و وریا وە-هەر لەوکاتەشدا دڵ ناسك بووم. من چووبووم بەخیر ماموستا بم و دەرس بە کوڕە کانیان بلیم، بەلام هەموو کاریکیان پێ دەکردم. ولاخیان پێ ئاو دەدام، تینووده بوون ئاویان بەمن دەهینا، دەیان ناردم لە نیوگوندی رەعیە تیکی بانگ کەم لە نیو ئاوایی سەگ دەوەیان دەدام دەترسام کاتیك درنگ دەهاتمەوە مام ئایز وەك سەگ بەگزم دا دەهات وجنیوی دەدان.

پاییز بوو بابم هات گەنمی بەراتە کەم بەریتەوە. گریام وگوتم "لیرە نابم زور هەرا سانم لیرە. لە جیاتی نوکەر وخزمەتکار وفەراش وماموستا من دەکار دەکەن. با بێمەوە لیرە ئیك شکاوم". بابم توورە بوو "دێیەوە لە ماڵ چدەکەی؟".

ناچار بە دڵ شکاوی مامەوە. وام لێ هات بووئەگەر مام ئازیزم دەدیت وەك جانەوەریك ببینم وابوو. سەرو بەری زستان بوو لە نیزیك گوندی (گردەبن) ملکی کاك مامەندی برای مام ئایزی. دوو ژاندارم کوژران. کاك مامەند بۆئەوەکە نەرمی ژاندارم لەچولی نەبێ تا مەعموری دەوڵەت دێن، بەیتە کانی برد بوو ەماخی خوێ. سەر دەمی رەشی رەزاشا ژاندارم لەبیانوێیە کی ئاوا دەگەران. بەسەر گردەبن وەربوون و کاك مامەند و مرادی کوری وچەند کەسیکی دیکەیان تیکە وەپیچا و لەخانی پتر لە مانگیك جەزرەبەیان دەدان و داخیان دەکردن و بە چلەی زستان شەوانە ئاویان دەبن دەکردن. خەبەری ئازار و ئەشکنجەی کاك مامەند وگیراوەکان لەناوچەدەنگی دابووەوە. بەبیانووی دیتنەوەی قاتلەکان-ژاندارم بەلاجان وەربوون و لە راووروت وگرتن و لیدانی خەڵك ئاگریان کرد بووه.

خاوەن ملکی ئاوچەیان کوکردنەوە و هەموویان بە وزستانە رە پیچەك دان بـو ورمـێ . خـواواستان مام ئایزیش پاش قـول نەدرا . ئەو دەم بە سواری ئەسپ دەچـوونە ورمـێ . چـوون و هاتنەوە مانگیکی پتر دەخایاند . هەرچەندە منیش لە زولم زوری ژاندارم بیزار بـووم ، بەلام رویشتنی مام ئایز شایـی لە دل دا دەگـیڕام . پاش رویشتنی مام ئایز کورە گەورەکە شـی وەمالـی نەدەکەوتە و لەگەل قـولە ئاغاکاـ نـی ئاوچـە لە هـەول وتەقـەلا دا بـوون . پـە نایان بـۆ قـەرنماغای مامـەش برد بوو کە کاك مامـەند رزگار بکا . بەلام ژاندارمـی حکومـەتی رەزاخان سەردار عـەشیرەتـی کوردیان بە هیچ نەدەزانـی . ئەوانیش بە پەنچـەوانە بۆ ئوکەری بیکاـ نە طلـی خۆیان دەشکاند .

دوای رویشتنی مام ئایز لە نیوەندەالە کان دا بووژا بووەوە . دەترسم بێ دەگوتن وجار وبار لێیشم دەدان . تۆلەی خـۆم لەوان دەکردەوە . بەلاچزور رووت بـووم ئەو قـەول و قـەراری دابوو، کە لیباسم بۆ بکری وەك هـەموو قەکانـی بە دروـ دەرچـوو بـوو .

## خـوشکە مامـز وحیسابـەتـی ئـەو

مام ئازیز برازایەکی کچـی هـەبوو بە ناوی ( مامـز) . خوشکە مامز یان پـێ دەگوت . دایك وبارکـی نەما بوون . نیوە ملکی کیلێ سیان بە و دەگەیشت . تازە ـ تەمـەنـی خـۆی لە ١٩ و ٢٠ دەدا . کیژێکی شوخ جوان چاك قیت و قـوز لـەبـەر ئـەوە کە میراتی زور پـێ دەگەیشت لە مال دا زور قـەدریان دەگرت . خزمەـ تکاری تایبەتـی خـۆی هـەبوو . ژووری خاوێنی بە تەنیای لە حـەساری دا هـەبوو . نان وچێشتی تایبەتـی بۆخـۆ سازدەکرد . کە مام ئایز لەمال نەدەبـوو لە دوای دەنارد م دەپیرد مـە دیوەکەی خـۆی . مێوژ و گوێزی دەدامـێ . جاری وا هـەبو کە خـواردنـی دروست دەکرد، بانگی دەکردم ، ناتی لەگەل دەخـواردم . بـەقـەرەوانەکەی دەگوت بە کورەکان بلێ لێرە نـیە . وادیار بـوو لە بە رێ کەسی خـۆی هـەستی بە بـێ کەسی منیش کرد بـوو . دلخوشی دەدامـەوە . باسی بێ کەسی خـۆی دەکرد . هێندی جار دەیگوت : " نازانـی فالیکم بۆ بگریەوە بزانم چـم بەسەر دێ " .

پاشه وه كه مام ئايزيان برده ورمێ خوشكه مامز پتر پێشی به ره لا بوو. ده هاته ده رێ. كاتيك ده رسم به سند الان ده گوت ده هاته لام. هه ستی به وه كرد بوو كه زور رووتم و سه رمام ده بێ. روژيك بانگی كردم ده ستيك كه واو پاتولی جوانی بۆهينام و گوتی ده به ريان كه. گوتم:

ــ خوشكه مامز ئيره بمرك دروی لێ نيه، ئه وانه ت له كوێ دروه؟. پاشان ئه گه ر ده به ريان كه م ئاموژنت وكوره كان نالێن ئه و ليباسه ت له كوێ بوه؟. هه موو ده زانن مامت هيچی بۆ نه كريوم. گوتی: "بلێ بابم بوی ناردووم".

له بهر ئه وه ليباسی بنه وه م هيچ له بهر دا نه بوو شه رمم كرد لای ئه و خوم رووت كه مه وه. گوتم: "ده پانيه م له وه تاخی ده ری ده به ريان ده كه م".

ــ نا مه پانيه. سبه ينی وه ره ئيره بۆ خوم ده به رت ده كه م بزانم جوان بووی؟ سوزی پاشه وه له ده رسی سند الان بوو مه وه چووم ده بوی خوشكه مامزی. نازانم چ هه ستيك پالی پێوه ده نام، كاتيك بۆ ده بوی خوشكه مامز ده چووم خوشيهك له شی دا ده گرتم و ته زووم به قالبی دا ده هات. رووخوشی و هاوزمانی و ده ل دانه وه ی خوشكه مامز ماله خومانی له بير برد بوو مه وه. كه وه زور كه وتم هه ستاو گوتی: به بنان ئه وشوێنه نوستووم كراس و ده رپێ ی سپيم بۆ ده رووی. ليباسه كانی ده به ر كردم و توند ماچی كردم. گوتی: هه رچی ويستت و مره پێم بلێ. تا مام ئايز نه هاتبوو وه پتر له كن خوشكه مامزی ده بووم.

له ره شه مه دا بوو مام ئايز هاته وه. رمه يه ته كان پێيه وه ده هاتن و ده ياريان بۆ ده هێنا. هه وه ل جار بوو سينه ماي ده يبوو ده پگيراوه و ده روی پێوه ده نان. له نێو مامه شان مام ئايز بۆ ده رويان به نێو بانگ بوو. مام ئايز جانو ئه سپيكی توزی هه بوو، هێشتا نه گيرا بوو. روژيك جانوو ئه سپيان هێنا ده ری له ز ه ويه كی جه ر مالان ئيره خۆليكيان لێ ناو گوتی وه ره سواری به با رام بێ. هه رچه نده هاوارم كرد فايده ی نه بوو. سواريان كردم به دووكه س ريشه يان گرتبوو. ئه سپ خوی هه لده اويشت و جووته ی ده اويشتن. خوم له يالان قايم كرد بوو.

دووحه وتووی ته واو تا ئه سپ رام بوو روژی سواريان ده كردم. له ئاخری دا بوو من قازانجيكی هه بوو. له سواری راهاتبووم و سام شكا بوو.

تاقه دلخوشيم له وماله به قور گيراوه ئه وه بوو هه ر كه مام ئايز ديار

دەچووە دیوی خوشکە مامز و هەموو شتێکم لە بیر دەچووەوە. ئەو کیژە جوان و
باشە جار لە جار میهرەبانتر بوو. زۆر جار نان و چێشتی بۆ هەڵدەگرتم. هێندێ
جار لە ئامێزی دەگرتم و ماچی دەکردم . من شەرمم دەکرد.

بە هەر سەرەمەرگیەك بوو زستانم بەسەر بردە سەر و هەوا و بان خۆش ببوو
رۆژێکی بە مام ئازیزم گوت : "پیاوێکم لەگەڵ بنێرە دەچمەوە. ئیتر بەهارە و لێرە
نابم ". گوتی : "ئەو سالیش لێرە دەبی . لەگەڵ بابت قسەم کردوە ". ئیتر
بەجارێك دڵم بەر بووە. چوومە ژووری لای خوشکە مامز و پێم گوت مامت ئیزنم نادا
بچمەوە. ناسەوێ لێرە بم . تۆ یەکێکم لەگەڵ بنێرە بمگەیێنێتەوە".
گوتی : "چاك چاك دەکا. تۆ بچیەوە من بە تەنیا دەمێنمەوە . مەچووە
ئەو سال مامم بۆت باش دەبی .".
ـ ناتوانم لێرە بم . خۆت دەزانی چم لێ دەکەن؟ .
ـ راوەستە دوکاندار دەچێتە شار دەنێرم گۆشت بۆ بکری. ئە من بمجێ دێلی ؟"
پاش چەند رۆژ خوشکە مامز بانگی کردم. جوتە پێلاوێکی سووری بۆ کڕیبوم.
دەپێم نەکردن . سەرە بەهار بوو چۆم دەهات زیادی دەکرد . بە خوشکە مامزم
گوت دەڕۆمەوە. بە یەکێکی بڵێ لە چۆم بمپەڕێنێتەوە. گوتی : "بە سۆفی
دەڵێم بەیانی زوو لە چۆمی وەت پەڕێنی . سۆڵەکانیشت دەدەمەو".
بەیانی لە خەو هەستام سۆفی چاوەڕوانم بوو. لە چۆمی ئاوێزە رو دەستی
گرتم و پەڕیمەوە . کەوشەکانم دەپێ کرد و بەرە( بەردکەمران. تازە تەندوریان
هەڵکرد بوو لەماڵی وەژوور کەوتم . دایکم و خوشکەکانم دەستیان کرد بە
گریان . گوتم هەلاتووم. دایکم گوتی : "چاك چاکت کردوە ئیتر ناچیەوە".

## گەڕانەوە بۆ قەلاتی مەوتاوی

لەوکاتەوە کە لە زیندان بارمان کرد بوو سەید عەولا چەند جار ناردبوی
بە دوای بابم دا کە بیباتەوە لای خۆی . لەو ساڵەدا سەید عەزیزی کوڕی
سەید عەولا ژنی سەید حەسەنی هەڵگرتبوو برد بوویە خالدئاری
ماڵە سەید شێخ محەممەدی. بۆ خۆشی چوو بوە دەلاوان ماڵە کوێخا مەرز
کە مەسەلەتی بۆ بکا. شەویك سەید عەزیز دەچێتە خالدار سەر ژنەکەی بدا

ژاندارم لە نیزیك گوندی خالدارتە قەی لی دەكەن و دەیكوژن . سەید عەولا دەستی كرد بە شكایەت و شكایەتكاری . نەخوێندەوار بوو ئەمجارە پتر پێیەوە ئەیھێنی بە بابم ھەبوو. ئێوارە یەك بابم سواری كردم و ناردمی بۆ سەرە خۆشی لە قەلاتی موتاوی. رۆژێك لە قەلاتی بووم . سەید عەولا گوتی :

" دەبێ ماڵەكەتان بێتەوە. كەسم نیە و تووشی ئەم نیگبەتیە بووم. بە بابت بڵێ دووڕۆژی دیكە عارەبە دەنێرم و بارتان دەكەم. پاش چەند رۆژ كوڕێكی نارد بوو لەگەڵ عارەبە و ماڵەكەمان جارێكی تر چووەوە لای سەید عەولا . دیسان دەستم كردەوە بە دەرس گوتن بە كوڕەكانی .

ساڵێكی تونبوو. نازانم لە ھەموو ئێران یا ھەر لەكوردستان قات وقڕی بوو گەنم وەگیر نەدەكەوت . سەرەبەھاری سەید عەولا ھێندێكی گەنم بۆنارد بوین ئەوێش زۆری نەكێشا تەواو بوو. ئەسپاردبووی ئەگەر نانمان نەبوو لە ئاشی رۆژی سەیەك ( دووكیلو) ئاردمان بدەنێ . بابم كەمتر لەماڵ دەبوو. لەگەڵ سەید عەولا لە سەفەرو گێرە وكێشە ی شكایەتان دابوو. رۆژی وادەبوو ھیچمان نە دەبوو بخۆین .لەگەڵ خوشكەكانم تا ئێوەڕۆ لە ئاشی رادەوەستام كە ئاردمان بدەنێ . پاشان ئاشەوان دەیگوت ئاردم نیە ئەوڕو مزەم وەرنەگرتووە.

نازانم برا گەورەكەم چۆن كەوتبوە زینوی شێخ و لە لای حاجیەكی خەلكی ھەولێر دامەزرا بوو حیسابی دوكانی بۆ بنووسێ . لە ورسیەتیەدا رۆژێك لەگەڵ كابرایەك پەیدا بووە. جل و بەرگێكی پوشتە و چەند كەللە قەند و چاو پارچە و پیلاو بۆ دایكم وخوشكەكانم و شتی دیكەشی ھێنا بوو. دوو رۆژان لە ماڵ بوو پاشان چوو زینوێ . ئەو شتانە جێی ناتیان نەدەگرت . برسیەتی ھێرشی ھێنا بوو. گەنم فەریك دەبوو . دەچووم گەنمە فەریكەم دەھێنا و دەمان برژاند و دەمانخوارد .دیسان كاك رەسووی پورزام لە فریامان كەوت ھەندێكی ئاردی بۆ ھێناین . درووێنە دەستی پێكران . لەگەل دایكم وخوشكەكانم دەچووینە دەسكان . لە پشت درووێنە وانان گوڵەگە نمان كۆدەكردەوە و دەمان ھێنا دەمان كوتا و گەنمەكەمان دەبردە ئاشی لێمان دەكرد و یان بە ئارد دەمانگۆڕیەوە. لە ژیانم دا ئەو ساڵە و ئەو برسیەتیەم لە بیر نەچۆتەوە.

ھاوین بوو برا گەورەكەم لە حاجی تۆرا بوو ھاتەوە. پاش دوو رۆژان حاجی پیاوێكی بە دوادا نارد كە بیباتەوە. دایكم رازی كرد كە بچێتەوە كن حاجی .

ـە رارمان دا منینی لەگەل بچم. پاش سێ روژ لە بیرمە لەگەل کاکم بەرەو
خەلان کەوتینە ری . ئەودەم هاتوو چووی ئەودیو زەحمەت نەبوو. خەلك
بە روژ بەکویستانان دا دە چوو قەتەو چاپیان دەهینا . ئیمە ش چووینە کونە لاجان
و بەگەلی حاجی برایمی دا شەو هەلبوین و ئیوارە گەیشتینە خەلان . حاجی
بەخیر هاتنی کردین وگەلیکی دلخوشی کاکم داوە . بو هەوەل جار دیتم لە
کوردستانی ئەودیو بە زمانی کوردی دەنووسن و دەخوینەوە . پیم سەیر بوو .
لام وابوو تەنیا فارسی زمانی نوسین و خوێندنە . من کە فارسیم بان دە زانی لەوی
نەم دە زانی کوردی بخوینمەوە .

دوو روژ لە مالە حاجی بووم و پاشان لەگەل قاچاخچیان هاتمەوە . حاجی
دەستیکی لیباس بو دروم و هێندەی قەند و چاو بەرەسیغار و شتی دیکەی دامی .
هاوینی خرمان هەلگیران . سەیەعەولا نازانم چەند بوو بەلام بەراتیکی باشی
دابوو بە بابم و گەنمی زیادیمان هەبوو دەچالمان کرد . ئەو دوو سالەی لە گوندی
بەرد کەمران بووین بابم دوو هیوەرە کامیشی کریبوون . لە قەلاتی پایزی یەکیان
زا بوو شیروماستیشمان هەبوو . بەوحالەش رەسووی پوورزام لیمان خافل نە بوو
هەموو شتیکی بوّ دەهێنایین .

## بەشی دووەم

### سەرەتای ژیانێکی تازە

زستانی سالی ١٣١٤ میواندارییەك بوو بە هۆی گۆڕان لە ژیانم دا و بەسەرهاتی تێ بینی نەکراو. ئاخری پاییز کوێخا سەرمزلە گەل چەند خاوەن ملکی پیران و سوریك لە قەلاتی موتاوی لە مالە سەید عەولا کۆبیونەوە .

کوێخا سەرزکی بوو؟ . *کابرایەکی خەلکی گوندی بێستانەی دەشتی بیتوین لە کوردستانی گەرمێن بوو. کوێخای عەشیرەتی فەقێ خەلیان و سەربە پیرانەکانی بیتوین بوو . عەشیرەتی فەقێ خەلی لە دەشتی بیتوین و دەوروبەری شاری کۆیە دەژین . عەشیرەتێکی پچوکن بەلام ئازا و دڕن .
کوێخا سەرز سالێك لە شاری کۆیە قایم مەقامی کۆیە و ئەفسەرێکی ئینگلیزی کوشتووە و رای کردوە بۆ کوردستانی کوێستان . لە نێزیك سنووری حاجی ئومەران گوندی ( دەلاوانی ) ئاوەدان کردبووە و لێی دانیشتبوو . هێندێ خزمی لە خۆ کۆکردبوونەوە بە دزی و ڕێگری دەژیان . لە و سالانەی دواییدا کاسبیشیان دەکرد . کوێخا زۆر دەولەمەند بوو . نێزیکەی ٧٠٠ سەرمەڕ و ئاژەلی هەبوو . ٢٠ ــ ٣٠ سەر رەشە ولاخ و دە پازدە یەك سم و سێ ئەسپی سواری بانی و ... ئەودەم گوندی دەلاوان نێزیکەی ٢٠ مال بوو کە زۆربەیان خزمی کوێخا بوون . کاسبی جوتیارگایان لە گەل کوێخا بەنیوە بوو واتە هەموویان نیوەکار بوون .

لە سەردەمی حکومەتی رەزاشادا کە گشت عیل وعەشیرەتی کوردستان چەك کرابوون کوێخا سەرز بە ئیجازەی دەولەت ١٧ تفەنگی هەبوو. سال بە سال ئیجازەی تفەنگەکانیان بۆ نوێ دەکردەوە . لە گەل ژاندارم و مەعمورەکانی حکومەت هاوکاری دەکرد. ڕێگای بە قاچاخچییان دەگرت رووتی دەکردن و بەشی مەعمورەکانی دەدا وبە و بۆنە وە لە لای حکومەت دەستی بان دەرۆی .

ئەم کوێخا سەرزە میوانی سەید عەولا بوو . ویستبوویان نامە بۆ ئاغایەکی تر بنووسن کە ئەویش بێتە قەلاتی موتاوی . بابم لە مال نە بوو . سەید

عەولا لە دواى منى نارد و كاغەزو قەلەميان هينا و گوتى : " نامەيەك بو قەرەنيا غاى پيران بنووسە كە بێتە ئيرە . " نامەكەم نووسى و بۆم خوێندەوە . كويخا مەرەز وەدەنگ هات و پرسى : " ئەوەكورى كێ يە ؟ " .
سەيد عەمولا گوتى : " كورى ميرزا حاميدە و دەرس بەكورەكانى من دەلێ "
كويخا گوتى : " دەبى بيدەن بە من . دەيكەم بەكورى خۆم " .
ـ دەستەلاتى بەدەست خۆتە . سەيد عەولا گوتى .
پاش دوو روژان كە ميوان دەرويشتن سەيد عەولا ناردى و گوتى : " دەبێ لەگەل كويخا بچيە دەلاوان .
ـ بابم لە مال نيە . بێ ئيزنى بابم چۆن دەتوانم بچم ؟ .
ـ قەى ناكا . من دەتنيرم . برۆ بە دايكت بلێ .
چومەوە بەدايكم گوت . دايكم گوتى : " قسەى سەيد عەولا مەشكينە . ئەگەر بابت هاتەوە دێت سەرتدەدا . سوارى پاشتەركى پياوێكى كويخايان كردم و ئەو جاريش بەرەو گوندى دەلاوان دايك و باب و خوشكەكانم بەجێ هێشت .
ئيوارە بوو كە يشتينە دەلاوان . هەر لەوەژوور كەوتن دا مالى كويخا و داب و شوێنى ئەوان سەرنجى راكيشام . ماليكى قەوغاوە تاخى پر فەرش ونوێن نوكە رو چاپەزى كوك و پوشتە . كويخا وەك دەمرە بەگەكانى ترى كورد بە فيزو لووت بەرز و قوزرو دەماخ نە بوو . گشت پياوەكانى گوندى دەهاتن لە لاى كويخا دادە نيشتن و نان و چايان دەخوارد . ئەو خەلكى گوندى لە وەتاخى كويخا كۆبوو ـ نەوە . بە خەلكە كەى گوت : " كوريكم پەيدا كردوە و ئەوە كورى منە و هەموو ئاكاتان لێ بێ . بەيانى سواريكى ناردە خانێ كە وێنەكەواو پانتولێ بۆ كرێم و لەماليێ كراس و دەريێيان بۆ دروم و بە سەرڕيانيكى تازەدا كە وتم .

نەختێكى ديكە ش لە بارەى مام كويخا وە

كويخا مەرەزيێ ژنى هەبوو . مندالى نەدەبوو . دەيانگوت لەكە رمين ژنيكى سكى پر بوە كوشتوويە تى وكوتوويە لە من نيە . ژنيكى ديكەشى كويا حەزليكردنى كردوە لەگەل كابرا هەردووكى كوشتوون . خۆى بە خاوەن دوژمن دەزانى . قەت بێ تفەنگ نەبوو . هەميشە كيشكيان لێ دەگيرا . لە ژووريێ تەختى نوستنى وادانابوو كە تفەنگ لە كولانەوە نەى گرێتەوە .

ژنه کانی هەرسیك خزمی خۆتن بوون. ژنه گەورەکەی کە بخوای مال و بە کویخا ژن ناودەبرا ناوی ( هەمین ) بوو. دەهاتە دیوه خان و لەگەل پیاوان دادەنیشت. ئەگەر کویخا لە مال نە بوایە دەهات میوانی بەخیر هاتن دەکردن لە ژووری دەستووری نان و چێشت ساز کردنی دەدا. کلیلی رزق و هەموو شت بە دەستەوە بوو. تەمەنی لە ٤٠ سال تێ پەڕیبوو بەلام ژنیکی قەلەو لورج و گول و ناحەزینه بوو.

ژنه ئێونجیه کەی ناوی عەدلە خان بوو. ژنیکی وریا، بە کار جوان و زمان دار تەمەنی لە ٣٠ تێ پەڕیبوو. تەواوی نان و هەویری ئەوماله لە ئەستوی عەدلە خان بوو. ژنه پچوکەکەی کویخا ( ئایشه خان ) بە حال دەگەیشته ٢٥ سال. ژنیکی بالا بەرز، چاوجوان، قیت و قۆز، قەد باریك ژنی وا جوانم کەم دیبوو. بە خێو کردنی رەشە ولاخ و یەك سم و ئەسپەکانی کویخا لە ئەستۆی ئایشه خان بوو.

بە یانیان هەلدەستا، ئالیکی دەدا بە ئەسپەکان. رەشە ولاخی بەر دەدان رەوەی بەرە لا دەکرد، تەویله کانی خاوین دەکردەوە. دەهات نان و چای دەخوارد و ئەسپەکانی شال و رنەك دەکرد، خاوینی دەکردنەوە و دەیبردن لەکانی ئاوی دەدان. ئەگەر کویخا چوبا سەفەر ئەسپی بەزین دەکرد. بەهاران و هاوینان هەموو ئێواران، داس و گوریسی هەلدەگرت و لەسەرا کولە گیایەکی بۆ ولاخان دەهێنا. ئەو گشت زەحمەت وکوێرەوەریە ئوزگالیك لە جوانی ئایشه خانی کەم نەدەکردەوە.

کویخا خۆی تەمەنی لە ٦٠ بالا بوو. بەلام زیندوو گورج سوار چاك، قەت نەدەچووە لای دوکتور. ئەگەر نەخۆش دەبوو شیر و بیباری تیژی دەخوارد ەوە. سال دوازدەی مانگ سپە ینان لە خۆرینی شیری دەخواردەوە.

وا راهاتبوو شەوی کاتی نوستن کە دەچووە ژووری، دە بوایه لەسەر ساج ئاگری بە بکەنەوە. پشت و سینگی ره ئاگری دەکرد تا سوور دەبوو نەوە جا پاشان دەنوست.

نۆرەی بۆ ژنه کان راگرتبوو، هەر پینج شەو یەك لە لای دەخەوت. نەیاندەهێشت من لەوە تاخی بنووم لە ژووری لای خۆیان دەیان نواندم. ژنه کانی دیکە تریش هەر لەو ژوورە دەنوستن. بەیانیان پاش ئەوەکە کویخا دەچووە دیوه خان، لەنێو ژنەکاندا دەبوو بە شەرە قسە و تەوس و پلار، دیار بوو ئەو ئاگایان لە مشت و مڕ هەیە بوو.

بەتایبەت کویخا ژن لەو بارەوە زور حەسوود بوو تا نوزەی خوی دەهات لە مال دا جنێوی دەدان . جاری وادە بوو قسەی وا سووکیان بە یەکتر دەکوت کە من نەم بیست بوو. لەسەر ئەوە شەوەعەدلە و ئاینە خان حورمەتی کویخا ژنیان دەگرت . زور لە کویخا دەترسان . زور جار کە شەرەچەقەیان توند دە بوو دەچووم دەرو بە غار دەهاتمەوە دەمگوت مام کویخا هاتەوە . بیدەنگ دەبوون . پاشان کە دەیانزانی راست نیە دەیانگرتم، دەیان قورنجیم و یان رووتیان دەکردمەوە . دەگریام. شەرم دەکرد .

کویخا قەت لە دیوی زووری دانە دەنیشت . هەمیشە نانی بو دەهاتە دیوەخان . تەواوی روژ لە بەیانیەوە هەتا نیوەشەو لە دیوەخان سەماوەر دەکولی . خەلکی گوندی دەهاتن دادەنیشتن و چایان دەخواردەوە. روژی جیژنان دەبوایە گشت پیاوەکانی گوند لە مالە کویخا نان بخون. کاسە جەژنەیان بو زور مالان دەنارد .

کویخا دووگونی دیزی کریبوون و لە ناو گوند بو خەلك بە رەلای کرد بوون هەرکەس کاری بارە بەری هەبایە و زوو گرتبانیە وە دە یبردن .

من تا ئیستا مالی وا ئاوەدان و داب و شوینی ئاوام نە دیبوو . مالیکی تەواو عەشایری سەرئاوالە بو دەرکەوان و بەرگری. هەموو کەسی گوندی ئازاد دەهاتنە مالە کویخا . ژن و پیاو پیکەوە دادەنیشتن گالتەیان دەکرد . وەك خیزانی مالی بەمنەوە پینج کەس بووین . چاپە زیك و نوکەریکی سواریشی هەبوو. بەلام قەت لە دەپازدەکەس کەمتر لە مالە کویخا نانیان نە دەخوارد.

کویخا کتیبیکی ئەسکەندەرنامەی هەبوو کاری من ئەوە بوو تا نیوەشەو دەبوایە ئەسکەندەرنامەی بو بخوینمەوە. ئەوەندەم شیووورد دابوەوە، وای لی راهاتبووم ئیتر فارسیە کەم نە دەخویندەوە هەر راست بە کوردی پیدادەچوم کویخا کە یفی پی سازدەبوو. خەلکی گوند پیش کوتدەبوونەوە وگوی یان دەدایە.

کویخا لە ئەسپەکانی سواری بەکیکی بومن دیاری کرد . روژانە بە ئاینە خان ئەسپەکەی زین دەکرد و دەیکوت برو لە پیش مالان رمبازی بکە . زستانی لە گەل خوی بو راوەکەرویشکی دەبردم. زور جار دەچووە سەقەر و میوانی منیشی دەبرد . ئەو جار بو کاری ئیدارای دەینارد مەخانی . دیاری بو ئەفسەر وکارمەندی عەجەم

دەنارد. تاقەخوێندەواری گوندی بووم و جار و بار یاسینێکم لەسەر نەخوێنان دەخوێند. دەبوایە ئۆژاشینی بکەم.

## دەلاوان لەکوێ یە؟

گوندی دەلاوان کە وتوتە بناری رۆژئاوای (کەلەکێن و بەندەرە) کە ئێستا پێگەی نیزامی پیرانشاری لێ یە. قاچاخە ریگای هاتووچووی زینوی شیخ بەسەرزراو. کوێستانەکانی دەلاوان دا تێ دەپەری. یا ریگای کانی خولا ویان بەقەمتەرەو قزڵقەپاندا. کوێخا ئێواران پیاوەکانی گوندی کۆ دەکردەوە و دەیکردن بە دوو بەش. دەستەیەکی دەنارده سەر ریگای قزقەپان و دەستەیەکیشی دەنارده سەر ریگای کانی خوا. بۆخۆشی هەرجارە لەگەل لایەکی دەچوو. پیاوێکی لە زینوێ شیخ دادەنا. هەر کاروانێکی قاچاخچییان بەرەو ئێران هاتبا، کابرا خەبەری دەدایە. ریگایان پێ دەگرت و رووتیان دەکرد. ئەوە کاری کوێخا بوو. ئەگەر قاچاخچییەك چووبا عیراق و بە دەلاوان دا هاتبا و میوانی کوێخا بایە، ئەو پیاوی خۆی لەگەل دەنارد و بە سلامەتی کابرای دەبرد و دەیهێناوە.

لەسەر ئەو حالە شەوە سەیر ئەوە بوو قەت نوێژی نەدەچوو. هەمیشە لە رەمەزان دا بەرۆژوو بوو. بە ربانگی دەکردەوە نوێژی خەوتنانی دەکرد و سوار دەبوو بۆ رووتکردنی قاچاخچییان. مالەکەی وەك دوکانی بەزازی پڕ لە کوتال و شتی قاچاخی گەرمێن بوو. ژاندارم و سەربازی گومرک دەهاتن قاچاخچیان لە مالی کوێخا دەبینی، بەلام نەیان دەتوانی هیچ بیژن. کوێخا دراوێکی دەدانی و دەروێشتن. ئەوەی لە قاچاخچییانی دەستاند بەشی ژاندارم و گومرگی خانی دەدا، دیاری بۆ ژنەکانیان دەنارد، هەمیشە میوانیان دەبووسنکیشتنی دەکردن و دروشمێکی هەبوو دەیگوت: "عەجەم قوونی چەور کە و چ دەکەی بکە".

ئەو دروشمە بۆی گرتبوو. سەعوورەکانی سەر سنوور وەك مانگانە لەگەلی بڕیبوونەوە مانگانەی دەدانێ و پێشیان بەرە لاکرد بوو.

لەو ناوچەیە یەکێك کارێکی لێ قەوماباـ ژنی هەلگرتبا پیلوی کوشتبا ئەگەر هاتبا مالە کوێخا نەجاتی دەبوو. لە سەری وە دەنگە مهات، دراوێکی زۆری بۆ رزگاری ئەو کابرایە خەرج دەکرد. بەو بۆنەوە مالە کوێخا هەمیشە ژن و پیاوی لێ

قـه وماوی لـیّ بـوون و به نایان هێنا بوو.

مانگیك بوو چـــو بووم ده‌ لاوان. ڕۆژیك کوێخا گوتـی . «بچـو سه ر مالـێ بده‌ و مویه لام هــه ر ڕۆژیك کیر بــه ». پیاوێکی ساز کرد لەگەلم بـێ . باریك ئارد و پێسته یه نیریك وکوپه رونیك و پهنج که لله قـەند وچا و ده تمەن دراو گوتی ئەوانه بـو مالی به ره وه . ئه سپیان بۆ زین کرد م و چـوو مەوه . ژنەکانـی کوێخا دیاریان بۆ د ایك وخـو شکەکانم نارد . شه وێك له مالــێ کیر بـووم وکه رامه وه . به پێنجـەوانه ی مالّی مام ئاینی سیمانـی به تالوکه بووم بچمه وممالـی کوێخا .

هــه ر له ڕۆژەکانی هــه وله وه کوێخا گوتـی . «ده بـێ فێری تفەنگ‌هاویشتن بـی . تفه نگێکی چەنیری سه ر تویی قـوله ی دامێ وکوتی ئه وه تفەنگی تۆیه . ڕۆژانـه نیشانه ی بۆ داده کرد م و تەواو ڕاهاتبووم . لیباسی که رمـی زستانیان بۆ درووبوم.

سەرکلاوو دەسەوانەی کەرمیان بۆ ساز کرد بووم لەگەل خـۆی ده پیبرد ـه ڕاوه کێوی .

زستانان ڕاوه کێوی له ده‌لاوان زۆر خـۆ شه . بزنەکێوی ئێواران داده کشێن بۆ بنار و سه ر چـوم. به یانیان زووو به ڕێچکه ی هــه لّده بنەوه . نیوه شه و تفەنگچـی وه خو ده کەوتن و بەره که یان لـێ ده‌گرتن . حیوانه کێوی عاده تی وایه ئەگەر یەکێك به شوێنێك دا تـێ پـه ڕێ ئیتر ئەوانـی دیکه ش به دوای ئه و دا ده‌ ڕون . ته قـه شیان لـێ بکری ناگه ڕێنەوه . جاری واهـه بوو ده ووسێ حـه یوا ن ده کوژران . له کونده ی گوشت به شی هــه مـوو مالان ده دررا. ئه و داب و شوێنه م هــه ر له ده‌لاوان دیـــبوو.

دابـی کونـی عـه شیره تـی وکوچـه ری ئه واو پارێزرا بـوو. نه ك هــه ر ئـــەوه ماله کوێخا حـه یوانیان ده‌ کوشتەوه ، به لا م گوشتیان بۆ زۆر ماله فـه قیرەکان ده نارد .

ئالـــوگـــۆ ر لــه ژیانــم دا

له ده‌ لاوان گۆڕانێکی تەواو به سه ر ژیانم دا هاتبوو. بووژا بووبـه وه ، تیرو ته سه ل کوت و پۆشته تا قـه خـوێنه ویستی ماله کوێخا بووم .ژنه کانـی کوێخا و مك کوری خۆیا ن خـو شیان ده‌ویستم . زۆر جار ده یانگرتم ماچیان ده‌کرد م ده یانکریاند م و. .

ڕۆژێك گوتم ئـه وهــه موو عـه جــەمـی برسی و بیکار ده که ڕێن بۆ به کێك‌ڕاناگرن لـه جیاتـی ئایشه خان ولاخان به خیو کا؟ . کوێخا ژن‌گوتی . «کوێخا پیاوی سه لّت لـه مالـێ ڕاناگری تـۆ پیاو نی بۆیه بووی به پشیلەی مالـێ ». کابرایه کی پیر و فـه قیر به ناوی حـه سەنلال به خۆوژن وکور وکچێکی له ماله کوێخا دا بوون و یاریده ی ــ

ژنه كانیان ده دا . من و مكری ئاینه خان ببووم . دهچووینه تهویله ئه سپه كانم له گه ل خاوێن دهكرده وه . نه یده هێشت ده یكوت پیس ده بی . ده ئامیزی ده گرتم ده یكوت به قه د ( حه مه ده مین ) م خوش ده وێی . ( حه مه ده مین برای بو) جاروبار سواری ئه سپێكی دهكردم و ده چووم ئاوم ده دا . سه باره ت به ماله كویخا خه لكی گونده یش خوشیان ده ویستم . كویخا دوو برازای هه بوون (عمولا و خدر) مالیان جیا بوو . به لام له گه ل شوانان صه روماڵاتی كویخایان بهخێو ده كرد . زوریان خوش ده ویستم . زور جار ده چووینه مالی ئه وان و كه بابی صریشكمان ساز دهكرد .

له نهوروز دا جارێكی دیكه ش به ده ستی برموه چووه وه سه ردانی دایك و بابم . به لام گیر نه ده بووم ده گه راسه وه ده لاوان . له ماله كویخا ورده ورده خوشكه مامزم له بیر ده چووه .

بـه هاری ده لا وان

به هاری دهلاوان یه كێكله جوانترین بههاریكوردستانه . له سه ره بهحار دا كه نگر و مه ندوك و كارگ و ریواس و بیزا و كوراده خولیك ده ڕژن و بهگول وگولا له ش ده رازینه وه . كیژو كور هه موو روژی روو ده كه نه بناوان و گه لی ده لاوان . زور جار خه لكی گونده كانی ( كه لهكین و بنده ره و دریكه و گه پله سه ن و شیناوی بو كارگ و ریواسان ده هاتنه گه لی ده لاوان . له گه رانه وه دا لهزار گه لی ده یانكرده شایی و زه ماو ه ند تا ئیواره ده رنگ هه لپه ركێی و به زم ده ریژه ی ده بوو . ئێمه له گه ل برازا كانی كویخا ده چووینه گه لی و نیشانه مان دا دهكرد و له گه ل كچانیش خه ریكی ده ستبازی ده بووین . له زار گه لی ده لاوان ریگایێك هه یه به ناوی (كولانی ماچان ) . دوو تیشه به ردی زه لام ئه ولا ولای ریگایان گرتوه وكولانیكی ته نگه به ریك هاتوه كه ته نیا تاقه بارگینێك و یا زه لامیكی پیدا ده روا . ئیواران كه لهریواسان ده گه راینه وه له گه ل خدری برازای كویخا كولانمان ده گرت و كچه كانمان ماچ دهكرد . به هاران حه و تووی جارێك ئه وه سه یرانی ئێمه بوو .

مانگێك له بههار ده روێشت تاول و ه ده ره ده كه وتن . كویخا ژنه هه مین و ئاینه خان ده چوو نه كویستان وعه ده له ش له گوندی دهمایه وه . كچێكی گونده یشیان له گه ل خو ده برد هه وار كه ئاوردوویان بو بێنی و بیر و هاوێریان له

کەل بکا. کوێخا پتر لە هەوار دە بوو. راوەکەوی دە کرد. زۆر جار دە چوە لای شوانەکان و مەڕگەیە سەر دەکردەوە. حەوتووی رۆژێک دەهاتەوە گوندویا بە سەفەر دە چوو. لەم ناوەدا شەز ئازاد بووم. هێندێ جار دە چوومە کوێستان و هێندێ جاریش لە گوندێ دە بووم. هەر سێ مانگ جارێکیش دە چوومەوە سەردایک وبابم دەدا. ژیانی خۆش و سواری و دەستبازی و چنگەپرچە لەگەڵ کیژ و ژنان زووتر لە کاتی پێی دە گەیاندم. کوێخا مانگی دوو سێ جار دە ینارد مە خانێ و دیاری بۆ فەرماندەی ژاندارمە و گومرگ و ئێنتزاماتی عەشایری دە نارد. ژنە عەجەم دەوریان دە دام و داوای شتوومەکی عێراقیان لێ دە کردم.

بەهاری ١٣١٥ بوو دەولەت ویستی پاسگەی ژاندارمە لە دەلاوان دابنێ. کوێخا تەنگەتاو بوو. دەستی کرد بە هاتووچوو وبەرتیل دان، بەلام فایدەی نە بوو. خانوویەکیان پێ چۆل کرد و حەوت ژاندارمیان نارد بۆ دەلاوان. خەلکی گوندە کەس پێوە هەراسان بوون. قەت ژاندارمیان لە نێوخۆیان نە دیبوو. ناویان نا- بوون (قولەشین). کوێخا کە زانی جوابی نادەنەوە شەوێک چەند پیاوی ناردن کە ئەسپی ژاندارمەکان بدزن. ژاندارم کردیانە تەقە وهاوار و کەس بە هاواریا- نەوە نە چوو. بەیانی لەسەر نانخواردن بووین ژاندارم وە زۆر کەوتن. دەستیان کرد بە هەرا کە بۆچی بە هاوارمانەوە نەهاتوون. کوێخا گوتی: هەرا هەرای ناوێ. من کێشکچی ئێوە نیم. تا لێرە بن هەر ئەوەشە و ئەوەحالتانە. چل تمەن ست دەدەمێ و ژاندارمان بەرەو بڕووە. بەڵێ تا پاسگەی قایم دروست نەکەن لەوێ ناحەوێنەوە". سەرۆکی پاسگە چل تمەنەی وەرگرت و رۆیشتن و ئەو ساڵە نەهاتنەوە. پاش رۆیشتنی ژاندارمە دەلاوان وەک بازاری عێراقی لێ هاتبوو.

سەردارەکانی سندووس و شارویران زۆربەیان هاوینان دە هاتنە کوێستانی دەلاوان. کوێستانەکانی کانی خوا و قەبری هەنەوو پڕ دە بوون. حەیوان پێنج قران و یەک سەم ووشتر تمەنێک هەوارانەیان دەدا. کوێخا ئەستاندنی هەوارانەی بەمن ئەسپارد بوو. پیاوێکی لەگەل دەنارد و بە نێو تاولان دادە- چووین و هەوارانەمان دەستاند. ئاشنایەتی لەگەل ئەو سەردارانە لە ساڵەکانی تێکۆشانی سیاسی دا خێری دایەوە. گەرانی کوێستان و بەرەڵایی ژنان لە دەلا- وان و ژیانی خۆش هەستێکی لەمێشک دا دەجوولاندم و سەرم لە حەز لێکردن

وخــوشه ویستی دەخورا . هاوینی ئه و ساله دووسی که س ژنیان هــه لگرتبو
هاتبوونه دەلاوان که کویخا مــه سلهتیان بــۆ بکا . کاتــی گیا دروون و کوکردنه وه بــو
فــه عله نی وه گیر نه دەکوت . بۆ ئەوه کاریان پێ بکا کویخا خــۆی له مــه سله ت مات
کرد بوو . ئەوانیشی ده کاری به رد ابوو . ژنه کانیش لەمالــی کویخا بوون و یاریده عه د له
خانیان ده دا . یه کیك لەو ژنه ره دوا کەوتوانــه له سه ر بلا نــی جیگای بو راده خستم
پاشان به بیانووی ئه وه شتی له بیر چــوه ده هات ده پالم دەخــزا . به خویمو ه
ده کونیم ده ستی لــێ ده ده دام ماچــی دەکرد م . ده مگوت نمچیه وه هاوار ده کەم
ناچار بــه جــێ ی دەهێنتم . ئه که ر له گوند ی وه ر ه ز ده بووم ده چــو مــــه
کویستان . خــونشترم راده بوارد . بیجگه له هــه وای سازگاری کویستان و خــواردنــی
به تام و چیژ زوریشیان خــو ش ده ویستم . هینده ی جار کویخا ژن ده یگوت سه رمات
ده بێ لەگەل خــۆی ده ی نــواند م . کیژیکی هاوتەمەنــی منیان هێنا بوه هــه واری
ده یگوت وه ره با بچین مــه رشه له کان به وزینەوه . کاتیك ده چــوو ینه نــه دیو شیتر
مــه ره شه له له بیر ده چــوونەوه .

کورده کانــی گــه رمیــن

ئــه وساله هێنده ی مــه رداری گەرمینیش هاتبوونه کویستانــی ده لاوان .
سه ر هــوزەکه یان پیاویك بوو به ناوی ( برایمی حــه مــه ده شیمی ) . به خزمایه تی
ده که ینته کویخا و هاتوو چــۆی تاولــی کویخای ده کرد . منیشی ده برده مالــی خو
یان . کوریکی هــه بوو سینفی شه شی سه ره تایی به کورد ی خــوینــد بــووه . به زمانی
کورد ی ده ینووسی و ده یخوینده وه . من نه م دەتوانی کورد ی بخوینمەوه . بــــیرم
ده کرده وه بــۆزمانــی خــوم نازانم . ئه گەر فارسی بایه من خوینده وار تر بووم به لام
سه رم له کورد ی ده ر نه ده کرد . هاتوو چــوی مالی کاك برایم و دوستایه تی له گه ل
کوره که ی بوو به هوی ئەوه کتیبی کورد ی وه ر بگرمو بخوینمەوه . شیعره کانــی پایه بەرز
مــه لا ی کویه م لــێ وه رگرتبوو زوریشم له به رکرد بــوون . کاك برایم ده یگوت وه ره
له گه ل منبوخواری . له قوتابخانه بخوینمو له گه ل کوره کەی من ده بــی . به داخــه
وه سه ری نه گرتو ماله کاك برایمی که رانه وه بۆبیتوینی .

کاتیك له هــه وار دەهاتنەوه خــوار ژنه کانــی کویخا کاریان به نی ده کرده وه
زستانــی ده لاوان سارد و تووشه . ده بوایه سوته مــه نیەکــی زور بــوزستان دابخه ن،

کویخا سالی پیاویکی دەگرت کە ئاوردوو بۆ دیوەخانی بێنێ. بەلام سوتەمەنی زووری لە ئەستوی ژنەکان بوو. ئەو کارە چەتوونە کە و تبوە سەر ئەستوی عەدلە خان. هەموو رۆژی بەیانی دوو کوێ دریژی جل دەکرد تەوەرداس و گوریسی دەستدەدایە و دەچوە گوێنیان. دوو باری گوێنی دەهێنا و دەهاتەوە. ئەوەندەی دەهێنا تا بۆی زابوو بەشی زستانی دەکا. هێندی رۆژ ئەزیشی لەگەل خۆ دەبرد. ئاینەخانیش بەخیوکردنی ولاخانی دەستپێدەکردەوە. پایزان سەرباریکێنی لێ زیاد دەبوو. دەبوایە هەموو ئیواران تیلەکە پونیکیش بۆ شێوە خواری ولاخان بێنێ. تا بەفر دەباری ئەوە کاری بوو. کە لیك روژان لەگەل خۆی دەبرد مەزرا و قوماری لەگەل دەکردم و لە عەرزی دەدام.

کە پایزدا دەهات کاری ئێمیش دەستپێ دەکراوە. دەبوایە دەست بە ئەسکەندەرنامە بکەمەوە. ئەوەندەم خوێند بووەوە کە متر چاوم لە کتێب دەکرد خەلکی دەلاوان زوربەیان لە کوردستانی کە رەنەوە هاتبوون. هێندی جار لە دیوەخانی کویخا و یا لە دیوی زووری باسی کوردستان و شەری شیخ مەحمود و شەری نێو خۆی عاشیرەتەکانیان دەکرد سەرنجی رادەکیشام و هەوەل جار دەم بیست ئەکورد بۆ ئازادی شەری کردوە. ژنەکان باسی حەزلیکردن و رەدوا کەوتن و پیاو لە سەر ژن کوشتنی عەشیرەتی پیران و ئاکو یانیان دەکرد بە تامە زرویی گوێم بۆ رادەگرتن. ئەو زستانەش دوور لە دایك و بابم بە خۆشی لە دەلاوان رام بوارد. سەرەبەهاری بابم هاتسەرم یدا. کویخا مەرەززانی کرد کە مالمان ـ بێنە دەلاوان. چەند بارگین و پیاوی بردن و مالەکەمان باری کرد و لە دەلاوان لیك کۆ بووینەوە. براگەورەکەشم هاتبووە و ئیتر خیزانیکی تەواو بووین.

کویخا پەلە زەویەکی دایێ و باریك بەهاروو بە هەرەوەزچاندمان. رۆژی هەرەوەزی کیسکیك و رون و برنجی بۆ نارد بووین کە نانی بدەینەبە جوتیران هەرچەند مالمان هاتبوە دەلاوان بەلام ئەز هەر لە مالی کویخا بووم و ژنەکان نەیاندەهێشت بچمەوە لای خۆمان. کویخا تەواوی کار و باری گوندی و ئیدارە و هاتووچۆی بە بابم ئەسپارد بوو. مۆریکی هەبوو نامە و بەلگەی پێ مۆر دەکردن مۆرەکەشی دابوو بە بابم و کرد بوویە وەکیلی خۆی.

پونبەری سالی ١٣١٦ بوو فەرماندەی ژاندارمەری هاتە دەلاوان. بە کویخا

گوت . " تو ئه شێ ئه م کویستانانه بپارێزی . ئه مرت ده ده مێ ئه گه ر مه ری عیراقیه کان بێته خاکی ئێران بیان هێنه و تالانیان که ".
کویخا بو کاریکی ئاوا سه رشانی خوی ده چیری . سه رگورد فه رمانی فه رماندهی ژاندارمه ری فه رمانێکی ره سمی بو کویخا نووسی . پاسگایه کی ژاندارمه شیان له ده لاوان دروست کرد و ۹ ژاندارمی هاتبوونێ . هه موویان ترکی ئازربایجان بوون . هاتووچووی پاسگه م ده کرد و فیری ترکی ببوم.
ئاولی کویخا ئه وساله ئه چوبوو «هه واره فات» ئاخرین لوتکه ی به رز کویستانه کانی ده لاوان . بھو دیویشدا عێلی بابولی هه لیان دا بوو و نیوانیان له گه ل کویخا خوش نه بوو. له هاوینیدا کویخا پیاوی ناردن ئاوله کانیان بار کرد وکویزتیانه وه بو کانی خوا . پاش گواستنه وه ی ئاوله کانی کویخا شوانی بابولیان مه ریان ده هێنا جی هه واری کویخا و ئاویان ده دا و دیسان لێوه راند . ئه م شوێنه ملکی ده لاوان بوو. کویخا ئیواره یه ک پیاوه کانی گونده ی کوکرده وه و له نیوه شه ودا به ره و کویستانی ( هه وار فات ) کووتنه رێ . ژاندارمیشی له گه ل خو بردن . تاریک و روونی به یانی به سه ر شوانی بولیان دادا دەن . ئه میگه لانه ی له وێ ده لەوه ران گشتیان داگیرانه خوار و به تالانیان هێنا . له گونده ی را به دوور بمن ژن و مندالی بابولیانمان ده بینی هاتبوونه سه رسنوور و گریان و روڕویان بوو. هه موو یه ی بابولیان تالان کرا . ٢٠ ـ ٣٠ مال له ساجی عه لی داتران و مال ویران بوون . تالان گه یشته ده لاوان و بژاردیان ١٤٠٠ سه ر حه یوانی سپی و ره شانگ بوو. کویخا داوای کرد بو پاریزگاری گوند سه ربازی ده وله تی بێنه ده لاوان . سولتان (شقاقی) ره ئیسی ئینتزاماتی عه شایری له گه ل بیست سه رباز هاته ده لاوان وخیوه تیان هه لدا . هه موو روژی حه یوانیکی تالانیان سه ر ده بری و ده یانخوارد . کویخا ده یزانی ئه و حه یوانه ناخوری و ده وله تی عیراق داوای ده کرده وه ده ستی کرد به کورتیان . به ران و مه ره ئه ستیور وحه یوانی قه لەووکموره ی ده نارد له بازار ده فروشت و گیسک و حه یوانی ورده و له ر و لاواز و هه رزانی ده کری و له جی ی داده نان . هه موو روژی خه لکی ده لاوان هه ر که س بو خو ده چوو مه ری ده دوشی و شیره که ی ده مبرد . مه رداری گه وره ین خوری داوێتی حه یوان له به ر پاریزگاری گوانیان نا برنه وه

لە دەلاوان دەستیان کرد بە داوێن برینە وەحەیوانان و خۆرەکی زۆریان ـ
وەسەر یەك نا .

سەبەر ئەوە بوو کوێخا وژنەکانی پشکە گۆشتێکی ئەوحەیوانانەیان نەدە ـ
خوارد و دەیانگوت حەرامە . ! من زۆربەی رۆژ لە لای سولتان شقاقی بووم
فارسی و ترکیەکەم دەستە زەرد دەکرد و زۆر پێش کەوتبووم . رۆژێك سولتان شقاقی
گوتی : « لیرەکە سزنسیە گورانیە کمان بۆ بلێ ؟ »
گوتم هەیە . کابرایەك لەبیتوێنی هاتبوو حەیرانی زۆر خۆشی دەگوتن
بانگم کرد . کابرا دەستی دەبن گوێی نا و سێ حەیرانی زۆر خوێن و بەتامی
گوتن . کەتەواو بوو شقاقی گوتی : « دوغردان بوئیلە سوزدی ئوزادلار ) واتە
بەراستی ئەوەهەرقسەیە و دڕێژی دەکەنەوە ) .
پاش هاتوو چووشکایەت ، وەك لە بیرم بێ بابولیەکان ۹۰۰ سەرحەیوانیان
ومگیر کەوتەوە . پاییزی ئەوساڵە دەلاوان لەحاڵەتی شەردابوو. زۆربەی شوان
دەهاتنە سەرگوندی و دەبوو بەتەقە . هاوین ئیمە بەهەرموەز بەهاروەکە ـ
مان درو وەوگێڕەمان کرد ۱۰ باری کرد بوو . کوێخاش شەش بارگەنمی بۆ ناردبووین
خۆشمان رادەبوارد . زستان خوێندنەوەی ئەسکەندەرنامە هەر لە سەتۆی من
بوو . هێندی شەو لەگەل لاوانی گوند لە ماڵە کچ جوانان کۆدەبووینە و موجورابینمان
دەکرد . زۆر جار لەگەل خدری برازای کوێخا بەسەرماڵان دادەگەڕاین و خەریکی
شەو راوو شەیتانی دەبووین . ئەوەی راست بێ شەیتانی لە رادەبەدەر و تیژیکی
لە ژنان تەمەنی وەپێش خستبووم .
بەهارێ کوێخا لەگەل کابرایەکی خەلکی نەغەدە بەناوی ( رەحیم نەلوسی )
سنووری ( تەمرچیان ) ی لە دەولەت بە ئیجارەگرتبوو خوێی لێ بفرۆشی . بە
وشتران خوێیان دەهێنا و لە سنووری تەمرچیان بەکوردی ئەودیویان دەفرۆشت
خوێ لە عیراق قاچاخ بوو. کاروان دەهات باری دادەگرت و بەشەو دەگەڕانەوە .
کوێخا منی ناردە تەمرچیان و ەتنوێنەری ئەوحیساب و پول و کار و باری خوێ بە
دەستی من بوو. لەپەنا ئیدارەی گومرك و ژاندارمە زووریکیان ساز کرد بوو لەگەل
کابرایەك بەناوی ( سوفی سولتان ) لەوێ دەژیام . پاشان ( مەلای رەنی ) ی رەحمە
تینی ببوە شەریك و هاتە وێ . پێکەوە دەژیاین . پولی خوێ من وەرم دەگرت و حەوتوی
جارێك بە سواری دەچوو مەوە دەلاوان پولەکەم دەدا بەکوێخا و پاشان خوێیان لە

گەل ئەریەکان حیسابیان دەکرد .

ئەو ساڵە لۆری لە عیراقەوە گەنمیان بۆ ئیران دەهێنا . من هاتووچووی زینوی شێخم دەکرد و لەگەڵ ژیان و هەستان و دانیشتنی کوردەکانی ئەودیو ئاشنا دەبووم . هاتووچووی خانێم دەکرد دیاریم بۆ ژنەکانی فەرماندەی ژاندارمە و سەروکی گومرک دەبرد . کاری ئیمە ئیواران دەستیی دەکرا . کاروان ئیواران دەهات بە روژ بێکار بووین . کتیبی کوردیم لە زینوێ وەردەگرت و بە دزی دەمهێنا . لە گەل مەلای رەنی دەمانخویندەوە . بۆ هەموو جار لە زینوی شیخ وحاجی ئومەران پولیسی کوردم دەدی، پێم سەیر بوو . کەم کەم چاوم دەکراوە .

ئیوارە یەک تازە کاروان رویشتبوو دیتم ژاندارم دوو کوردی ئەودیویان گرتووە و دەیانهێنن . لێم پرسین خەلکی کوێن ؟ . کە زانیان کوردم لە چوونە ژووری دا یەکیان بە ستە یەکی دەباخەلی راکردم و چووە ژووری . چووم لای ژاندارم و زورم هەول دا بەریان بدەن نەکرا هەربە و شەوە ناردیانن بۆ خانێ .

کاتێک چووم وە ژورە کەی خۆم بەستەم تەماشا کرد ... دیناری عیراقی بوو . بەیانی سوار بووم چووم وە دەلاوان و پولەکەم دا بە بابم . گوتی نابی دەستی لێ بدەین تا خاوەنەکەی پەیدا دەبێتەوە . مانگێک تێ پەڕیبوو ئیوارە یەک دوو کەس بۆ خوێ کرین هاتبوون . باریان داگرت و پولیان دا و یەکیان گوتی : "عەیب نابی پرسیاریک بکەم؟" .

ــ نا بۆچی بیفەرموو بزانم

ــ من برای ئەو کەسەم کە لێرە گیرا بوو . ئیستا لە ورمێ سێ مانگیان حوکم داوە . من چووم بۆ ورمێ و سەرم دا . دەیگوت پارەکەم داوە بە کوڕێکی مێرمندال . جانازانم .

گوتم : "پارەکەلای منە . بەلام برد و مەتە وە دەلاوان و لە مالێم داناوە . ئەگەر دەچی بابم دراو ەکەت دەداتەوە ."

ــ مالت ئاوا بی . من ناچم . لی دەگەرێم تا بۆخۆی دێتەوە

ئەم هاوینە لە بەزم وهەرای کوێستانی دەلاوان و سوورانەوەی نێو گوندی بەش بووم . بەلام تووشی بەزمێکی دیکە بووم . سوفی سولتان کەمالی لە تەمرچیان بوو، جار و بار بۆ فراوین بانگی دەکردین . روژیک لە گەڕانەوەدا تووشی پۆلە ژنێک بووین گەسکیان دەکردن . یەکیان بانگی کرد :

ــ مام سوفی ئەری ئەوە کێیە ؟ .

ــ راست بـێخـو بهـتـی بووکـی .

هاتە پیش و بەخێر هاتنی کردین . کچێك بوو لەگەڵ سك دراوسێ بووین . لەگەل خـوشکی دەهات . مالـی ئێمەو ئومارمان دەکرد . پرسیم لێرە چدەکەی ؟

سوفـی کوتـی با بروین من بۆت دەگێرمەوە . " ئەو کیژە بابی داویەتـی بەپیاو ـ یکی پیر لەتەمەنی بابی دا . زۆر دەولەمەندە مەڕ دارە . تاوڵیان وا لەوبەرەوە ری هەڵداوە و ئەوە ئێستە ئێیا لە هەمواریە .

رۆژێك لەگەڵ مەلای رەش بەرەحمەت بـی دا نیشتبووین چامان دەخـوارد ە و منداڵێکی چکۆلە هات و پرسی . " کاك کەریمکـی یە ؟ " بورە فاتم بانگی دەکا . مەلای رەش کوتـی هەستە برۆ ، دەنا خـۆم دەکەمە کـەریم و دەڵێم بەشە و دێم . ئەگەرچووم فاتم لە نێو رەوەزە بەردێك دانیشتبوو . دەستی کرد بەگریان .

ــ بابم بە تۆێزی داسی بە کابرایەکـی پیر . ماڵمان لە قـەمتەری بوو ئێستا هاتوینـە تەمرچیان . مێردەکەم لە قـەمتەری لە سەر دەخل ودانە . منیش بەتەنیا لە هەوارم ئەو کچە چکۆلەم لە کنە . ئەوتاولەی لەهەموان گەورەترە هی ئێمەیە . خـولا غەزەب لە بابم گری . "

تاولەکانیان هەر لەوبەری پاسگا هەڵیان دا بـوو . فاتم گەلێك بەمیانیان زوو شیریژ و رونـی بـودەنارد ین . هەموو جاری مەلای رەش دوعای بـۆ دەکردم .

سەروکـی پاسگای تەمرچیان عەجـەمیکی تریاکی دریژ بەناوی ( مستەفا خان ) بوو . عەجەم حالەتـی وابوو ئەگەر لەولاتی خـۆی ریخ ریژ بایە کە دەهاتـە نیو کوردان دەبـوو بە ( خان ) یا ( ئاغا ) . بەکورتی لەقەبیکی بۆخـۆ سازدەکرد و یان کوردەهیچ و پووچـە کە بۆی سازدەکرد . مستەفا خان عـەجـەمیکی بیستانچـی لە تەمرچیان دیتبووە و رۆژی بەشی زور لەوێ بوو . میرزا لـی بیستانچی لەتەمرچیان شیزێك پاسگا بێستانیکی زور باشی کرد بوو . کاڵەکـی میرزا لی بەناو بانگ بوون . رۆژیکیان مستەفاخان لە مالـی میرزا لـی بانگێشتنی کردم . کە چـوم دیتم میرزا لی هەر کالەکی باشی نیە ژنەکەی لە کالەك شیرین‌ترە و مستەفا خان بە خـۆرایـی پاسگا بـە جـێ ناهێلێ . رۆژێك لە بیستانـی میرزالـی تەقەی تفەنگیك هات . کەچـووین تەرمی میرزا لی لە وێ راکشابوو . مستەفا خان گویا تفەنگی لە دەست دەرچـوو بوو .

مستەفاخانیان تیکەوە پیچا وگرتیان . ژنـی میرزالی هاتو پاراوە کە بچم حیسابـی

بۆ بنووسم . کەسی دیکە تورکی نەدەزانی . ناچار دەچووم حیسابم بـــۆ دەنووسی . جاری وابوو دەترسا ئەو نەیدەهێشت بچمەوە . سەلای رەنگە قسە خۆشەکانی قەت لەبیر ناچنەوە بەکالەک و شیرپێژ و رۆن خەنی ببوو.

پایزخۆی فرۆشتن تەواو بوو، چووینەوە دەلاوان . رۆژێک کابرای خاوەن پارە لە عیراقەوە پەیدا بوو. پارەکەی وەرگرتەوە وکە لێک مەمنوون بوو.

ئەو دەوەتی هاوین وپایزان لە کوردستان باو بوو. لە دەلاوان ئەو داوەت بۆ هەرزەکاران وەکتۆیز بۆسوڤیان فەرز بوو. هەتا نیوەشەو لە شەو داوەت دەبووین . ئەوساڵە کیژێکی زۆر جوان لە شنۆ زەنگەوە هاتبووە ماڵە خزمێکی لە دەلاوان . کوڕوکاڵ دەوروو یان دەدا . ماڵە خزمەکەی بۆ مێمانیان ساز کرد بوو. فاتمی کچی عەولای ئەحمەد مامزی بە جارێک خۆی لە من خۆش کرد بوو. منیش زۆرم خۆش دەویست و ئەگەر لێم دەگەڕان دەبوایە لە ماڵە برایم‌گادر ڕێز خزمی فاتمی بم بینێنەوە . پاش ماوەیەک بابی هات کیژەکەی بردەوە . هەول جار هەستم بەخەم و پەروشیێک کرد کە لەگەڵ خەمی جارانم فەرقی هەبوو. ژنەکانی کوێخا گاڵتەیان پێ دەکرد و سەریان هاوێشتبوو سەر.

دوومانگی پایز مابوو چەند کوردی کە رەمینهاتنە ماڵی کوێخا و دەیانویست حەیوانیان بۆ بکڕێ و بە قاچاخ بۆیان بە رێ بکا . قەراریان لەگەڵ دانا کە حەیوانی پێنج تمەن بدەن بە کوێخا . کوێخا ئەو کارەی بە بابم ئەسپارد . لەگەڵ کوردەکان بابم رووی کردە سندوس و شار وێران و حەیوانێکی زۆریان کڕی و دەیان ناردەوە دەلاوان . لەوێشەوە شەوێک کوێخا ئاوای دەکرد و پارێکی باشی وەردەگرت .

## بەرەوکۆڕانی ژیان

لەساڵەکانی ١٣١٦ ـــ ١٣٢٠ کابرایەک بەناوی (قازی شێخ تەها) لە مەلاجان پەیدا بوو. کابرایەکی خوێندەوار، ژیر، زمانلووس، شەرلاتان . لەنێو دێیوکریان لە ترسی وسیناغای مێرەدێ رای کرد بوو هاتبووە گوندی ( کاسەکەران ) لە پێشدا وەک مەلا و پێش‌نوێژ دامەزرا بوو. پاشان خۆی کرد بە شێخ و هێندێ دەرویشی کەری لەخۆکۆکرد بوونە و موو دەستی لە حەکیمایەتی وەردەدا و ماڵەکەی هەمیشە پڕ بوو لە نەخۆش و نییەت و شتی وا . لەنێو خەڵکی نەخۆیندەوار و هەژار بۆی گرتبوو چاکی دەمروتاندنەوە .

پاشان له پر ده فته ری ماره و ته‌لاقی وه رگرت و بوو به سه رده‌فته ری ره سمی .
ئه که ر تا ئیستا سه لا شیخ ته ها بوو ئه م جار ببوه قازی شیخ ته ها . له گشت
لاجان بیجگه له قازی که س نه ی ده وێرا ژن‌ماره بکا . ژاندارمی به گژ خه لك دا
ده کرد و ئه م جار به ژن‌ماره‌کردن خه لکی ده رووتانده وه . ماله که ن‌پر ببوو له
کچ وژنی ره ده وو کهوتوو وتارازی و ته لاق دراو.

له م نێوه دا کابرایه ك کچیکی هه لگرتبوو هێنا بوویه مالی کویخا که‌مه‌سله
تی بو بکا . کویخا نامه یه کی بو قازی شیخ ته ها نووسی وداوای لی کرد که
ئیجازه بدا مه لایه‌کی تر کیژه که ی له کابرا ماره بکا . کاغه زه‌که ی به من دا نارد .
که چووم قازی گوتی: من‌بابت‌ده ناسم و ته‌نانه ت له محال جیران بووین . ده بوایه
بۆ سه رم بدا . پاشان گوتی ئیجازه ناده م و کیژه که ئه شی بێته ئیره . وه لامی
نامه که ی‌نه‌نوسیه وه . کویخا توره بوو. نارد ی مه لای هینا و کیژه که ی له کابرا ـ
ماره کرد . پاشان چووه خانی و پولیکی دا و ژاندارمی به گژ قازی دا کرد ن .
ژاندارم قازیان هه لیچا و بیانوویان لیّ‌دیته وه و برد یانه ورمیّ و به‌هه زار کیشه
کلکی له تـه له به‌ر بوو.

پاش‌ئه وه له‌چنگ‌ژاندارم نه جاتی بوو ماڵه‌که ی هینا ( سی کرد کان ) و هاته
ماله کویخا و ئاشت‌بوو ته وه . مانگی یه ك دووجارده هاته ما له‌کویخا و کویخای بانگ
ده کرد و به جاریك خـۆی له گه ل ریك خستبوو. هه ر له وکاته ن‌دا خه ریك بوو
له بنه وه ده ستیکی لـیّ بوه شێنی . داوای له بابم کرد بوو که سۆ ری کویخای بدا
تیّ تا به لگه یه کی ساخته دژی کویخا ساز بکا . دیاره بابم نا ئه مینی نه ده‌کرد
ونه ی دابۆیه. قازی ئه م جار ده بابمی هه لیچا بوو . لای کویخا ده ستی گرد بوو
به شه یتانی وشوفاری و نیوانی کویخا و بابمی تیکدا بـوو.

پایزی که بابم حه یوانی بو کورده کانی که ره‌مین‌کریبوو، هه م ئه‌وان و هه‌م
جه له ب فروش‌پارمه تی بابمیان دابوو. ماینیکی له راده به ده ر جوان‌وباشی
کریبوو که له ناوچـه دا تاق بوو. قازی به‌کویخای گوتبوو ئه‌و ماینه ی به پولی تۆ کریوه
و بیجگه له‌وه ن‌بۆده بیّ ولاخی له هی تو باشتری هه بی .

کویخا به شه یتانی قازی دلی گرمیّ ببوو له بیانوو ده گه را . سارد ی
پایز بوو کابرای له ته مرچیان ... ده یناره که ی دابوو به من و پاشان وه ری گرتبووه
له گه ل پیاویکی دیکه له مالی ئیمه په یدا بوون. په‌نجا هه زار تمه نیان هینا

بووکە بابم حەیوانیان بۆ بکڕێ. بابم بە کوێخای گوت. ئەویش رازی بوو بەو شەرتەی حەیوانی پێنج تەمەن بدەن بە کوێخا. کابرا رازی بوون. خۆیان لە مالی ئێمە مانەوە و بابم سوار بوو بەرەو شار ویران تا حەیوان بکڕێ. پاش سێ رۆژ بە فوریکی ئەستوور باری. ئێتر حەیوان بە کوێستانان دا دەرنەدەچوو. بابم کە راوە کابرا هەر ئەو رۆژی پارەکەیان وەرگرتەوە و رۆیشتنەوە.

بە یانی چووینە دیوەخانی کوێخا. پرسی: کەی هاتوویەوە؟

— دوێنی ئێواری. حەیوان نەدەکڕا

— کابرا چییان لێ هات؟

— هەر دوێنی ئەو رۆیشتنەوە

کوێخا وەك ورچی برینداری نەڕاندی. بۆچی بە منت نەگوتوە؟. من چۆن دێلم ئەو وانە پارە بەرنەوە. تولەی ل من خەیانی. ئێتر مە یە لای من. لەگەل ئەو رۆیشتن دەبێ بارکەی و برۆی.

بابم ئێتر لە مالەوە دانیشت. من وەسەر خۆم نەهێنا و هەر وەك جاران دەچوومە دیوەخان و مالی کوێخا. گالتە و بەزمی خۆم هەر دەکرد.

بەلام هەستم بە لالوتی کوێخا کرد بوو. گوێم نەدەدایە دەچووم یارییەدەی — ئایشە خانم دەدا و لە تەویلە ولاخم لەگەل تاقەت دەکردن. رۆژێکی کە چووم ئایشە خان گوتی: ئێتر مە یە ئێرە. کوێخا لێت تورەیە و شەوکە دێتەوە هەر جنێوان دەدا. دەترسم زیانێکت پێ بگەیەنێ. مە یە ئێرە".

زۆر تێکچووم. کولی گریانم هەستا. ئاوم لە چاوان گەڕا. بەشێوەیەکی بێ ئەوە پێوەندی بەرابردووە هەبێ، هەستم بە خۆشەویستی ئایشە خان کرد. سەری بە سینگی خۆیەوە نام ماچی کردم. منیش هەردوو رووەتم ماچ کرد. بە گریی چوومەوە. بۆ دایکم نەگیراوە. سوێی خۆم بێ رانەگیرا چوومەوە مالی کوێخا. نەچوومە دیوەخان راست چوومە مالێ. کوێخا ژن بە گەرمی لە دایك و بابی پرسی. گوتم ئایشە خان لەکوێیە؟.

عەدلە گوتی: "کە ریمکیان مە یە ئێرە. کوێخا رازی نییە. ئێمە زۆر بە پەرۆشین تۆ تاقە کوڕی ئێمە بوویی. مالی ئێمە بە تۆوە ئاوەدان بوو. بەلام وای لێ هات ئەو مندەیان شەیتانی کردوە کوێخا هار بوە. جاری مە یە تا بزانین لەکەی شە— یتان دێتەخوارێ.

کوێخا ژن هەستا ماچی کردم و گریا . منیش کوڵی گریانم لە ئەوکێ دا بوو کوتم باشە دەڕۆم . گوتی : " ئایشێ لە تەویلە یە ناچی خوا حافیزی لێ بکەی ؟ . چووم ە تەویلە . کە چاوی پێم کەوت گوتی :

ـ ئەیرۆ ئەوە بۆ هاتووی ؟ . نەمگوت مەیە ؟ .

ـ خۆم پێ ڕانەگیرا . بەلام ئیتر نایەم . چونکە عەدلە بە ئاشکرا گوتی نابێ بێی . هاتم خودا حافیزیت لێ بکەم . لە ئامێزی گرتم باش لە بیرمە کە ماچی دەکردم دلوپەی فرمێسکی بە سەر ڕوومەتم دا کەوت . منیش گریام . بەلکە دەسمالی ڕوومەتی ئەسترییەوە . هاتمە دەری . عەدلە گوتی : " ماچیکت نەدا بەمن ؟ "

ئەویش ماچی کردم و چوومەوە مالێ . دایکم گوتی : " وا زوو هاتییەوە دەریان کردووی ؟ . گوتم : " کوێخا گوتوویە نەچمە مالیان ".

پاش دوو ڕۆژان کوێخا ناردی تفەنگەکەی لێ ئەستاندەوە . زستان هەر لەو ڕێ بووین و بابم نەیدەهێشت وەدەر کەوین . لە هەموو خەلکی دەلاوان دەوومال دەستیان لە دەستایەتیمان هەلنەگرت و هاتوچۆیان دەکردین . کوێخا ژن زۆر جار گۆشت و ڕۆن و پەنیری بۆ دەناردین .

ڕۆژێکی بەیانی کوێخا ژن برازایەکی خۆی نارد و گوتبووی : ئەگەر داو پاکاغەز و شتیکیان هەیە بیهێنێرنەوە . کوێخا دەمێکی مالیان دە پشکنێ . وا دەزانێ لە کڕینی حەیوانان دراوێکی بریان وەگیر کەوتوە ."

هیندێ کاغەز و نووسراوەمان هەبوون بابم گوتی باش نییە وەبەر دەستیان بکەوێ . پەنجا تەمەنیش دراو بوو . کەوتینە فیکر چییان لێ بکەین ؟ .

گوتم : " پێیان دەن بمەن . دەچمە سەرکانی ژنان و ئەگەر ئایشەخان هات دەیدەمێ و بۆمان هەلدەگرێ ."

پێیان نەگبیری چاک بوو . نووسراو و دراوەکەیان لە پەڕۆیەک وەرپێچا و بۆلای ـ کانی ژنان ڕۆیشتم . لە نیزیککانی چوور دەسمالی ماهرەسووری شیخ محەمەدی . کە چوومە ژوور تەندووریان دابوو . بەخێرهاتنیان کردم و چایان لێ نا . بە مندالەکانم گوت : ئەگەر ئایشەخان چووە سەرکانی پێم بلێن . " تازە چایان تێ کردبوو مندال هاتن و گوتیان ئایشەخان لە سەرکانییە . خێزانی مامڕەسوو گوتی :

ـ بە قوربانت بم ئاگات لەخۆت بێ . " کە چوومە سەرکانی بیجگە لەوکەسی دیکەی لێ نەبوو .

— ئەی برۆ ... بەو سەرمایە لێرە چ دەکەی ؟
— لە بەر تۆ هاتووم . بزە یەکی شیرینی هاتێ .
— ئاگات لە خۆت بێ . وە دەرمەکەوە
— هانێ ئەو بەستەم بۆ هەلگرە . کەس نەزانێ .
— کارێکی باشت کردوە . خەریك بووم خەبەرت بدەمێ . پیرەسەگ دەنێری مالتان دەگەرێ .

بەستەکەم دایە و چوومە وە مالە مامرەسوو. چام خواردەوە و پاشان چوومە وە مالێ .

## بەشی سێ یەم

گێرە و کێشەی ئیدارە و کوێرەوەری .

پاش چەند رۆژ بەیانیەك نان و چامان دەخوارد عەولای برازای کوێخا لەگەل حەسەن بالەکی نوکەری و یەکی دیکەوە ژوورکەوتن . گوتیان کوێخا گوتوویە مالەکەتان بپشکنین . وەك ژاندارم دەستیان کرد بە گەران . هیچیان نەدیتەوە . پاشان چوونە تەویلە مایەکەیان دەرکیشا و بردیان . دایکم و مندالەکان دەستیان کرد بە گریان . بابم دلخوشی دانەوە و هەر ئەوروژە لەگەل بابم چووینە خانێ . لە ژاندارمە وەزە بانی شکایەتمان کرد . گوتیان ناسە بۆ کوێخا دەنووسین . دوو روژ لە زەرکەتەن میوانی ( حەمەدی برایماغا ) بووین کوێخا جوابی نەدابوونەوە . بابم هەر لە زەرکەتەن بوو من چوومەوە دەلاوان . پارە ونووسراوەکانم لە ئاپشەخان وەرگرتەوە و هاتمەوە زەرکەتەن لای بابم . لەوێوە بە پێیان کەوتینە رێ بۆ سندووسی . شەو چووینە گوندی ( چوار بوت ) مالە حاجی سەیدوسینی . بەیانی هەرچەند هەولیان دا کە ولاخی سواری بەرین بابم نەیویست . چووینە نەغەدە . لە نەغەدە میوانی ( فەقێ ئەحمەد ) ی دوکاندار بووین . فەقێ ئەحمەد خوی بە خزمی کوێخا دەزانی . تەنانەت خوی بە شەریکەملکی دەلاوانیش دادەنا . گەلێکی قەدرگرتین وگوتی : " شکایەت بکەن هەرچی لە دەستم بێ یارمەتیتان دەدەم . بەیانی لە نەغەدەوە چووینە ( دانی دورگە )

ماڵە مەشەدی موحەرەمی . مەشەدی موحەرەم ئاغای داندووکە بوو. پاییزی ڕابردوو لەگەڵ بابم حەیوانی کڕیبوو. چەند جار هاتبووە دەلاوان و ئاشنای کوێخا مەرەزین بوو. مەشەدی گوتی : « نابێ شکایەت بکەن دە چمە لای کوێخا و ماینەکەی لێ دەستێنمەوە و ئاشتو دەکەمەوە » . بابم لە ماڵە مەشەدی بە جێ ما و من لەگەڵ ئەو چوومەوە دەلاوان . مەشەدی چەند ڕۆژ لە ماڵە کوێخا بوو جوابی نەدراوە . سوار بوو گەڕاوە و من لە ماڵێ بە جێ مام .

سەرەبەهار چاوەڕوان بووین بابم بێتەوە . ڕۆژێك کوێخا هەشت نوکەسی نارد ، سەرچاڵەکانیان داوە و هەرچی هەبوو بردیان . من هەلاتم چوومە خانێ . شکایەتم کرد و ناوی ئەوکەسانەم دا کە چاڵیان دەرهێنا بوو .

لە گەڕانەوەدا چوومە گوندی بەندەرە . داوام لە کاک عەولای بەندەرە کرد کە خانوێکمان بداتێ تا بابم دێتەوە بۆ ئەوێ . کاک عەولا وەك پیاوان چەند نۆلاخێکی بۆ پەیدا کردم و دوو پیاوی لەگەڵ ناردم ماڵەکەمان بار کرد و هاتینە بەندەرە . دوو گامێش و دووکەلیچەمان ما بوون . لە بەندەرە لەمخانوێکی شڕ و شرۆڵدا و بێ خەبەر لە باب زۆر نا ڕەحەت بووین . پاش دوو حەوتوو ترس و پەکەڕانی لەمخانێ عارە بەیەکی بارگینمان بەکرێ گرت و ماڵمان بار کرد بۆ چواربوتێی ماڵی حاجی سەید وەسمینی . شەو دەرنگانێك گەیشتینە چواربوت .

حاجی سەید وەسمین لە سەییدانی کونەقەڵا و برازای حاجی سەید عەزیزی کونەقەڵا بوو. دە بوو زڕکوڕی دایکم . پاش مردنی حاجی سەید حەمەدەمینی باوکی، دایکم میردی بە بابم کرد بوو. حاجی سەید مستەفای بالاگیر و سەید ڕەسووی کونەقەڵا و حاجی سەید وەسمین دەبوونە زڕکوڕی دایکم. زۆریان قەدر دەگرت و هەموو ساڵ لە دوویان دەنارد و وەك دایکی خۆیان چاویان لێ دەکرد .

ماڵە حاجی لێمان وەدەر کەوتن . بەخێر هاتنێکی گەرم و شتووەکان بردە ژوور و پتر لە حەوتوویەك لەوێ حەساینەوە . لەماڵی ئەوان دەمانخوارد و دەنووستین . زۆر بە ڕەحەت بووین بەلام نەدەکرا هەر لە سەر سکی خەلك بژین و سەربار بین . دە بوایە جیگا و کار و کاسبیەك پەیدا بکەینەوە . هەرچەند حاجی سەید وەسمین دەیگوت نابێ بڕۆن و لێرە پێکەوە دەژین بەلام نەدەکرا. لەگەڵ کاکم بەرەو دێهاتی سندۆس و شنۆ کەوتینە ڕێ بە لکوو لە گوندێك فەعلەیی، توتنەوانی،

کاریک کاسبیەک بدۆزینەوە. لە سندەر و شنۆ ئەو کەسەی مندالی زۆر بان بە تووتنەوان رایان دەگرت. ئاغا بە بێگار جێی تووتنی بۆ خۆش دەکردن و کابرانی تووتنچی دەچەقاند و رەنێوی دەهێنا. هەتا پاییزی کە تووتن دەفرۆشرا ئاردێک کە نەیکی دەدایە. ئەگەر تووتن دەفرۆشرا ئاغا حیسابی دەکرد و پوولی لە دوکانیە وەردەگرت و بە پیاوەتی خۆی ئەگەر هیچی دابا بەتووتنەوان یان‌نا.

ئێمە پێنج مندال بووین و بەهیوا بووین رامان‌گرن. چەند گوندان گەڕاین لە هیچ کوێ خانوومان وەگیر نەکەوت. لە بابم نێو بانگی شێخ جەلالی دەمێ بوو مندمان بیستبوو. شێخ جەلال مرۆڤێکی ئازا و بە زمان و دەزی ژاندارم و زۆر بە تەنگ لی قەوماو و زۆر لیکراوانە وە بوو. گوتمان با بچینە لای شێخ جەلال رامان دەگری. لە گوندەی دەربەند رومان کردە مالی شێخ جەلال. پیاوێک لە بەر دەرگا بردینیە ژوور و گوتی: "ئیستا ئاغا دێتەوە".

کە چووینە ژوور بە پێچەوانەی ماتاخی قوولە ئاغاکانی تر، ماتاخێکی پڕ فەرش و مافوورەی جوان. کورسی و سەندەلی. تابلۆی جوان بە دیوارەوە. چەند کتێبی فارسی لەسەر تاقە. شێوە شارستانیەکی پێشکەوتووانە. زۆری پێ نەچوو شێخ جەلال لەگەل ژنێکی رەش‌ئەسمەری جوان و مژور کەوت. بە خێر هاتنی کردین و پرسی لە کوێ و مهاتوون؟. پێش ئەوە کە ئێمە وەلامی بدەینەوە گوتی: "ئاغا کوری میرزا حامید بن؟". کاکم گوتی: "بەلێ هەوین. لە بابم بێ خەبەرین مالە کەمان هێنا و ئەنچەوار بوت. ئیستا دەمانەوێ لە گوندێک جێگا بدۆزینەوە و کار و کاسبیەک بکەین. هاتوینە خزمەت جێگامان بۆ بدۆزیەوە".

شێخ جەلال بە تورکی قسەکانی بۆ خانم گێرایەوە. پاشان گوتی: "باوکتان لە ورمێ بە. هاتبوە ئێرە. ناردمە ورمێ. نامەم بۆ نووسی بۆ بارێزەیکی ورمێ ئاشنای خۆمە. دوو سێ رۆژی تر خۆشم دەچم. کاریک بە سەرکوێخا هورمز دێنم بۆ هەموو کەس ئاقلی دەکەم. جێگاتان بۆ ئێوە دەبینمەوە. ئێوە مجێلن. دەتوانن کاسبی بکەن، منەتی کەس هەلمەگرن. خۆشم ئاگام لێتان دەبێ".

خانم بە رووی خۆی دەربری و برێک جنێوی بە دەرەبەگی کورد دا و پرسی:

ـ خوێندەوارتانە؟.

شێخ جەلال نەیهێشت ئێمە وەلامی بدەینەوە گوتی: هەردوو خوێندە ـ وارن.

ئاشان‌گوتی : " هه‌سته له نێوئه‌وکتیبانه دا گولستان بینه ". شیخ جه‌لال نه خوێنده‌وار بوو به‌لام فارسی باش‌ده‌زانی وحه‌ رفیشی ده‌ناسین . کتیبه‌که‌ی لیك کرده‌وه‌وگوتی ئه‌م دوو شیعره‌م بۆ بخوێنه‌وه . شیعره‌کانم خوێند وه‌وه خانمی گوت زور باشی خوێنده‌وه. ته‌ماشای منداڵی مه‌که. لای بابی خوێند و به‌ده‌ مینیرمه‌ مه‌دره‌سه . خانم پرسی : " ترکی ده‌زانی ؟ ".
ـ که‌میك ده‌زانم .
ـ ( گیره‌ك یورگانیمیز) ده‌بێ فیربی .
نانیان‌هینا . دوای نانخواردن به پیاوه‌که‌ی گوت : " برۆ بانگی حه‌مه‌دی‌که" هێنده‌ی پێ نه‌چوو حه‌مه‌د هات . پیاوێکی ورێچوو، تیکه‌ پشتوو، قسه خوش،
ـ حه‌مه‌د چای بخووه و له‌گه‌ل ئه‌وکورانه بچوّ ( جاشیران) لای برایم ئاغا . سلاوی لێ بکه و بلێ خانویان بداتی، باوکیان خوێنده‌وارێکی باشه، خوّشیان ـ خوێنده‌وارن . با خانوویان بداتی خوشم چاوه‌دێریان ده‌که‌م . پێی بلێ بابیان مریده‌ی شیخی بورهانیه .
من پیکه‌نیم وگوتم : " بابم مریده‌ی شیخی حسامه‌ددینه .
ـ قسه‌ی ناکا ئه‌وانه‌ که‌رن . له‌وی هه‌ر به‌ سه‌ری شیخی بورهان سوێند بخوّ.

برایم ئاغا کێ بوو ؟

برایمی ماجه‌هان ئاغای جاشیران برای قه‌رمنها غای ما مه‌ش‌بوو. بو که‌ریه‌تی به‌نیو بانگ‌بوو. قسه‌ی سه‌یریان لێ ده‌گیراوه . ده‌چوه‌سه‌ر دوکانی پارچه‌فروش‌و پارچه‌ی قیمه‌ت‌ده‌کرد . کابرا ده‌یگوت‌گه‌زی به ١٥ قران .
ـ به‌سه‌ری ئاغاله‌دوو تمه‌نت‌پتر نا ده‌مێ . !
ده‌یانگوت ٨ نوکه‌ری سواری هه‌بوون وخه‌لات‌و به‌راتی ده‌دانی . گاتی به‌ سه‌فه‌ر ده‌چوو ده‌یگوت‌ولاخان سازکه‌ن. نوکه‌ره‌کان بسواری ده‌هاتن له‌به‌رده‌رگای‌دیوه‌خان راده‌وه‌ستان. ئاغا ده‌هاته‌ده‌ر و پرسیاری ده‌کرد :
ـ ئه‌ده‌ی ئه‌سپی من‌له کوێ‌یه ؟ .
نوکه‌ره‌کان ده‌یانگوت : " چوون ئه‌سپی خوت‌زین نه‌کرده‌وه؟. ئێمه پیمان ناکری له‌سه‌ر تو راوه‌ستین . "
ـ که‌وایه به‌جێم مه‌هێلن ئیستا ئه‌سپه‌که‌م زین ده‌که‌م .

خالیکم هــە بوو نوکەری برایم ئاغا بوو. دیکوت : " لە شاری شنو رانك و چوخەی بەدرون دابوو . روژیك کوتــی بچــوو رانك و چــوّخە کانم بــوّ بینە وە . چــوم رانك و چــوّخەم دە بەرکرد و هاتمە وە. چــومە دیوەخان. برایم ئاغا گوتی :

ئــە حمەد رانك و چــوخەت هینانە وە؟

ـ نە خیر ئاغا نەدروا بوون .هــە ستا هاتە پیش و کوتــی :

ـ ئەحمەد ئەو رانك و چــوخەت لە کوێ بووە؟

ئـ ئاغا لە بازاردە یانگیران و کریومن . دوای حــەوتوویەك گوتــی :

ـ ئەحمەد ناچــی رانك و چوخە کانم بــوّ بینیەوە؟

ـ ئاغا ئەدی نەم هینانەوە بە کەیفیت نە بوون گوتت بوّ خوت دەبەریان کــە "

ئــەو کابرایە ئاغای گوند بوو، ئیمەش موحتاجــی ئەو دەبووین . شیخ جــەلال گوتی : " داوای هیچــی لــێ مــەکەن .هــەر ئەوەند خانووتان بداتی ماڵە کە تان بچــی . هــە موو کاریکتان پــێ دەسپیری . برایم ئاغا زور کەرە، خانم ئاغایەتی دەکا . ئیمە لە گەل کاك حەمەد (کە پاشان بومان دەرکەوت حــەمەدی خانــی بوو لە دوا روژدا بوو بە هاوڕێیەکی بە نرخ و تیکوشەری حیزبی ) چوینە جاشیران . برایم ئاغالەبەر دەرگای دیوەخان راوەستا بوو. هــەر لە دوورەوە نەیهیشت ئیمە سلاو بکەین بانگی کرد :

ـ حــەمەد بە خیر بیّ ی. ئەو کورانە کین؟ " . ( هــەموو ئاغانەزان و قورد ماخەکانــی ماســەش بە تایبەت تایفەی حــەمەد ئاغا بوّ ئەوە وەلامــی سلاوی رەعیەت نەدەنەوە ، لــە دوورەوە کابرایان دەنگ دەدا و نەیان دەهیشت سلاو بکا .)

کاك حەمەد قسەکانی شیخ جەلالی پیّ گوت. برایم ئاغا گوتی : " بە سەری ئاغا خانوی چــوّلم نیە . ئەگەرخانوو چــوّل بوو خــەبەر دەدەمە شیخ جــەلالی .

کەراینەوە. کاك حەمەد کوتی : " چابوو خانووی نە بوو، حاوانەوە لەگەل ئەو کەرە دژوارە. دلخوشی داینەوە . کوتــی : " من باوکتان دەناسم. خەمــێ مــەخون . لە هــەر کوێ بیّ چاك بەرێ دەچن. ئیستا گەورە بوون. لەم ولاتە سال دوازدەی مانگ کاسبی هــەیە. فــەعلەیی، توتنەوانی، بەندەوانی، هــەر چــی بیّ بیکەن. جاری لە گوندیك خانوو پەیدا کەن. ئەگەر دراوتان پیویستە تا بتان دەمــێ ".

سوپاسی کاحەمەد مان کرد و چووینەوە کن شیخ جــەلال . گوتــی : " بچنەوە پاش دووسی روژ لیتان دەگیرمەوە. " . پاشان گوتــی : " سەریکی نەغەدە بدەن. بچــــنە

مالـی فـەقێ ئەحمەد . ئەو خـەبەری یابتان دەزانـی .

بەرەوئەغدە لە دەربەند کەوتینە ری . لە نیزیک گوندی ( گورناوی بنه) تووشـــی پیاویک بووین لە سـەرزاوە دەچـووە . ماند و نەبوونیمان لی کرد . کابرا پرسی :

ـ خەلکی کێن و دەچنە کوێ؟ .

ـ دەچینە ئەغدە . داخوا لیرە خانووی چول هـەیەمالمان بێنە ئێرە ؟ .

ـ چکارەن ؟ چیتان لە دەست دێ؟ .

ـ هیچمان لە دەست نایە . لە دەلاوان کوێخا سـەرەزتالانی کردوین و ئیستا دەمانەوی لە گوندیک خانوو پەیدا کەین و کاسبیەک بەدوزینەوە . هـەموو کاریک دەکەین . باوکمان خـویندەواریکی باشە .

ـ ئەگەر باوکت پیشنوێژمان بکا راتان دەگرین . مەلامان نیە . خـوشتان دەتـوانن کاسبی بکەن . لە ئاغا زەویتان بۆ دەستینین بیکەنە شکارتە . دەتوانن توتنیش بـکـەن ئێرە بو کاسبی زور باشە . ئیستا وەرن میوانی من بن . ئیواری کەیخودایان کو دەکە-مـە وە قسەیان لەگەل دەکەین و مالەکەتان دێنین .

ئێمە هـەر لە وە دەگەراین . چوینە گوندی . نانیکی باشیان سازکرد . ئیوەرو چوینە سەرکانـی نویژیکی حیسابیمان کرد . چـەند کەسی دیکەش هاتن . کاکم گوتـــی با نویژەکمان بە جـەماعـەت بکەین . زوریان بە کەیفی بوو . ئیواری خـەلکی گوندی کوبوونەوە، دەرویش رەحمان گوتـی " هـەر لە مـەلا دەگەران لە جیاتی مـەلایک دووم بـو پەیدا کردوون . بریاریان دا جوتیەندە بارە گەنمیک و قـەرەش دوو پوت بەراتمان بدەنی . هـەرمالە جوتیەندەش هاوەبە کایەک و بیست باقـە وێنجەمان بدەنـی .

ئەو لە گورناوی ماینەوە . بەیانی چاوەرواتـی نوێنەری ئاغا بووین لە چیانە وە بـێ و باسی خانوی لە گەل بکەین .

گورناوی بنه طلکی غولامرەزاخانی خوسرەوی بوو . کابرایەکی کرد بوە نوێنەری خـۆی بە ناوی تەیمورئاغا بە سەر طلکە کانی رادەگەیشت . تەیمورئاغا نەخویندەوار بوو دەستەلاتیکی تەواوی دابویە . روژی جاریک دەهاتە گورناوی سەری سـەرزای دەدا سوفی رەشید پشی کرد بوە گزیر و بەر دەستی خـۆی . سوفـی رەشید لەو کاتەدا کـە گزیرو بەر دەستی تەیمورئاغا بوو، شوانکارەشی بوو . لە مالـی سوفی دادە بەزی و خولا پێمنە گری دەیانگوت شەریکە مالـیشن !

چاوەڕوان بووین تەیموورئاغا هات. کەیخودا لێی کۆبوونەوە. گوتیان دەزانی گوندەکەمان بێ خوێندەوارە. بۆ تەلقینی مردوو بە دوای مەلادا دەگەڕێین. ئێستا مەلامان دەبێتەوە. ئێمە بەراتی دەدەمێنی و تۆش خانوو وجێی تووتنی بدەیە.
تەیموورئاغا بەخێرهاتنی کردین و پاشان نووسراوێکی هێنا دەرو دای بە من بۆی بخوێـ نمەوە. نامەکەم خوێندەوە کەیفی پێ هات. گوتی: من خانوویان دەدەمێ. بەڵام ئەوەش ئەو بەراتەی دەمیرنەوە دەبێ بیدەمن. خانووی بۆ نیشان داین. گوتی: ئەگەر خۆتان خانووی تازە دروست بکەن منیش دارو پەردوتان دەدەمێ.
ڕۆژی دوایی عارەبەیان سازکرد و دووکەسمان لەگەڵ هاتن و چووین ماڵەکەـ مان بارکرد و هاتینە گورناوی. خەڵکی گوندی پیمانەوە هاتن و زۆریان ڕێز لێ دەناین. بەهار بوو فەعلەیان بۆجۆماڵ دەگرت. ویستمان فەعلەیی بکەین. کاکم بوو بە فەعلەی جۆماڵ بە ١٣ پووت گەنم. منیان وەرنەگرت دەیانگوت کارت پێ ناکرێ.
بەیانی چوومە نەغەدە لای فەقێ ئەحمەد. گوتی: "بابت لە ورمێ شکایەتی کردوە. ئێستا چۆتە سابلاغ. چیتان پێویستە لە دوکانی من بەرنەوە. نیوەڕۆ بردمیەوە ماڵ. نانـ و چامان خوارد و پاشان گوتی: "پێنج کچم هەن و کوڕم نییە. وەرە ببە بەکوڕی من. کەسم نییە". گوتم: "جارێک بووم بە کوڕی کوێخا تالان کراین. ئێستا ببم بە کوڕی تۆ لەوانەیە کوشتنی بە دواوە بێ".
دوای نیوەڕۆ ماڵ ئاوایم کرد و هاتمەوە گورناوی. جارێکی دیکەش هەموومان لێک کۆبووینەوە. ڕاستە تالان کرابووین، بەڵام حاڵمان شپرزە نەبوو. دووکامێشمان هەبوون شیریان دەدا. بارە ئاردێکمان کڕیبوو. ئەوەندە بوو کارمان نەکرد بوو، کاسبیمان نە دەزانی، دەست و پێ سپی بووین. کاکم بوو بە فەعلەی جۆماڵ و منیش لە ماڵ مامەوە.
پاش دوو سێ ڕۆژ باوکیشم هاتەوە. خەڵکی گوندی پێیەوە هاتن و هەر شەوە ماڵێک بانگی دەکردین. بەهار بوو خەڵک خەریکی شتڵ چاندن بوو. جێگایان دابوو بە ئێمەش شتڵی تووتن بچێنین. بابم کشت وکاڵ و کاسبی زۆر بە سەلیقە بوو. حەزی لە جووت وکا دەکرد. تەیموورئاغا پێمانەوە هات و لە نێزیک گوندی پەلە زەوییەکی بۆ شکارتە دابینی وجێی تووتنی بۆ نیشان داین و گوتی: "جێی دوو پووت چەڵتووکیشتان دەدەمێ"

شکایەت و ئیدارەی عەجەمان

بابم لە ورمێ لە دادگا شکایەتی کرد بوو. لە سابلاغیش چونکە دەلاوان سەر

بە فەرمانداری مەهاباد بوو شکایەتی کرد بوو. سەدری قازی ئە هید گەلیکی یارمەتی دابوو. نامەی بۆ هەموو شوینە بەرزەکانی دەولەتی و وەزارەتخانەکان نوسیبو. لە نەفەدە خوا لیّ خوشبوو مەلا حەمەد مەمینی بورهانی قەولی پەیدا بووکە لە نوسین و کیشەی دادگادا یارمەتی بدا.

مەلاحەمەد مەمینی بورهانی پیاویکی زاناو روناکبیر و ئازا و لایەنگری هەژارو لی قەوماوان بوو. سەردەمیك پاریزەری عەدلیە بیوّرایکەیاند بووکە بە خۆرایی و بیّ پارە پاریزەری فەقیر وهەژاران وەئەستوّ دەگری. کاتیك کە ( ئەرشەد ) سەروکی ئینتزاماتی عەشایری بوو مەلا حەمەد مەمینی بورهانی کرد بوە حاکمی شەرعی و شکایەتی بۆ لای ئەو دەناردن. روژیك لە مزگەوتی نەفەدە لە خزمەتی دانیشتبوم سەربازیك دوو کوردی هینان و نامەیەکی سەروکی ئینتزاماتی عەشایری پیّ بوو نووسیبوی.. " جەنابی ملا محمد ئەمینی بورهانی تکایە شەرعی ئەم دوو کەسە بکە و ئیمەش لە نەتیجە ئاگادار بکەوە". کابراکان هاتن، سلاویان کرد. یەکی روتەلەی فەقیر و ئەوی تر ئاغایەکی گوك و پوشتەو لوت بەرز. ماموستا پرسی کیشەی چیتان هەیە؟ .
کابرای ئاغا هەلیدایە : " قوربان من ئارەحمانی (سەلگیز) م. کوری حاجی عەولا ئاغای قەلاتان. ئەوکابرایە شلتاغم پیّ دەکا. "
ماموستا فەرمووی : " بابم تۆ دەلیّی چی ؟ . ئیدعای چیت هەیە؟ .
ـ قوربان ئەم ئاغایە بە چایەزی گرتووم بە دوو بار گەنم و ٤ تمەن پول و دەستیك لیباس تائیستا خزمەتم کردوە. هیچی نەداومی. ئیستاش دەرم دەکا. "
کابرا لە قسەکانی بووە. ماموستا ئیتر هیچی لە ئاغا نەپرسی. فەرمووی : " وەلاهی وە بیلاهی وە تەلاهی بابم بە هەقی ئەو قسوعانە راست دەکەی".
ئاغا واقی ور ما. گوتی : " ماموستا جا شەرع چون وادەبیّ؟ ".
ـ هەستە سەگباب. لە بیرت نایە چەند مەلا دەچوینە شنویە ولاخت نەدەاینی لە چومی بپەرینەوە. ئیستا دەمنووسم تەواوت لیّ بستینن " !

باسی مروفایەتی و ئازایەتی مەلاحەمەد مەمینی بورهانی کتیبیکی تەواوی گەرەکە با بیّمە وە سەر باسی خومان. بابم لەو سەفەرانەدا دوو جەلد قانوونی کریبوو، شەوورۆژ دەیگوت بیانخوینمەوە. زور جیگای بۆ دەگوتم. لە عەدلیەی ورمیّ گوتبوو- یان دە بیّ شاهید نامیك بینی کە کویخا مەرەز تالانی کردووی. مەلاحەمەد مەمین

شاهید نامیکی بـۆ نووسیبووین و دەبایە لە ناوچـەی پیرانان بـە خـەلکی ئیمزا بکەین. بابم نەیدەتوانـی بچێتە بەری پیرانان، ناچار ئـەوی نارد کە شاهید نامـەکە بـە خـەلک دا بگێرم و ئیمزای بکـەن. شاهید نامـەم هـەلگرت و لە گوندەکانی پیرانان بە پـێ بان سەرەو خانـێ کەوتمە رێ. لە رێدا دەترسام نەکا تووشی پیاوەکانـی کوێخا صـەرز بم.

ئێوارە رۆژ دەمهات لە کەل ئاوا بـێ گەیشتمە خانـێ. هیلاکـی رێگا و بیرم لەوە دەکردەوە کە شـەو لە کوێ بنووم. خانـێ ئەو دەم هوتێل و میوانخانەی لێ نەبوون. خـەلک لە زەرگەتەن لە مالـی دەوست و ئاشنایان دەمانەوە. تووشی چـەند ئاشناو ناسیار بـووم سلاویکی سـەر پێیان دەکرد و دەرۆیشتن. لە چایخانەیەك چام خـواردەوە و هاتمە دەر و لە فیکری جیگای شەودا هاتوو چـوم دەکرد. لە پر لـە قـوژبنی دیواریك چاوم بە ژنیکی قیت و قوز کەوت، جلی قـەرەنگی لە بـەردا و چارشێو بە سەرەوە و چاو لە مـن دەکا. لە پێشدا لام وابـوو ژنـی خـەرابە و لە موشتەری دەگەرێ. بیستبووم حکوومـەتی رەزا شا قاحبەی بـۆ شارەکانـی کوردستان ناردوون و لەم رێگایە وە دەیەوی خـەلك گێژ بکا. بریك رۆیشتم و گەرامەوە بریارم دا بچمە (زەرگەتەن) و لە مالە ئاشنایەك و ەژوور کـەوم. چـەند هـەنگاو رۆیشتبووم گوێم لـێ بوو بە ناویانگم دەکەن. ئاورم داوە روانیم بیجگە لەو ژنە کەس دیار نـەبوو. راوەستام. ژنە کە هاتە پیش و گوتـی:

ـ بـو وا حـە بە ساوی؟ . . . دیارە جـوابم نادە یـەوە.

ـ ئای فاتم شـەوە تـوێ؟

ـ شـەدی کـێ بـە؟ وەرە . . وەرە . .

چوومە پیش. واقم ورما.

ـ کچـی فاتم ئەوە لیرە چدەکەی؟ . ئەو لیباس و چارشێوە چـە؟

ـ تو دەزانـی؟ . ئەگەر تـو پیاو بای من لیرە چیم دەکرد؟ . جاری لەو قسانە گەری وەرە بچینە مالـی.

مالـی چـی؟ ئاکا میرد ت کرد بـێ؟

ـ میردم بـە حاجیاغای ژاندارمـەکردووە و مالمان لیرە یـە.

حاجیاغاو ئـە کبەر شمشیری دوو ژاندارم بوون لە ناوچـەی پیرانان و لاجانـی ماسـەشان. ئاگریان کرد بـووە. کەس نەبوو لـە دەست ئەم دوو ژاندارمـە زالەی نەبە، لە هیچ جنایەتیك دەستیان نـەدەگیراوە. هـەرچـی کرد بایان لێ پرسینە وەنـە بوو. ئاغاو سەرەك عـەشیرەتە نەزان و ترسە نوکەکانـی کورد لە ترسی ئەم دوو ژاندارمە ـ

کـونە مشکیان بە ئاوات دەخـواست.

حاجیاغا هاتوو چـوّی گوندی ( شنوزمنگ ) ی کردبوو. لەوێ چاوی بە فاتمە جوا نێ کەوتبوو بـە خـوشی و یا بە زوری فاتمی برد بوو لای قازی شیخ تـە ها کە هاو ـ دەستی ئەم دوو ژاندارمـە خوێن خوّرە بووە مارەی کردبوو و لە خانـێ مالـی بوّ دانا بـوو. فاتم و مەوای خـوّی دام و بردمـیە مال . مالیکردوو وەتاخ . فەرش کراو خاوین . پالپشتی بوّ دانام و هات دانیشت و دەستی کرد بەگریان .

ـ بـوّ دەگری؟ مالی لەوە خـوشتر ئیتر چیت دەوێ؟ .

ـ چـوّن نەگریم؟ پاش ئەوە لە دەلاوان گەراسـە وە هـەر بەهیوای توّ بووم. ئیستا ش لە کویم دەبینی . ئەو ژاندارمـەسەگبابە هاتووچـوّی مالی ئیمەی دەکرد . زوّر ابگم هـەر بوّ ئەوە لە مال دا نە میتم فریوی دام. بابیشم دەیزانـی . رەگەل حاجیاغایان خستم.

ـ باشە تازە میرد تکردوە و گریانـی ناوێ .

ـ راوەستە با سـە ماوەرکە تیّ بایم

ـ سەماوەری چـی ؟ من دەروم وناتوانم لیرە بم. حاجیاغا دەمناسی و بێتە وە باسی سە رە .

ـ حاجیاغا تا پنج روژی دیکە نایە ئەوە بە دراوسیان دەلیّم ئاموزامـە حاجیاغا ش بێتە وە و میەر شەقانـی دەدەم ، ئـەجـە مە دەزانم . . چوّن سواری بم. ناهێلم بروی تولّەی هـەموو شتیکت لـیّ دەکەمـەوە. ئاو دینم لاق و دەستانت بشوّ. بحەسیوە. ئیستا چا سازدەبـیّ .

فاتم ئاوی هینا و دەست وچاوم شوّشت و هات چایەکـی تیکرد و گوتـی :

ـ توّچا بخوّ وە من نان سازدەکەم. نانمان خـوارد ییامان خـواردە وە و یادی ئـەو شـە و روژانـەمان کرد کە لە دەلاوان رامان بوارد بـوو. دوای بەینیک گوتم .

ـ زور ماندووم. لە سندوسیەوە بە پیـیّ یان هاتووم. جیگام بوچاکە با بنووم.

ـ یانـی بە تەمای بنووی؟ . خـەراپ نیە. ئیستاجیگات بوچا دەکەم بەلام نوستن نا زانم . فاتم جیگای راخست و گوتـی : " ئەوە جیگای توّیە دەزانم ماندووی فـەرمـو راکشی .

ـ ئەدی تو لە کویّ دەنووی؟

ـ لەخـەمـی من دامـەبە. جیگام هـە یە .

چـوە ژوورەکەی تر و هیشتا چـرام نە کوژاندبووە بە کراسیکی قولە و تەنك و نیوە روونە وە

لێم وە ژوور کەوت و دەمپێی ناڵم خەزاو گوتی . "جا بنوو".

بە یانی بە هیلاکی هەستام و نان و چامان خوارد . فاتم گوتی :

ــ ئەگەر کارێکت هەیە بە حاجیاغا جێی بە جێ ی دەکەم .

ــ کارم نیە حاجیاغا هەر ئەوەندە پیاوەتیە بکا هەتا هاتم لەماڵ نەبی بەسمانە .

خوا حافیزیم لە فاتم کرد و چوومە قەڵاتی موتاوی ماڵە سەید عەولا . باسی شکایەت و شاهید نامەم کرد . گوتی . "لە پێشدا بچۆ قەڵاتە رەشی لای قەرەنیاغا ئێستا لەگەڵ کوێخا سەروەز تێکچووە . ئەگەر ئەو ئەمزای بکا ئیتر لەم ناوچەیە هەموو کەس ئیمزای دەکا ."

هەر ئەوروژە چوومە ماڵە قەرەنیاغای پیران . شەو لەوێ بووم و مەسەلەکەم بۆ گێراوە، قەرەنیاغا گوتی . "هیچ ئاگام لێ نیە . بەلام بروکە ئیمانیلم هەیە ئەوێش لەسەر ئەوە دادەنێم. شاهید نامەکەی ئیمزا کرد و سۆزی بە نێو پیرانان دا گەرام و نیزیکەی بیست کەس ئیمزای کرد . دەبوایە لەمخانێ شارەوانی ئیمزاکان تەصدیق بکا . هاتمە ومخانی ئیتر لە بێ جیگایی نە دەترسام وەزلەهەیە بوو. حاجیاغا کارێکی وای نە کرد بوو من بێ جیگا بمێنمەوە . شەو میوانی فاتم بووم و بەیانی چوومە شارەوانی و تکام لە سەرۆکی شارەوانی کرد کە ئیمزاکان تەصدیق بکا . گوتی . " ئەو ئیمزایانە ناناسم. بەلام ئەگەر قازی شیخ تەها تەصدیقیان بکا مێنیش مۆر و ئیمزای قازی تەصدیق دەکەم.

هەرچەند لەگەڵ قازی نێوانمان نەبوو. قازی ببوە هۆی هەژاری و دەربەدەریمان بەلام ناچار چوومە سی گردکان و بە وەهیوایە دەتەنەنی دەدەمێ و پێ ی تەصدیق دەکەم. بیستبووم لەگەڵ کوێخانی نێوانی زۆر سازنەماوە .کە چوومە (سی گردکان) خواردراستان قازی تەشریفی لە ماڵ نەبوو. قازی کوڕێکی هەبوو بە ناوی (بابە شیخ) لەتەمەنی مندا و رەنگە تەختێک پچووکتریش. نێوانمان لەرادە بەدەر خوش بوو. چەند جار لەگەڵ باوکی هاتبوە دەڵاوان. لەمخانێ یەکترمان دیبوو. لەوتەمەندا کەس ئەوەندە نێوانی پێکەوە خوش نەبوو. بابە شیخ دایکی خۆی نەمابوو. نازانم تەلاق درابوو مرد بوو یا رۆیشتبوو. لە بەر دەستی زردایکی زۆر کەلەلا و نارەحەت بوو. کزی و بێ دەستەلاتی ولارملی پێوە دیار بوو. کوڕێکی زیر و جوان وخەتخوش بوو هەستی بە ساختە چیەتی باوکی کرد بوو زۆر جار کردەو و ئاکاری باوکی لەگەڵ ژن و کاردانی ماڵێ و بیگانە بۆ دەگێرایەوە.

قازی برازایەکی هەبوو بە ناوی (عەبدولخالق) . لەگەڵ بابە شێخ یەکتریان خۆش دەویست و بەو هۆیەوە لە گەڵمنیش دەوست بوو. ئەویش سەد ئەوەندەی بابە شێخ لە دەست مام و ئامۆژنی بێزار بوو. ساڵی ئاخری کە لە دەلاوان بووین، هاتووچووی ماڵی قازیم دەکرد . عەبدولخالق دەیگوت : " ئامۆژنم لە حەیفی کردەوەی مامم بۆی هەڵکەوی دەست ناگیرێتەوە . بۆ دەستێکی ناگەیەنیەی؟ . وەك بۆی دەگێڕامەوە قازی دڵ پیسی لە ژنەکەی دەکرد و بیجگە لە بابە شێخ و عەبدولخالق نەدەبوایە پیاو بچنە دیوی ژووری .

ئەو ڕۆژە بابە شێخ بەچوونی من کەیفی ساز بوو . بۆ هەموو جار بردمیە دیوی ژوورێ . خێزانی قازی ژنێکی جوان و شوخ . گەلێکی بە خێر هاتن کردم وگوتی :

" بابە شێخ زۆر باست دەکا . بچنە دیوەخان ئێستا نان وچاتان بۆ دەنێرم . بە بابە شێخم گوت بۆ تەسەلەیەکی ئاوا هاتووم .

ـ چاك بوو بابم لە ماڵ نە بوو . لەماڵ با نەیدەکرد . یان پوولێکی زۆری دەویست . بانی هاتووی . مۆرەکە لەماڵە . منیش ئیمزای باوکم ڕاست وەك ئەو دەنووسم . ئێستا مۆرو ئیمزای دەکەم و گیر مەبە بگەڕێوە .

یەك دوو جار ئیمزای باوکی پرۆیە کرد و لەگەڵ ئیمزاکانی دیکە بەرئاوردمان کرد هیچ فەرقی نەبوو. شاهید نامەمان مۆر کرد و لە خوارەوە نووسی : " مەتلەبی سەرەوەو مۆر و ئیمزاکانی خوارەوە بە تەواوی تەسدیق دەکەم. سەر دەفتەری ازدواج و تەلاقی ژمارە . ای لاجان قازی عەلائی ".

کارم ڕاستهاتبوو. گیر نە بووم گەڕامەوە بۆ خانێ . چوومە شارەوانی و بە سەرۆکی شارەوانیم تەسدیق کرد و ڕۆژ دەرنگ بوو چوومەوە ماڵی حاجیاغا و ئەو شەوەش لە لای فاتم خەوم لێ حەرام بوو. بەیانی زوو کەوتمە ڕێ و هاتمەوە گورناوی .

## گورناوی و قورە کاری

ئەو خانووەی لە گورناوی دابوویانینی، زۆر بچووك و وێرانە بوو. ڕۆژێك تەیمە ئاغا هات وگوتی : " ئەگەر خۆتان خانوو دروست بکەن من کاریتە وکولەکە و دار و بەرد وەتان دەدەمێ " . بابم دەستی بەبنایی هەبوو. نەخشەی نیو ماڵێك و وەتاخ و تەویلە و حەسارێکی گەورەی کێشا و دەستمان کرد بە قورە کاری . ئێمە قورمان دەشێلا و

خۆشمان دەکرد و بابم دیواری دادەنا. عەرزێك لە پەنا ماڵەکەمان بوو ئاوی تێدا رادەوەستا و ببوە گۆلاو. ئاوەکەمان لێ بڕی. بە خۆڵ و مشکی پڕمان کردەوە و دیوارمان لەدەورە کێشا و پەرژینێکی دەورمان بۆ ساز کرد و کردمان بە سەوزی خانە و تا ساردی پاییز خەیار و تەماتە و پیواز و کەلەمگۆڵ و ریحانە مشە بوو. بەشی دراوسێیانیش دەدرا. لەگەل خەلك باش ریك کەوتبووین. نێوانمان خۆش بوو. حاجەتی خەلکیمان دەکرد. سەرە بەهار هەمووزیان بۆ کردین و زەویەکمان بۆ کێلاین. لە بەهاردا بابم ٥-٦ باری گەنم سەلەم کرد. بە شیلگیری خەریکی قورە کاری بووین و خانوە کەمان تەواو کرد جیرانان جێی تووتنیان بۆ خۆش کردین و ١٥ رۆژی بەهار مابوو تووتنمان چەقاند.
بۆ هەوەل جار خۆشی هەمووزی تووتن چەقاندنیش حالی بووم. تووتن چەقاندن لە کوردستان دنیایەکی تایبەتی هەیە. بێجگە لە یاریدەدان و دەستەوا و هاوکاری، جێژنەی کیژو کوری هەمرزە کارە. لەسەر دێراوی تووتن، لەریگای چوون وهاتنەوە لە وچان و نانخواردن و حەسانەوە، هەزار راز و نیاز دەکورد رێنەومو چاو برەکێن دەکرێن و زەردەخەنەی شیرین تەحویلی یەکتر دەدرێن. ئێمە کە ماڵە مەلا بووین کیژو کوری گوندی بە گشتی هاتبوونە هەرەوەز ویەکێك لە رۆژە خۆشەکانی ژیانمان بوو. خەلکی گوندەکانی دەور وپشتی گورناوێ بۆ نامە نووسین و مەولود نامە خوێندنەوە دەهاتنە لامان و ئەوەندەی لە توانامان دا هەمبا یارمەتیمان دەدان. بابم ویردی زمانی ئەوە بوو دەیگوت. "نابی کەس بە ناهومێدی لە ماڵی ئێمە بگەرێتەوە".

## وەدوا کەوتنی شکایەت و هاتووچووی شار

بابم گوتی ئێمە خەریکی کاسبی ماڵ و تۆش شکایەت و هاتوچووی شار بکە. چووینە لای مەلا حەمەد مینی بورهانی. وەکالەت نامێکی بۆنووسین و بە بەخشداری نەغەدە ئیمزامان کرد. بابم بۆ هەموو کارێکی ئیدارە و شکایەت و ئاشتی داخوازەکانمان لە کوێخا عەرەز کرد بوومە بە وەکیل. دەبوایە بچمە ورمێ و شاهید نامەکە بدەم بە دادگا. لە بیرمە پێنج قرانم دا و بۆ هەوەل جار بە ماشێن چوومە ورمێ.
بیستبووم کە کوردەکان لە قاوەخانەی شێخ دادەبەزن. قاوەخانەی شێخ لە ئەنقاسی بە هەلەوی کاروانسەرای کوردان بوو. ئەوجێگایەکیان پێ نیشان دام و بە بانی چام دەمخوارەدوە شێخ جەلال وەژوور کەوت. کە چاوی بەمن کەوت گوتی:

ـ ها لەگەل بابت هاتووی؟

ـ نەخێر بە تەنیا هاتووم. شاهید نامەم هێناوە.

شاهید نامەکەی لێ وەرگرتم و پاشان گوتی بۆم بخوێنەوە. خوێندمەوە. قەلەمێکی وەرگرت و لە خوارەوە ئیمزای کرد. پاشان وەدوای خۆی دام بۆ عەدلیە. دیار بوو لە عەدلیە زۆر بەکار و بەگوێ بوو. لە دەفتەری عەدلیە شکایەتەکەی ئێمەی دیتەوە. شاهید نامەکە و وەکالەتنامەکەی منی لێ قایم کرد. رونوسێکی تەصدیق کراوی دەفتەری دادگای وەرگرت و دای بەمن. پاشان چووینە لای بازپرسی دادسەرا. میرزا قادری ئەمینی خەلکی سابلاغ بازپرسی دادسەرا بوو. شیخ جەلال باسی شکایەتەکەی بۆ گیراوە و گوتی. "پێویستە هەرچی پێت دەکری یارمەتیان بدەی.

میرزا قادر گوتی. "دادستان دەوسیەی شکایەتی حیسابی ناردوتە لای من. روونوسی شاهید نامەکە بۆ من بێنن. ئەوەی پێم بکری دەیکەم. روونوسێکی شاهید نامە و وەکالەتنامەی دا بە بازپرس و لەگەل شیخ جەلال هاتینە دەر. رووی لە من کرد و گوتی. "ئیرە عەدلیەیە. کەسێك کاری کەوتە ئیرە رزگار بوونی نیە. لێرەدا هەرچی سەر کەوتن مانەوەو نەبوونە. نەکشانەوەیە. کولنەدانە. هەرچەند دەستت بە سینگیەوە بنێن دەبێ پتر بچیە پێش." پاشان گوتی دوو رۆژ راوەستە پێکەوە دەچینەوە سندوس.

پاش دوو رۆژ لە گەل شیخ جەلال سواری عارەبانەیکی یەك ئەسپە بووین و شەو هاتینە گوندی ئەرمەنیان (داریاری) لە چوغری وەرسێ میوانی ئەرمەنیەکی ئاشنای شیخ جەلال بووین. من هەوەل جار بوو نانی ئەرمەنیانم دەخوارد. پێم وابوو خاوێن نیە. لە کاتێکا نان و چێشتێکی زۆر پوخت بوو. بۆ خەوتن ئەدنارد پانصە مالیکی نر. تا رۆژ لە ترسان خەوم لێ نەکەوت. بەیانی بەدولێ سامورتە وسە خان تاوەردا کەوتینە رێ و ئێوارە درنگکەیشتینەوە دەربەندی شیخ جەلال. لە رێگا حکایەتی خۆی بۆ دەگێرامەوە کە لە شەری یەکەمی جیهانیدا چۆن بە دیل گیراوە و بردوویانەتە رووسیا و لەوێ فەعلەیی کردوە. باسی زولمی ژاندارم و حکومەتی رەزاشای دەکرد و جنێوی بەدەرەبەگو سەرەك عەشیرەتی کورد دەدا.

ئەم سەفەرە و تووشبوونی شیخ جەلال لە شارەزایی و وریایمدا تەئسیری زۆر بوو.

بیجگە لە شکایەتی عەدلیە پەیتا پەیتا نامەشمان بۆ شوێنەبەرزەکانی حکومەت دەنووسی و لە چنگ زولمی کوێخا سەرزدادمان دەکرد. دوو جاران کوێخا سەرەزیان لەگەل ١٧ کەس کە ئێمە شکایەتمان لێ کرد بوو، برد بوویانە سابلاغ و بۆ ورمێ یان

ڕاکێش‌کرد بوون. ئەو کارە خەڵکی دەلاوانی ترساند بۆو زۆریان بە نهێنی دەهاتنە لای ئێمە و دەپاڕانەوە کە وازیان لێ بێنین. لەم ناوەدا سەید بابەدین ـ میرزای کاك مامەندی کۆلیج و قازی شێخ تەها بە نووسین و ڕاوتەگێر یارمەتی کۆیخایان دەدا.

ساڵی ١٣١٨ بوو قازی شێخ تەها بە تاوانی بەرتیل و کردەوەی نالەبار گیرا و بردیانە ورمێ. ڕۆژێك مامەند ئاغای پیران لە گورناوی پەیدا بوو. گوتی:

ـ هاتووم بۆ خۆت یا یەکێك لە کوڕەکانم لەگەڵ بنێریە ورمێ. " بەبابمی گوت. بابم منی لەگەڵ نارد و چووینە ورمێ. لە فەرمانداری کاری هەبوو. من وەك دیلمانج لەگەڵی بووم. پاش ئەوە کاری تەواو بوون و هاتینە سەر گەڕانەوە گوتی: " تاقە کارێکم ماوە. ئەویش بکەین و دەگەڕێینەوە. با بچین سەرێکی قازی شێخ تەها بدەین لە بەند یخانەدا. " .

گوتم: " قازی ئەو هەمو خەراپەی لەگەڵ ئێوە کردوە ئێستا تۆ سەری دەدەی؟ .

ـ هەر بۆیە دەچم پێم خۆشە لە زیندان دا بیبینم. چووینە زیندان. قازیان هێنا. پاش چاك و خۆشی قازی گوتی: " مامەند ئاغا زۆرم خەراپە لەگەڵ ئێوە کرد. وەرە تۆ چاکەم لەگەڵ بکە. هەرگیز لە بیرم ناچێتەوە. ". مامەند ئاغا گوتی: " قازی دەستم بڕوا پێسکانت دەخۆم و خۆدە بەسەر داویم".

## حەساری گەورە و ماڵی ئاوەدان

پاش ئەوە کە دیواری خانوەکە تەواو بوو ڕۆژێك دار و پەردوو و کاریتە و کۆڵەکەیان بۆ هێناین و دەراوسێ یارمەتیان کرد و خانووەمان داپۆشی. بێجگە لە ژووری نێو ماڵ ژووری دانیشتن و حەساری گەورە و مودیرن و لە ناو گوندا وەك خانووی دەولەمەند و ئەعیانان دەچوو. گورناوی سەرە ڕێگای شنو ونەغەدە بوو. خانوەکەی ئێمە ئەو عەیبەی هەبوو لە دوورەوە سەرنجی میوانی ڕادەکێشا. ئێوارەی بازاڕان گەلێك جار میوانی نەناسراو لێمان وەژوور دەکەوتن. تا ماڵمان لە گورناوی بوو زۆر کەم بێ میوان دەبووین. هێندێك تەنیا میوانی نانخواردن بوون و دەڕۆیشتن. بەلام هێندێك دەبوونە دۆست و ئاشنا وهاتوو چۆی یەکترمان دەکرد. لەدوا ڕۆژدا ئەم میوان وئاشنایانە بوون بە ئەندامی حیزب و لە تێکۆشان دا بەشداریان دەکرد.

لە هاوین دا باوکم سەفەریکی کرد بۆ بەری پیران. سەید حەسەنی قورەیشی لە جیانە ماینیکی زور چاکی دابوو بە بابم و بە سواری هاتەوە. من گیانیکی تازەم هاتەوە بەر. بە سواری دەگەرام و کوریکی ٥١ سالەی کوک و پوشتە بووم. هانوو چوّی شیخ جەلال و چەقەی ئیدارەکان فیری کرد بووم بە گژ ژاندارم دا بچم.
شیخ جەلال لە وریا کردنەوەی خەلك دا دەوریکی گرنگی هەبوو. خەلکی فیری بەربەرەکانی دەکرد. لە سەر خەلك وەدەنگ دەهات. دەربەند تاقە گوندیك بوو لە سەردەمی حکومەتی رەشی رەزاخان دا ژاندارم رووی تیّ نەدەکرد. ئەگەر لە کوندی دەربەند کاریکیان هەبایە لە دوور بانگی کویخایان دەکرد و دەرویشتن.
لە بیرمە جاریك ژاندارم ئیختاریەی عەدلیەی بۆ هینا بووین. پاش ئەوە نان و چای خوارد گوتی: "ئەو قولەرادەم دەیە تابروم".
ــ قەوقولەرادەی چی؟.
ــ چوّن ئیختاریەم بۆ هیناوی. خۆ نوکەری تونیم
ــ نوکەری دەولەتی. نەت هینا بایە
ــ وانیە ئەندی شتیکم بدەیەی
ــ کتیبی قانوون لە سەر تاقە بوو. هینامە خوار و گوتم ئەوە قانوون مافی هیچت نیە و هیچیشت نادەمیّ.
ــ دەبرو لەعنەت لە بابی قانوون دانەر. نانی ئیمەی بریوە. هەستا و رویشت.

سەید حەمەدەمینی ئەندازە

هاوین کاکم فەعلەیی دەکرد و من و خوشکەکانیشم خەریکی بژارو بەخێو کردنی توتن بووین. ئیوارەیەك دەرنگ سواریك لە بەر دەرگا دابەزی. مەلاخمان لیّ وەرگرت. بەخیر هاتنمان کرد و هاتە ژوور. کوتی مالم لە نەغەدەیە و دەرنگ بوو لامدا ئەوکوتی: "من پوستی نیوان شنۆ ونەغەدە و خانیّ و نەغەدەم بە ئیجارە کرتوە. دەوڵەمی چاکم هەن. خۆشم ولاخ بۆ دەولەت دەکرم. پیّشم دەلیّن سەید ئەندازە. چونکە بەژن و بالام راست ئەندازەی دەولەتە بۆ ئەسپ کرین. بەیانی بە باوکمی کوت: "ئەو کورانەی تو چی دەکەن؟.
ــ یەکیان فەعلەیی دەکا. ئەومشیان بیکارە. خەریکی توتن و هاتوو چوّی شارو بازارە.

سەید گوتی : "ئەوکورەت بۆ بیکار بێ . با حەوتوی دوو جار لە جیاتی من سوار بێ و پوست بەرێتە خانێ . بەیانی بێتە نغەدە . پوستی بۆ وەر دەگرم . ولاخی بۆ زین دەکەم . سوار بێ بچیتە خانێ . شەو لەوێ دەبێ و بەیانی پوست وەر ـ دەگرێ و بۆنیوە رو دێتەوە نغەدە . شەوێش بێتەوە مالی خوتان . مانگی ١٦ تمەنی دەدەمێ . ". نازانم ئەودەم حقوقی سەید چەند بوو بەلام ١٦ تمەن بو ئێمە زور بوو . بابم گوتی : " ئەگەر بتوانی و لە خۆرادەبینی زور باشە یلە بێ ".
من کە باسی خانی هاتە گوڕێ . مالی حاجیاغام و بیر هاتەوە . گوتم : " بۆ ناتوانم زور باش دەتوانم ". لە گەل سەید رێك کەوتین و روژی چوار شەمو زوو چوومە نغەدە . لەگەل سەید چوومە ئیدارەی پوست و تەلگراف . سەید پوستی وەرگرت و ـ خستیە نێو خورجینێك و ئەسپێکی باشی بۆ زین کردم و بەرەوخانی کەوتمە رێ . لە رێگا بەشی زور هەر بە غار دەرویشتم . زوو گەیشتمە خانێ . بارگینم بەستەوە و چووم لە ئیدارە پوستم تحویل دا و بە پەلە خوم گەیاندە مالی حاجیاغا . حاجیاغا لە بەر راو و روت وە مال نەدەکوتەوە . کەوەزوور کەوتم راست بووە و فاتم خوی دەئاسیز هاویشتم گوتی : " هەر دەلێی بۆن دەکەی کە حاجیاغا لەمال نیە ".
ـ بە راستی لە مال نیە؟ لە کوێیە؟ .
ـ ئەورو بۆ نیومەنگوران رویشتوە .
ئەسپەکەم هینا لە جیگای بارگینی حاجیاغا بەستەوە و شەو لە لای فاتم بووم و بەیانی لە پوستخانە پوستم وەرگرت و نیوەرو زووتر گەیشتمەوە نغەدە . ئێواری چوومە وە مالی بەدایکم گوت شەولەمالی حاجیاغا بووم . دایکم بە بابمی گوتبوو . باوکم لێم تورە بوو . لێی قەدەغە کردم کە بچمە مالی حاجیاغا . ئیتر تاسالی ١٣٢٨ چاوم بە فاتمی نەکەوتەوە . ئەوجار کە دەچوومە خانی شەو دەچوومە مالی پورم لە گوندیکی نیزیك خانی . مانگیك بوو پوستم دەبرد روژیك سەید حەمەدەمین گوتی :
" نیوەرو بچین لەمالی ئێمەنان بخوێن . سەید پیاوێکی بە سالا چووبوو . تەمەنی خۆی لە ٦٠ دەدا . دووکور وسێ کچی هەبوون . دایکی منالان مرد بوو . ژنێکی لەماروگەنجی ئازربایجانی هینا بوو . تازە تەمەنی لە ٢٠ تێ دەپەری .
لەگەل سەید چوومەوە مالی . دیار بوو ژنەکە دەیویست بچێتە دە چاوی مروڤ . نانێکی باشی سازکرد بوو نانمان خوارد . ووەدەرکەوتین .

سەید حەمەدەمین دەستی گرتم وگوتی : "تۆ کوڕێکی باشی . زیرەکی . ئەگەر بزانی دوارۆژێکی باشت دەبێ . من دەتوانم پێشنیار بکەم لە ئیدارەی پۆست وتێلگراف بە ڕەسمی دات مەزرێنم. لە کوڵ ژیانی گوندی دەبیەوە. ئەگەر بە قسەی من بکەی.

ــ لە خوام دەوێ. ئەگەر کارێکی وابکەی پێم خۆشە. باوکیشم ڕازی دەبێ.

ــ من کارێک بە تۆ هەیە. بڕوات پێ دەکەم و دڵنیام لای کەس باسی ناکەی. هەر لە بەینی خۆم وخۆت دەبێ. بە قازانجتە.

ــ فەرموو. باسی ناکەم. پێم بڵێ بزانم چییە ؟.

ــ نا دەزانم بە قازانجتە. ڕاستی ئەوەیە من قەڕە لە منالەکانم نارازیم. خوێڕین. ئەوەی بچوکیان حیز بوە. ئەو ژنەتیوەم هێناوە. گەلێک پاک و خاوێنە، کابانە نان و چێشتی بەتام و چێژ سازدەکا. بەڵام جحێلە. منیش پیر بووم پێم داناکەوێ. لە بەر پاک و خاوێنی و ڕەحمەتی خۆم دەستم بۆ لێ هەڵناگیرێ. تۆم بۆ لە هەموو کەس ئەمین ترە. لەگەڵ خۆم دەتبەمەوە. هاتوو چووی ماڵی بکە. نهێنی لەگەڵ خوێن کە. منداڵەکان وەماڵ ناکەونەوە. قاتێ کچێشم تازە دەکاتێ. بۆ ئەوە نەزانێ و شك نەکا لەگەڵ ئەویش قسان بکە و دەستی بۆ بەرە. تا وا بزانێ حەز لە قاتێ دەکەی. من لیباسی جوانت بۆ دەکڕم. دەراوت دەدەمێ جار وبار دیاری بۆ بکڕە. ئەویش دەحاوێتەوە و چاوی لەولا ولا نابێ ومنیش ژیانەکەم لێ تێك ناچێ. خێرت دەکاتێ .".

سەید بە پیاوێکی بە دین و قورعان خوێن ناسرا بوو. جومعە و جەماعەتی نەدەچوو. سبەینان لە سەر بەرماڵ قورعانی دەخوێند. کاتێك قسەکانی تەواو بوون بێ ئەوە بیر لە قازانج و زیان بکەمەوە وشەی کەسوادیم وەبیر هاتەوە. سەیدەم لە پێش چاو کەوت. هەر چەند ئەدەم سەرمزای نوێژ و ڕۆژوو پاك نەبووم و کەمتر لە خەراپە دەپرینگامەوە. قسەکانی سەید بێزاری کردم جوابم نەداوە و ڕۆیشتم. ئیتر نەچوومەوە لای سەید.

پاییز توتنەکەمان شکاندەوە و بۆ فرۆشتن ئامادە کرا. لەبەر ئەوە زەویەکە جێ ـ وینجە و گڵە ڕەش بوو، توتنەکەمان زۆر ناحەز بوو بەتەما نەبووین هیچی لێ پەیدا بێ. شانسی ئیمە کارناسەکانی توتن کە توتنی سندوسیان دەقەبلاند، سەید عەولای سەییدی و میرزا مستەفای کەریمی خەڵکی سابلاخ بوون. بابم لە کۆنەوە دەیناسین و لەگەڵیان ئاشنا بوو. ڕۆژێك نامەیەکی بۆ نووسین و قاپێك ماستی گامێش و ڕۆنی کەرەم

بـۆ بردن و چـوونـه مزلەکیان. کە نامـەکەیان خـوێندەوە بەخێر هاتنیان کـرد م و لە باوکمیان پرسی و گوتیان . "کە توتنەکەت هێنا دوخانیە خـوێنت وەرە و پێمان بلێ".

پایز ئێمەش لەگەل خـەلکی گوندی توتنمان برد ە دوخانیە. غولام رەزاخانی ئاغای گورناوی خـوێ ـ ندوقداری دوخانیە بـوو. هات سەری توتنەکانـی کردەوە. کاتێك هاتە سەر تا توتنـی ئێمە گوتـی . "توتنەکەت زور ناحـەزە چـی لێ بکەین؟".

ــ خان قـەی ناکا. زەویەکەمان خەراپ بوو.

ــ بە تەیمورئاغا دەلێم زەوی چاکتان بدەاتـی

کاتێك کارناسەکان هاتن وگەیشتنە سەر توتنی ئێمە دەستیان لە دەستی نام و گوتیان :

ــ ئـەم تایـە بە دەرمجـە یەك بنووسە .

غولام رەزاخان واقـی ورما. گوتی . "ئەوانە تۆلە کوێ دەناسن؟ . بـۆ لە پێشدا نەت گوت تا توتنەکان گشت بکەمـە هی تو؟ .

پاش چـەند روژ کە چوین دراوی توتن وەر بگرین غولام رەزاخان گوتـی . "هیچ لە تو ـ ناستێنم. هـەولێن بەر و بووی کاسبی و رەنجـی دەست وشانـی خـۆمان وەردەگرت.

ژیانێکی ئاسودە و تێر و تەسەلمان دەستی کرد بوو. دوو گامێشمان هـەبوون هـەر دووك شیریان دەدا. دوو کەلیچەمان هـەبوون بۆ بەهاری بەر نیر دەبوون و دەبـوایە جـوتیان پـێ بکەین. پایز بە هـەرموز زەویەکەیان بـوداچاندین. سارد ی پایـزو زستان کارمان نەبوو. دەبوایە بچینە مـزگەوت و نوێژان بکەین. زستان بە سواری چـوونە سابلاخ بو سەردانـی شکایەتەکەمان. لەویوە چـوونە گوندی (قـەرەبلاخ) . مالە مام لە وی بوو. تێزیکە . ٤ سال بوو لێیان بێ خـەبەر بووین. مامێکی دیکەم عـەمری خوای کرد بوو سێ کوری لەپاش بە جـێ مابوون. دایکیشیان مرد بوو. ئەنکم لە پەنا ئەومامەم بە خێوی دەکردن. باوکم لە بەر دەست کورتـی نەیتوانیبوو ئاوریان وێدا. چـەند روژ لە مالـی مام بـووم. پاش ٤ سال بە یەکتر شاد و شوکر دەبووین. هـەستی خزمات ـ یەتـی زیندوو دەبـووە. رێگا بـۆهاتو چـۆ دەکراوە. پاش دووسی روژ سەفـەرێکی خوش بـۆگورناوی گەراسەوە.

گورناوی لە سایەی تیکوشانـی باوکم بـبوە گوندێکی خاوەن مـزگەوت و بانگ و حـومعە و جـەماعـەت. ئێوارەیکی فرە سارد ی زستان .کابرایەك بە ناوی عـەلی پیروت لە سەر بانـی مـزگەوت بانگی ئێواتـی دەدا. لە نیوەی بانگ دابوو لەپـر بانگـی بـڕی و خـۆی لە سەر بانی مـزگەوت فـرێ دا خـوار. خـۆی لە مـزگەوت هاویشت و

هاواری کرد : " ژاندارم هاتن. " . خەلك ژلەژان . سەرمای زستان هەموو پیچ و کلاویان لە سەر بوو. جلی کوردیان لە بەر دابوو. ( لەسەر دەمی حکومەتی رەشی رەزا شادا جلی کوردی و پیچ وشەدە لە تریاك قاچاختر بوو. ژاندارم شاقەلی مەلایانیان بریبوو. پیچ و شەدەیان سووتاند بوون . نیفەکی خەلکیان بریبوو. هەزاران کورد بە تاوانی جلی کوردی لە حەپسخانەی عەجەمان دابوون. ) خەلك دەترسان کە ژاندارم لە مزگەوت وەژوور کەوێ و سوکایەتی بە خەلك بکا. کاتیك عەلی پیرۆتی خۆی دەمژووری کوتاوە ژاندارم دەبینێ و راستدێتە دەرکی مزگەوت. بە سواری راوەستا و دەستی کرد بە هەرا. کەس نەیزووت. من وەدەر کەوتم و بەفارسی گوتم :

ــ ئیرە مزگەوتە. خەلك نوێژ دەکا. چیت دەوێ؟ .

ــ مالە کوێخا لە کوێیە؟ کوێخام دەوێ

ــ کوێخا مالی لە چیانەیە. ئیرە کوێخای لێ نیە

ــ با ئەوخەلکە بێنە دەر بزانم

ــ خەلك نوێژ دەکا و نایەتە دەر. کارت بەکێیە بلی بزانم .

ــ یەکیك بێ ئەسپەکەم تاقەت کا و میوانی بم

ــ نەغەدە هیندە دوور نیە و کەسیش میوان راناگری . لیرە کاروانسەرا نیە

ــ تۆ ناوت چیە؟

ــ کارت بەناوی من نەدابێ . ئیرە ملکی بەخشندارە. گیر مەبە دەرتك دەبێ .

ژاندارم رکیفی لێدا و من چووەوە ژوور . بە سەر خەلکەکە داهاتم و گوتم : ژاندارم لە خوێریەتی خەلك کەلك وەر دەگری . یەك نەهاتە دەر بزانێ ژاندارم چی دەوێ و من چی پێ دەلێم.

## بەلایەکی داخدار و پشت شکێن

قەلەك جە بەختم مەکەس مەکیانو ـــ وەراکەی رەحمەت دەیمان مەریانو

تازە دەهات تووشی ئاسوودەیی و ژیانێکی خۆش بین، بەلایەکی گەورەمان بە سەر دا هات و بە هیچ چاری نە کرا . کاکم تووشی نەخۆشی غێ داری بوو. ئیستاش لام وایە نۆ ژو رۆژو تاعەت و مات بوون لە سەر بەرمال و پاشانیش سوفیەیی لە هەرەتی لاوینی دا تووشی ئەم نەخۆشیەی کرد بوو. یەکجار بەدین و پاك بوو. هەمیشە دەست بە دەستنوێژ و لەسەر بەرمال بوو. هیندە زۆر سوفی خەلکی ئالیاوی و کورناوی لێ

کـو دەبوونەوە کۆڕی ختم و تەهلیلەیان دەبەست. بابم مـریدی (شیخ حسامـەدینی هـەورامانـی) بوو. سوفیەکـی لەرادە بەدەر موسلمان و بەدین. ئیمەشی وا عاملاند بو کتیبیکمان هـەبوو بەناوی (سراج الطالبین) گشتی مناقب و تعریفی شیخی حسامەدین و سراجـەدینبوو. ئەوەندەمان خـوێند بووە لام وابوو خوای تعالا بـێ ئیزنـی حەـزرەتـی شیخ ناتوانـی قامك لە ئاوراکا. بە تایبەت کە دەمان بینی چـەند مـەلای زانا ە ناوچـەی سنە وس و شارویران مریدی تەوێڵەن و هـەموو سال دەچنە خزمـەت شیخ و هاتوو چـوی مالـی ئیمە دەکەن و ویردی زمانیان تعریفی شیخە. بابم هـەتا لـە قزلجە و بـەیرەم بووین لە گەل ئاغاکان دەچـوە شارەزوور و لەمالـی شیخ ورتکە نان و ـ ئاردە تووی دە هینا و بۆ دەرمان دەمانخوارد. پێمان وابوو رزقـی دنیاو ئیشووی ـ قیامـەت بە دەست شیخی حسامـەدینە.

کاکم دوور بە دوور شیتوشمەیدای شیخ بـبوو لەم سوفیگەریەدا تووشی نەخـۆشی بوو. مـەلا و زرە سوفـی گوتیان بچێتە تەوێڵە چاك دەبیتەوە. سوفـی زەمبیلی بە چلەی زستان سازیانکرد بییەنە زەمبیل تا حـەزرەتی (سەید) دوعای بـۆ بنووسی.
کاکم کە ندەگەیشتە تەوێڵە، رەگەل سوفیانکەوت بۆ زەمبیل. شەوی دەچـنە (کوسە کەریز) لە مـزگەوت دەچنەختم و تەهلیلە. حاجـی مارفاغای کوسە کەریز دەپرسی ئەم کورە کی یە دەلێن کوری میرزا حامیدە. دەچێتە زەمبیل. بانگی دەکا و دەلـی. "بابت مریدی حـەزرەتی شیخە و تو چـون دەچیە زەمبیل؟. نابـی بچی. بەهار لەگەل خـۆم بـۆ تەوێڵەت دەبـەم. کاکم گەراوە. گرتەوەی حاجـی مارفاغا ناکوکی و ناتەبایـی زەمبیل و تەوێڵەی لە سـەر رووناند ئەوەی فـەقیر و هـەزاری کورد نیشان دەدا. سەیدی زەمبیل کە لە پیشدا خـەلیفەی تەوێڵە بوو ئیستا بۆ رااوورووت سەر بەخـۆیـی راگە یاند بوو بەشی تەوێڵەی نەدەدا.

کاکم گەرایەوە بەلام تادەهات نەخـۆشیەکەی توندتر دەبوو. لە نەوروزدا خـەلکی کوندی کۆبوونەوە و جیژنانەیان سازکرد و لە چیانە بەماڵە ئاغاوە چـوون. منیش لە گەلیان چـووم و کـەللە قـەندیکم برد. گەیشتینە چیانە. بردیانینە ژوریکی گەورە و دیاریەکا ـ نیان وەرگرت و هـەر یەکە ناوی خاوەنەکەیان لەسەر نووسی. زور پـێ نەچـوو غولام ـ رەزاخان لەگەل خانم هات. بەخیر هاتنی کردین و لەکار و کاسبی هـەمـوانـی پرسی پاشانخانم گوتـی. "ئـەو کورە ناناسم".

غولام رەزاخان گوتی : "کوری مەلایە. خوێندەوارە. لەگەڵ کارنامەکانی توتن ئاشنایە". خانم گوتی : "تۆ بۆ دیاریت هیناوە . هیچ کاسبیتان کردوە؟ .
ـ زەویەکیان بە هەرەوەز بۆ داچاندووین . بەلام دەمانەوی زەوی دیکەمان بدەنێ وەک رەعیەتەکانی دیکە جوتی دەکەین. دوو کەلیچەمان هەن بەر نیر بوون و ئەو ساڵ ـ فێرە جوت دەبن .
غولام رەزاخان گوتی : گورناوی ملکی خانمە. دەبێ ئەو بلێ .
ـ بە تەیمورئاغا دەلێم وەک جوتبەندەیەک زەویتان بداتێ . ئەو ساڵ ملکانە و دەودوو مەدەن . بەلام ساڵیکی دیکە وەک رەعیەتەکان دەو دوو بدەن . لە بیگار تەرخان بن و بیگار مەکەن .
پاش ئەو قسانە غولام رەزاخان گوتی : " ئەگەر کەلیچەکان جووت ناکەن لە خانم بەرن! رەعیەتەکان دەستیان کرد بە پیکەنین. خانم گوتی : " ئەوە چ بوو. دەستە گوڵت بەئاو دادا پێت پێدەکەنن . ".
ـ مەبەستم کەلی جوتیە .
سبانە لە سەری سەرۆ. بە تەیمورئاغا بلێ هەموو شتیکیان بداتێ . پاشان گوتی : " وەرە با بچینە ژوور. لە گەل منالەکان یاری بکە . کیژێک و سێ کوری هەبوون. بە منالەکانی ناساندم. گوتی : " وەرە لە مەدرەسە بخوینە . دەتوانی لێرە لە مالی ئیمە بی . لەو کاتەدا کویخاکەیان هات . بە کویخای گوت : " وەک جوتبەندەکان زەوی بدە بە مالی مەلا . بیگاریان پێ مەکە. ئەو ساڵ ملکانەیان لێ مەستینە . ".
تەیمورئاغا گوتی کەلی جوتیان نیە .
ـ با بین جوتە کەلیکی من بەرن جوتی پێ بکەن .

پاش چەند رۆژ تەیمورئاغا هاتە گورناوی. لەگەل خۆی بۆ سەرزای بردین . بەشی گەنم و توتن و چەلتوک و جێ وینجە زەوی بۆ نیشان داین. بابم نیرو ئامووری هەلبەست و رۆژانە کەلیچەکانمان فیر دەکرد. من وەپیشیان دەکەوتم و کاکم جوتی پێ دەکردن. بەهار وینجەمان چاند وجێ چەلتوکمان هەلبەست و زەویەکانمان کردە شێوەرد و ئیتر جوتبەندیکی تەواو بووین .
بنەهاز ئامۆزاکانیشمان هینانەوە کن خۆ. ئەوانیش لە کاسبی وجوت وکاددا راهاتبوو ن

رزگاری لە عەدلیەو مصالحەت کردن

پاش بینەوبەرەو چەند جار دادگا کویخا صەرمز بە ٦٠٠ تمەن پول و موخارجی دادگا محکوم بوو. حاجی مەلا عەولای سەلاح زادە و مەلا حەمەدەمین بورهان زوریان یارمەتی داین . کویخا ن لە گەل ئەو کوردانەی کە زەمانی پەهلەوی گیران و دوور خرانەوە کەوتە زیندانی ورمێ و لە زیندان دا مرد . پێش مردنی کویخا برازاکانی هاتنە مالێ و بەتکای فەقێ ئەحمەد و ناسیاری دیکە بە چوار سەد تمەن مصالحەتمان کرد و دەوسیەکمان بەست . لە گیرە و کێشەی ئیدارەکانی دەولەتیش نەجاتمان بوو .

هاتوو چووی شارەکان و دیتنی قوتابخانە و ناسیاری لەگەل خەلکی شارهانی دام کە لە مەدرەسە بخوێنم . بە تایبەت خانی غولام رەزاخان گوتبووی لە چیانە بە و لە گەل منالەکانی ئێمە بمێنەوە خوّم لەخوێندن خوێنکرد . روژێک لە نەغەدە دەچومەوە لام دا چیانە و چومە مەدرەسە . مودیری مەدرەسە کابرایە کی قەرە پەپاخ بوو بە ناوی ( پاشا فەیزی) . کوردی نەدەزانی و بە ترکی قسەی دەکرد چومە لای و داوام لی کرد کە لە کلاسی شەش قبولم بکا . منالەکانی غولا مرەزا خانیش هاتن و گوتیان خانم پێی گوتوە لێرە بخوێنی و لەگەلمێیە دەبێ .

پاشا گوتی : " بابت نامەیەک بنوسی . دوایە وەرە ئیمتحان بدە . ئەگەر دەرچووی وەرت دەگرم . "

چومەوە مال و بە بابم گوت. زوری پێ خوشبوو. کاکم گوتی : " کارمان بە تو نیە و بچوو بخوێنە . بابم نامەیەکی بو مودیر نووسی و بەیانی نامەم هەلگرت و چومەوە چیانە . نامەکەم دا بە مودیر گوتی : " بانە ئیمتحانت دەکەم . "

ئەز لە ئیمتحان نەدەترسام . لەنووسین و خوێندنەوەی فارسی راهاتبووم و لە سەر هیچ دانەدەمام . لە پێشدا بە زمان هێندێ شتی لی پرسیم وەلامم داوە . مانای شیعرێکی لی پرسیەوە گورج مانام لێ داوە . شیعرێکی پێ خوێندمەوە رانمەوە ستام . نوسین دەست پێکرا . مودیر خوی قەرە پەپاخ بوو فارسی بە زاراوی ترکی دەگوت . منیش فارسیم بە زاراوی مەلایان و کوردی دەزانی .

گوتی : " بنویسە "کتود" . مەبەستی " قعود" بوو . من " کتود " م نووسی .

ـ بنووسە "گەریب". مەبەستی "غەریب" بوو. من نووسیم "گەریب". چەند وشەی ئاوای بێ گوتم ئەگەر بەفارسی کتیبی بێ گوتبام ئەوانە بو من هاسان بوون. بەلام هیچم راست نە نووسیبوون.

مود بر گوتی ناتوانی بچیە کلاسی شەش، لە کلاسی چوار قبولت دەکەم.
زانیاری من ئەودەم لە کلاسی شەش زیاتر بوو. بەلام زاراوی ترکی و ئەدوان بە زمانی زکماك هەناسمارد و لە خوێندن بێ بەشی کردم. هەر ئەودەم هەستم بە ستەمی نەتەوایەتی کرد. ئەوکابرا ترکە بە ناهەق لە خوێندن بێ بەشی کردم.
پاشان بێیان گوتم مەینکیکت بۆ برد بایە لەکلاسی دەمنی دادەناێ. چارە نووسی کورد هەر ئەوە بوو، نە هیلن بەزمانی خۆی بخوێنێ و بە زمانی بیگانەش ئەمنێ بەرتیل بدا تا رێگای قوتابخانەی بەدەن. بە هەمناسە ساردی گەرامەوە و لە مالێ هەر بو خۆ خەریکی خوێندنەوە و نووسین دەبووم.

سالی ۱۳۱۹ بوو حکومەتی رەشی رەزاخان لە کوردستان دەستی کرد بە راونان و گرتن و دوور خستنەوەی خەلك. لەسەرانسەری کوردستان ئەوکەسانەی توزیك نیوبانگیان هەبایە و ناسراو بان و یا ژیانیان خوشبایە، دەیانگرتن و بو شیراز وشارەکانی دیکەی خوارووی ئیران دووریان دەخستنەوە. ریژیمی رەزاخان قاچاخچیەتی کردبوە بیانووی گرتنی خەلك. بەلام لە راستی دا بە هوی هاتووچووی خەلکەوە بو کوردستانی گەرمێن هەستی نەتەوایەتی دەهات گەشەی دەکرد و حکومەتی رەزاشای خستبوە سەترسیەوە. پیش ئەوە ئەم هەستە تەشەنا بکا و ببێتە هیز، دەستیان کرد بە گرتن و دوور خستنەوەی کوردەکان. ژاندارمێك جوجە خوری بێ هەموو شت بە دەستەلاتیکی تەواوە کرا بوو بە سەمووری گرتن و ئەشکنجە وئازار و رووتاندنەوەی خەلك و لەکوردستان ئاگری کرد بووە. چەند سالیاش ئەوکارەساتە جنایەت وتاوانی (بەوربەو) لەسەر زار و زمانان بوو ولە بیر خەلك نەدەچووە.

لە ناوچەی شنوو سندوس هەوەلین گوند یکی کەوتە بەر پەلاماری ژاندارم (دەربەنە) شیخ جەلال بوو. نیزیکەی ٥٠ کەسیان لەمکوندە گرت و مانگیك لە نەغەدە ئەشکنجە و ئازاریان دەدان. پاش ئەستاندنی چەند هەزار تمن بردیانن بو ورمی.
خەلك بە جاریك نەترەی چوو بوو. ژاندارم ئاگریان کرد بوە. چەند روژیك بوو خەلکی دەربەندیان بۆ ورمێ برد بوو حاجی مەلاخالیدی و محیدی لەدوای نامەی نامەی بو بابم نوسیبوو کە بچە دەربەند. بابم فەرمووی بچو بزانە حاجی مەلا

کاری چییە. کاتێک چووینە دەربەند لەگەڵ حاجی مەلاخالید چووینە ماڵی شێخ جەلال. خزم وکەسی گیراوەکان گشتیان لەوێ بوون. حاجی مەلا فەرمووی بە هەموان هاتووینە سەر ئەم بڕیارە کە تۆ بچییە ورمێ. لە گیراوەکان بێ خەبەرین. بزانە چیان لێ هاتوە و چیان پێ گوتوون."

گوتم: "بۆ هەموو خزمەتێک ئامادەم. ئەگەر بنێری بابیشم ئاگادار بکەی". نامەیەکی بۆ بابم نووسی و سوارێکیان نارده گورناوێ. باوکم لە وەڵام دا نووسیبوویەوە: "دەستەڵات بە دەستخۆتە و کوڕی خۆتانە".

بەیانی ئەمی شێخ جەلالیان بۆ زینکردم و پڕی خورجێنێک کولێرە ناسکە و ڕۆن ماستوهەنگوینیان لەولاخێکی دیکە ناو دەوریاویان ڕەگەڵ خستم کە لە دەزەی دەولی ولاخەکان بێننەوە. لای ئێوارە لە دەزە سواری ماشین بووم وشەو چووینە ورمێ. بەیانی چووینە زیندانی شارەوانی. بەڵام لەرزوتایەک دایگرتبووم وفرە نەخۆش بووم. لە زیندان داوای شێخ جەلالم کرد. لەگەڵ چەند کەسی دەربەندی هێنایانن. کەچاوی پێیم کەوت ماچی کردم. گوتی "کوڕ دەمێ ئاوا شیاو بێ و چاکەی لە بیر نەچێتەوە. نامە و پول و شتەکانم دایە. گوتی: "وادیارە نەساخی. بچو لای حەکیم و بەیانی وەرە وەڵامی نامەکان دەنووسینەوە.

لە زیندان هاتمە دەر. چوومە لای دوکتور. پاش چاولێکردن گوتی: "زۆر نەخۆشی. دەبێ بچیە خەستەخانە. ئەگەر پوولت هەیە تا بتنێرم لە نەخۆشخانە بکەوی".

ناتوانم. دەبێ بچمەوە سندوس. دەرمانم بۆ بنووسە و دەڕۆمەوە. هەرشەو ڕۆژە چوومەوە لای شێخ جەلال وگوتم زۆر نەخۆشم و خۆم ڕاناگرم. نامەم لە گیراوەکان وەرگرت و سواری ماشین بووم بەرو نەغەدە. شەو درەنگانێک گەیشتمەوە نەغەدە و چوومە ماڵی مەلا حەمەدەمینی بورهانی. ئیتر بەیانی نازانم چۆنیان بردبوومەوە گورناوێ. نەخۆشییەکەم زۆر توند بوو. مانگێک لە سەر ڕەقس پشت کەوتم. دەیان گوت (کەوتوویی یە). سەرم دەسووڕا و دنیا لە پێش چاوم ئاوەژوو دەبوو.

## دەرمانی دەردان

باجە مەنیج کچی بابە سمایلی برای ئەمین الاسلام لە شێخەکانی عەوساباد

لە گەل برایەکی مالی هاتبوە چیانەی سنەوس و بۆ خۆی دەزگا و دەبدەبەیەکی ساز کرد بوو. هیندی مرید و دەرویش باوکی خزمەتیان دەکرد و دەباری و شتیان بۆ دەهێنا. هەر لەو کاتەش دا دەستی حەکیمایەتی هەبوو. مالەکەی هەمیشە پربوو لە نەخوشی پیستی و شیت و نەخوشی دیکە. ژنیکی تیگەیشتوو، نەجیب بە ریز و هەر لەو کاتەش دا جوان و شوخ بوو. باجە مەنیج کونە ژنی شیخ حەمەنسی غەوساباد بوو. شیخ تەلاقی دابوو بەلام سالی یەک دوو جاریش دەهات سەری دەدا.

کە نەخوشیەکەی من توند بوو دەرویش و دراوسی گوتبوویان دەچین باجە مەنیج دێنین. بابم لە تاوی من نارد بووی لە دوای. دەرویش ئەحمەدی خالندی سواری عارەبەی کرد بوو هینا بووی. من ئاگام لەوە نەبوو کەی لە دوایان ناردوە و کەی هاتوە. بەلام لە بیرمە کە چاوم هەلهینا ژنیکی جوان لە تەنیشتم دانیشتبوو دەستی بە سکی دادینام. نەم ناسی. گوتی: " ئەوە بو هەلناستی؟ من لەبەر تو هاتووم. تو چاک بوویەوە." راستی دەکرد چاک ببومەوە. هەستم بە سوکیەک دەکرد. لام وایە سی روژان لە مالی ئیمە بوو. لە بن سەرم ئەدەبزوت. بە قسەی خوش و گالتە وقسەی دەهینام. کاتیک دەرویشت گوتی: "ئیتر من بووم بە شیخی تو کە هەستایەوە دەبی سەرم بدەی. لە بیرت نەچی." دایکم گوتی " خوا دەکا چا دەبینەوە هەر دەید ەم بە تو". من زیندوو بومەوە. پاشان تا سالەکانی ١٣٣١ لەگەل باجە مەنیج نیوانم خوش بوو هاتوو چوم دەکرد و بانگیشتنم دەکرد و ئیحتیرامیک زوری بو قایل بووم. بیجگە لە هیمەت و بەرەکەت و پەنجە نەرم و شلەکانی باجە مەنیج بیگومان دەرمانیکی دیکەش لە چابوونەوەم دا کاریگەر بوو. ئیمە پیاوان گوتبوویان حەیران و گورانی و بلویر بوکەوتوویی باشە و میشکی دێنیتەوە سەرخو. نارد بوویان لە دەربەند سوفی رەحمان مەجرومیان هینا بوو. سوفی رەحمان بو گوتنی حەیران و پایزە و ئاریزە و گولی و ئایشە گول نیو بانگی هەبوو. سوفی رەحمان حەوتویەک لە بن سەرم دانیشت و ئەم بەیت و گورانیە فولکلوریانەی بو دەگوتم. لەو دەمە و ئەوینداری گورانیە فولکلوریەکانم و زوریشم نووسیونەوە و لە بەریشم کردوون. بەداخەوە لە بەر دەنگناخوشی ناتوانم بیان بیژم.

دوای هەستانەوەم یەک دوو جار چومە دەربەند و سەری مالە شیخ جەلالم دەدا. چەند جار دەچومە ورمی و شتومەک و خواردنم بو گیراوەکان دەبرد.

خانمی شیخ جەلال زور جار لە دوای دەناردم و هەستم دەکرد کاریکی ئەوتوی نیە. باسی خیزانی گیراوەکانی دەکرد و باسەکەی دەهینا سەر بەرپچوونی ئەو ژنانە کە میرد ـ یان گیرا بوون. کابرایەکی دەولەمەند ' ە گوندی دیشمس گیرابوو. جاریك خانم گوتی ـ دەلین ژنەکەی حەزلی کردن دەکا. پاشان بی ئەوە چاوەروانی وەلامی من بی گوتی : " ئەدی چبکا؟ . ژنی جوان و جحیل چون دەحاویتەوە؟ ".
من تەواو هەستم بەوە کرد بوو کە هەستان و دانیشتن و شیوە قسە کردن و خو لی نیزیك کردنەوەی ئاکاریکی ئاسایی نیە. منیش جاروبار قسیکی جەفەنگ و قوڕم دەکرد و خانم ( هەتیوە) یەکی پی دەگوتم. بەلام سەبارەت بە ریز و ئیحترامیك کە بو شیخ جەلال قایل بووم قەت لەوەم تیی نەدەپەراند.

پاسەوانی حکومەتی رەزاشا

هاوینی ئە هەمەرەوەز شکارتەکەیان بو دروینەوە و گیرە و کیشەمان کرد و یازدە ـ باری گەنم لیی پەیدا بوو. توتنەکەشمان لە سالی رابردوو گەلیك باشتر بوو. دوو خەروار چەلتوکمان پی براببوو. ژیانیکی تیر و پر و ئاسودە دەستی پی کرد بوو. بەلام نەخوشی کاکم ژیانی لی تال کرد بووین. پاییزی دوای ئەوە کە لە جوتی پاییز و زەوی چاندن و خەلە و خەرمان بووینەوە بریارمان دا لەگەل کاکم بچینە ورمی لای دوکتور و نتوەکی مالیش لە ورمی بکرین. پارەیەکمان هەلگرت و بە پی یان ـ بو ورمی کەوتینە ری. بەدوورژان گەیشتینە دەروازەی شار. پاسەوانی دەروازە بانگی کردین و داوای پیناسی لی کردین. کاتیك پیناسەکانی چاو لیکرد گوتی :
ـ هەی هەی. خو ئیوە مەشمولن. لە ترسان سواری ماشین نەبوون. ئیستا دەتوەم بو سەربازخانە.
ـ مەشمولی کاری تو نیە. ئیدارەی سەربازگیری هەیە و ئەگەر مەشمول بین ئەو دەزانی.
پاسەوانیکی دیکە گوتی : " قسە قیرن لی یان گەری. تمەنیکی بدەنی و بڕون.
ـ هیچی نادەینی. چمان کردوە؟ بو پولی بدەین ؟ .
ـ بو شارەوانیتان دەبا. وەك ئومەرخان و شیخ جەلال لە زیندان دا دەرزن.
کابرای پاسەوان وەپیش خوی داین و لە ریگا گوتی : " ئیوە قسە قیرن با تووشی زەحمەت نەبن. پینج قرانم بدەنی و برۆن.

ــ هیچت نادەینێ . دەچینە شارەوانێ

هێندێکی دیکە ڕۆیشتین و کابرا دەستی پێ کرد :

ــ کوڕە ئاقڵتان هەبێ . من کوردم خۆشم دەوێن . خۆشم زەحمەتکێشم . دوو قرانم بدەنێ و برۆن وەدوای کاری خۆتان کەون .

کاکم گوتی جەنتەم لە دوو قران بکە و بیدەیە بابڕۆین . گوتم : " هیچی نادەمێ " .

دەروازەی شارەوانێ وەدەرکەوت . گوتی ڕاوەستن . دەڵێن کورد سەر ڕەقەن . بۆ خۆتان تووشی کێشە دەکەن ؟ قرانێکم بدەنێ با دوو چا بخۆمەوە " .

ــ هیچت نادەینێ . دەبێ بزانین تاوانمان چییە ؟ .

لەم کاتەدا پاسەوانێکی تر هات ، کابرا بانگی کرد :

ــ مەحموود تۆ کوردی دەزانی . ئەوانەم بۆ حاڵێ کە با تووشی زیندان نەبن .

ــ ئەوانە کێن بۆ کوێیان دەبەی ؟

ــ کوردی سنەوین . مەشغوولن . بگەنە شارەوانێ بەریان نادەن

مەحموود گوتی : " من دایکم کوردە . مەچینە شارەوانێ . ئەو هەموو ئاغا کوردە گیراوە . نەفەری پێنج قرانی بدەنێ و من ناهێلم بتان باتە شارەوانێ .

ــ ئەوە تۆ دەڵێی چی ؟ . خۆی بە قرانێک ڕازییە و نایدەینێ

ــ قرانێک ــ ئەک لەعنەت لە بابی . بێ شەرەف ئابڕوی ئێمەشی برد

گەیشتینە شارەوانێ . ئێمەی لە ژوورێک دانا و گوتی : " لێرە بن تا ڕەئیس دێ . نیو سەعات بێ چوو کەس دیار نەبوو . من وەدەنگ هاتم : " ئێمەت بۆ لێرە ڕاگرتووە ؟ .

ــ ڕەئیسی زیندان دوای نیوەڕۆ دێت لێتان دەپرسێ .

ئەز چەند جار چوو بوومە زیندان و سەرۆکی زیندانم دەناسی . ڕابووم و بۆلای ژووری سەرۆک چووم . خەریک بوو پێشم بگرێ . خۆم دەژووری ڕاکرد . سەرۆکی زیندان لە ژووری بوو .

ــ چیت دەوێ ؟

ــ قوربان جارێ ئەو پاسەوانە بانگکە با نەڕوا پاشان عەرزت دەکەم .

دەرکای کردەوە پاسەوان خەریک بوو ڕابکا . بانگی کرد . تەم هێشت پاسەوان هیچ بڵێ

ــ ئێمەی لە دەروازەڕا هیناوەتە ئێرە و دەڵێ مەشغوولن . داوای پێنج قران بەرتیل دەکا . ئێتر وچانی پێ نەدا . زللەیکی خۆشی دەبنی گوێی سرەواند وگوتی :

ــ ٢٤ سەعات ناچییە دەر . بە ئێمەی گوت بڕۆن .

ئێمە لە شارەواتسی دەرکەوتین و چووینە قاوەخانەی شیخ جیگامان گرت و چووینە لای دوکتور. پاش چاولیکردن دوکتور دەرمانی زوری بو نووسی . دوو روژ لە نیو شار دەرمان و شتو مەکی مالمان کری و بە ماشین گەراینەوە بو نقەدە.

لە پایزدا غولا مرزاخان ئاشیکی دروست کرد بوو جوگەی بودەکیشا. روژی بە ٣ قران فەعلەی بو دەگرت. ئیمە هەمر دوکمان تا بەفر باری دەچووینە فەعلەیی. زستان هەر وەك سالەکانی رابردوو لەمزگەوت خەریکی نویژ و جەماعەت بووین. لە مال دەنگمان هەلبەست بوو چەلتوکەکەی خوّمان کوتا و برنجیکی زوری لیّ پەیدا بوو. بەهاری سالی ١٣٢٠ ئیمە ئیتر جوتبەندیکی ئاما بووین. جێی جوتی چاك عارەبە ولاخی سواری و دووکاهین و حەوجیمان بە هیچ شتیك نەبوو. لە بەهاردا من دەچوومەوە جووال و کاکم جوتی دەکرد و شیومردی دەبری و جیّ توتنی خوشدە کرد. هاوین دەخلەکانمان گەیشتن دەبوو بیان دروینەوە. فەعلەمان وەگیر نەکەوت. چووینە سەر دروینە. کاکم سەلعفانی دەکیشا ومنیش ناچار بووم ( خورم ) هەلگرم. نیوەرو دەستمان هەلگرت کە نان بخوین. دایکم نانی بوهینا بووینە مەزرا. کە دەستمان هەلگرت من تاویك راکشام. دایکم چیشتی گەرم کردەوە و بانگی کردم کە بچین نان بخوین. هەر چەند کردم نەمتوانی هەستم. هەموو لەشم رەق بوو. دایکم و خوشکەکانم دەستیان کرد بەگریان. لەسەرجوگەی چیانە دروینەمان دەکرد. کاکم بە ئامیز هەلیگرتم و بردمی دەجوگەی هاویشتم. بریك لە ئاوی دا بووم و هاتمەوە سەر خو. بو روژەکانی تر ئیتر راهاتم و کویرە وەری دەستی کرا.

دیسان ژاندارم

ئەو سالە توتنی ئیمە کەوتبوە قەراغ ریگای سندوس شنو. روژیك لەگەل کاکم سەر چنی توتنمان دەکرد. کاکم دەسرەیەکی سپی لە سەرئالا ند بوو لەدەم ریگا خەریك بوو. ژاندارمیك بە ریگادا دەهات. گەیشتە راست کاکم و بانگی کرد. کاکم چووە لای ژاندارم گوتی : " ئەو دەسرەت بوّ لە سەر بەستوە؟ ".

ـ لەبەر ئارەقە. من لە مەزرام و دەسرە ریّ بی کەسی نەگرتوە.

ژاندارمی خوین خور تا هیزی تیدا بوو شەقە زللیکی لە کاکم دا. ئیتر من بە جاریك ئاکرم گرت. ـ ڤارم دا وگوتم : " کورە ئەوە بوّنایگری؟ . کاکم شی روهات و من گەیشتمە تفەنگەکمان لیّ ئەستاندو باشمان تیّ هەلدا. دووسیّ دراوسیّ ی توتن هاتن

نەمان دەویرا تفەنگەکەی بدەینەوە. لەو کاتەدا تەیمورئاغا پەیدا بوو. دابەزی بە هەزار تکاو رەجا ژاندارمی ئاشت کردەوە و دەووتەمنی دایە و لە گەل خۆ برد بە نیوگوند و ئیتر ژاندارمان نەدیتەوە.

لە سندوی داب وابوو کە جوتیەندەکان کلوشیان دەکیشاوە قەراخ گوند و لە نیزیك ئاوایی چیمەنیکیان بۆ گیرە وکینە وخرمان هەلاویشتن تەرخان دەکرد و هەموویان لە پەنا یەکتر خەریکی خەلەو خرمان دەبوون. کویخا ویا سەرکار لە نیو خرمانان کەپریك دەکاو لە نیزیکەوە بە سەرخرمانانەدا چاوە دیری دەکا. خەلك یارمەتی یەکتر دەدەن و لیك کۆدەبنەوە و ئاگایان لە یەکتر هەیە.

بۆ ئیمەش جیگایەکیان دیاری کرد بوو. کاوشمان کیشابووە و ویرای خەلك خەریکی جەنجەر و خرمان کۆکردنەوە بووین. بابم لە گورناوی قازی بوو نوینەری غولام رەزاخان وخرمانەکانی بۆ هەلدەگرت.

لە مانگی گەلاویژدا بوو تەیمورئاغا لە گەل دوو ژاندارم لە گوندی پەیدا بوون. خەلکی گوندیان کۆ کردەوە. ئاگادارەکیان لە بارەی هەلگیرسانی شەر لەئوروپا پی بوو. بە خەلکیان رادەگەیاند لەو کاتەدا کە شەر لە ئوروپا ساز بووە هیچ کەس بە هیچ جور هەقی نیە باسی شەر بکا. بەیاننامەکە ئەوەی دەردەخست کە گەلانی ئیران دەبی کەر و لال و لە هەموو شت بی خەبەر بن.

هەوەلی مانگی خرمانان بوو روژیك چەند فروکە لە ئاسمان پەیدا بوون و کاغەزیان بەردانەوە. کابرایەکی گوندی ئیمەش لە مەزرا یەکیکی هەلگرتبووە و هینا یەوە. لە نیو خرمانان خەلك لیی کۆبوونەوە و بانگیان کردم تا بزانم چ نووسراوە. بەیاننامەکە بە زمانی کوردی وتوو کی باسی فاشیزم و شەری دەکرد. خەریکی خوی ندنەوەی بەیاننامەکە بووم تەیمورئاغای کویخا گەیشتی و بەیاننامەکەی لە دەست وەر گرتم وکوتی "کارت بەو شتانە نەدابی."

پیرە پیاوەکانی شەری یەکەمی جیهانی و کوشتاری رووسیان دیبوو بە جاریك نەترسیان چوو بوو دەیانگوت: "رووس کەس ناهیلن".

لە ئیرانیشدا ماوەیەك بوو تەبلیغات بۆ هیتلەر دەکرا و تەنانەت عەجەمەکان دەیا نگوت. "حەیدەرە... هیتلەرئیە.. دنیا رزگار دەکا. ئەوەی راست بی ئەو دەم سەرم لە سیاسەت دەرنەدەچوو. ئەوەندە بوو وەك هەموو کەس لە ژاندارم ولە ریژیمی دیکتاتوری بە هەلەوی بیزار بووم.

لەوەدا ڕووداوێك لە ناوچەی موكریان ببوە هۆی باس و خواسی نێو خەڵك و كەوتبوە سەر زار و زمانان و لە هەموو شوێنێك باسی دەكرا. ئەویش گرتنی ( عەلیاغای حاجی ئیلخانی سەرۆكی عەشیرەتی دێبوكریان) بوو.
عەلیاغا كە تەواوی ژیانی لە خزمەت بە حكومەتی عەجەم دا برد بوە سەر و بە پاداشی خزمەت بە حكومەت و خەراپە لە گەل نەتەوەی خۆی لەقەبی ( ئەمیر ـ ئەسعەد ) ی وەرگرتبوو لەلایەن ژاندەرمە وە گیرابوو هێنابوویانە سابلاخ. بەدەست سەرتاوی بۆ سوكایەتی پێكردن بە شەقامی سابلاخ دا دەیان گێرا و لە بەندیخانە ڕێگایان نەدەدا كەس چاوی پێ بكەوێ. گرتنی عەلیاغا لە نێو خەڵك بە كارەساتێكی سەیر چاولێ دەكرا. خەڵك لە حكومەت بێزار دەبوو ئەو بێزارییەیان بە گۆرانی فۆلكلۆر دەردەبڕی. جاروبار بۆیان هەڵكەوتبا دەستیان لە ژاندارمیش دەوەشاند.
لەو كاتەوە كە فڕۆكەكانی سوڤیەت بەیاننامەیان بەردابوونەوە خەڵك كەوتبوە سرت و خوڕت و كۆیان بۆ قسان هەڵدەخست و وەرزێر و زەحمەتكێشیش لە كۆكردنەوەی خەرمان و دەغڵ و دان وەپەلە كەوتبوون. مەعموورەكانی دەوڵەتیش هێرشیان هێنا بوو كە زوو گەنمی زیادی لە گوندەكان وەرگرن. ئەودەم دەیان نووسی هەر كەس دەبوایە چەند گەنمی زیادی هەیە بەدەوڵەتی بفرۆشێ. ئەوەش ببوە بیانوویەك بۆ ژاندارم خەڵكی پێ برووتێننەوە.

مانگی خەرمانانی ١٣٢٠ بوو لە جێی خەرمانانی گوندی گوڕناوی خەڵك خەریكی كار و كوێرەوەری بوو، ژاندارمێكی بێ حەیا و ناسراو بە خەراپ هاتە نێو خەرمانان. خەڵكی كۆكردەوە و بەیاننامەیەكی بەخشنداری هێنا دەر و دەیگو هەر ئێستا دەبێ گەنمی ( مازاد ) باركەن بۆ نەغەدە. كاكم چوو بەیانەكەیان بۆ بخوێنێتەوە. كوێخا سجل دەپاراوە و دەیگوت چەند ڕۆژمان لێ ڕاوەستە خەرمان دەردەكەین و چەند بۆ شێرە دانراوە بۆ نەغەدەی دەبەین.. كوێخا بە خەڵكی دەگوت: "با دەراوێكی بۆ كۆبكەینەوە و تا چەند ڕۆژی تر لەكۆڵمان بێتەوە".
ژاندارم دانەدەبەزی و دەستی كرد بوو بە گوڕە و هەرا.

خەرمانی ئێمە لە قەراخ شەقامە ڕێی شنۆ ـ نەغەدە بوو. تەماشام كرد سوارێك بەغار دێ وەك بۆ دار بچێ. كە نێزیك بوو ( حەسەنی مراد ڕەسوو) خەڵكی ئالیاوی بوو. چووە پێش و ڕاوەستا. بە خێر هاتنم كرد و گوتم:

ـ کاک‌حەسەن چ باسە وا بە تالوکەی دە قەرموو دابەزە ؟

ـ کورە چ باس بێ . هەرچی دەبێ با بێ . خۆ ئیمە لە چنگ ژاندارم رزگار بووین . لەشکری روسان گەیشتە نەغەدە . ژاندارم و پاسەوانیان‌ن گشت چەك کردن سەرۆکی شارەوانی و فەرماندەی ژاندارمەیان گرت . خۆ دەکەس‌ناگەینن . کاتێك لە نەغەدە وەدەر دەکەوتم رووسێك بانگی کردم ( ئیدی سودا ) . وکیفم لە بارگینی دا تا ئیرە رام نەگرتووە . نەجاتیمان بوو".

کاک‌حەسەن‌دەناسی وزدەمزانی درۆ ناکا . دەستم دا ئەنە و بە کاکم گوت : " وەرە با بچین ئەوَ ژاندارمە سەگبابەی بکوژین . ئاموزاکانم وەدوام کەوتن . چووینە نیو خەلك و ژاندارم هەر شیرەی دەهات. گوتم : "کێدە بۆ شەرەف ئەوە چ هەر هەرابەکتە رووس‌ئەوە لە نەغەدەن و تو لیرە لە سەر ئیمە دەنەرێنی . وچانم پێ نەدا بە هەمو هیز شەنیکم لەنێو شانان‌دا . خەریك بوو دەر پەری . دەستکە یاندە ئایشی تفەنگ و لەسەر ئەسپ هیناسە خواری. تفەنگم لێ هەستاند و فیشەکەم بردە بەر. ژاندارم خۆی داویشتە پشت‌خەلك و دەپاراوە . ئاموزاکانم دووی ئەقیان کەهاندی و بابم و تەیموورئاغا هاتن .

ـ کورە ئەوە چدەکەی؟ . شیت بووی؟ .

ـ رووس‌کە یشتونە نەغەدە و لێ گەرین با بیکوژم . لەو کاتەدا دوو کەس خەلکی گوندی لە نەغەدەوە هاتنەوە . گوتیان ( ملائیکەی چاوشین) گەیشتوونە نەغەدە و خەلك رزگار بوو. بیجگە لە ژاندارم و ئاژان کاریان بە کەس نیە .

تفەنگ و ئەسپ و زینم لە ژاندارم هەستاند و تەیموورئاغا لە گەل خۆی بردیەوە چیانە . ئەمیر تومانی چیانە حاکمی سندوس و بابی غولام رەزاخانی ئاغای ئیمە بوو . رۆژی دوایی ئەمیر تومان لەدوای ناردم . کە چووم گوتی : " ئەوە فەقیرە ئەسپەکەی بدەوە با بروا . تفەنگەکەش‌بۆ تو بێ ."

ـ ئاغا ئەوە زوری خەراپە کردوە . بوکوشتن دەبێ .

ـ فەقیرە . ئەگەر نەیدەوە من ئەسپێکی دەدەمێ . هاتوتە مالی من .

ـ باشە . لە بەر خاتری تو ئەسپەکەی دەدەمەوە . پیاوێکی لەگەل ناردم. ئەسپی ژاندارم بە رووتی بێ زین دا بە کابرا و رویشت. ئیستاشم ژاندارم نەدیتەوە .

دەسەلاتی حکومەتی رەشی رەزاخان لە کوردستان کوتایی پێ هات. لە هەموو ناوچەکان لە ژاندارم‌قازاخی دەولەتی وەخوّ کەوتن . ئەفسەری لەشکرو

ژاندارم لە کوردستان بە چل و بەرگی ژناتەوە هەڵدەهاتن و خویان دەگەیاندەوە تاران ئاغاو سەروك عەشیرەتی کوردیش لە جیاتی ئەوە لەم هەلە کەلك وەرگرن و کورج بو یەکیتی دەست بەکار بن و بیریك لە حالی خۆیان بکەنەوە تێ هەڵدان و شەپانکاری عەجەمیان لە بیر نەچێتەوە و بۆ پیك هینانی دەولەتیکی سەر بە خۆی کورد وەخو کەون تفەنگو دەمانچەیان بو کوشتنی یەکتر و تالانی فەقیر و هەژاران لە خو شەتەك دان. ئەو سەروك عەشیرەتانەی لە سەر دەمی حکومەتی رەزاشادا گیرا ـ بوون و سوکایەتیان پێ کرابوو جاریکی دیکە سەریان بو حکومەتی عەجەم داد ەنو اند و هەول بەرتیلیان دەدا کە ئەوان بیان کەن بە حاکمی شارەکانی کوردستان.
کورد لە کونەوە هەر وا راهاتوە کە بە مال و هیز و تواناو دەست و تفەنگی خۆی خزمەتی بیگانە بکا. قادرئاغای ئیندرقاشی هەزار سواری لەدوو سوار بوە کە هەموویان پەری تاوسیان دە لاسەر چەقاندو. بەلام چوە لەمەراغە و میاندو را عەجەمیکی هیناوە کردوویە بە حاکمی سابلاغ.
کوردەکە لە خەرمانانی ١٣٢٠ لە چنگ ژاندارم و قازاخی رەزاخان رزگاربوو، روژیك پولە سواریکی رووسان بەرەو شنو بە ریگادا دەهاتن. کەمینتنە راست ئاوایی و کرد یانە غار بۆ نیوگوند. خەلك هەلاتن و خۆیان شاردەوە. خوشکم بە غار خۆی لە ژووری کوتا و گوتی: "نێو دێ پر بوە لە عورس". من وەدەر کەوتم دیتم بە سواری لە گورپانی نیوگوند راوەستاون. بانگیان کردم و بە کیان بە ترکی گوتی:
ـ ئەم گوندە چولە؟ بو هیچ کەس دیار نییە؟.
ـ چول نیە خەلك لە کار و کاسبیە.
ـ کی لیرە تفەنگی هەیە؟
تەنیا من هەمە و ئەویشم لە ژاندارمە هەستاندوە.
چەند سواریان هاتنە حەسار و دابەزین و تەماشای تفەنگیان کرد. شیرمان بو هینان خواردیانەوە و رویشتن. روژیك لە نیوگوند راوەستابووین بوو بە هەرا. دووسی سوار کەوتبوونە سەر برازیك و لە بەری قەلاتانەوە هینابوویان. من کورج سوار بووم و بو بەرەکەی چووم. بەراز سواری بەجی هیشتبوون و دەهاتەوە چیا کەوی. دەرو بەی تفەنگم هاویشتی و بەراز وەسەریەك کەرا. چوسەسەر تفەنگیکی دیکەشم لیدا و سوارەکان گەیشتنی. یەکترمان ناسی و چوینەوە مالی ئیمە. ئاموزایەکم نارد ئاگای لە بەراز بی

جـــواریێ شوانان نه چنه سەری . سوار بووم چـــومـه نەغـــەدە . بە رووسـەکانم گوت ــ بەرازێکم کوشتوە وەرن بیبەن . کەیفیان پـــیّ هات. کاریەکیان ئامادە کرد و چـــوار سالات سوار بوون و بە دەوام دا . کەلاشەی بەرازیان بینی شاگەشکە بوون . ٢٥ فیشە کیان دامی و رویشتن . پایزی خـــەلەو خرمانمان کوکرد بـــووە و بیکار بووین . زور شەولە گوندەکانی سندوس کویمان لە تەقـــە دەبوو ماەمش دەهاتن خـــەلکیان تالان دەکرد . بە تایبە ت قـــەرە پـــە پاخیان تالان دەکردن . لە سندوس عـــەجـــم دەستیان کرد بە رویشتن و بو لای مـــەراغـــە و بناو هـــەلدەهاتن . گوندەکەی ئیمەش دوو مالە عـــەجـــەمـــی لی بوون جیرانی چاك و خـــەراپەیان بو کەس نـــەبوو. شەویك بوو بە هـــەرا لە نیو گوند . سی چوار جـــەکدار ئەودەوو مالیان تالان کرد و نەیان هینشتەکەس لەمال بیتە دەر .

لە بیکاری دا هاتوو چـــوی نغـــەدەم دەکرد و پتر لە خزمـــەت مـــەلا حـــەمەدە ــ مینی بورهانـــی دەبووم . لەگەل دەستو ئاشناکان باسی شـــعر و فاشیزم و دەواروژی ئیران و کار وباری سیاسیمان دەکرد . کوردەکانـــی نغـــەدە تفەنگیان دەکری وکیشکچی و ــ

هزمیکیان بۆ خـــۆدادە مـــەزراند . لەگەل قـــەرەپەپاخـــی نەغـــەدە جار وبار ساری یان لە نیوان پـــەیدا دەبوو. میرزا شیخ محەمەدی عـــەلیالی لەگەل رووسەکان ریك کەوتبـــوو نەزمەهیەتی شاری گرتبوە دەست و چـــەند ( قولـسوور) ی راگرتبوون و مـــەعاشـــی لە دوکاندارانی وەردەگرت. هاتووچـــۆی نغـــەدە و نیزیکی لە مـــەلا حـــەمەدەمین و فـــەقـــی ئەحمەد تەئسیری کردبوە سەرم و لەزور مـــەسەلە ئاگادار ببوم و روون ببومەوە . سەرم لە باس و دەمـــەتەقـــەی سیاسی دەخـــورا . دەهاتمەوە خـــەبەرم بـــو بابم دەگیراوە .

پایزی ئەوسالە لە نغـــەدە توتن نەفروشرا . غولام رەزاخان مالەکەی باری کرد و چـــوە ورمـــیّ . لەزستان دا خـــەبەری دا کە توتنەکان بەرینە ورمـــیّ لەوی دەفروشرین . خـــەلکی ئاوایـــی چوار کەسیان دیاری کرد لە گەل توتنەکان بچن و حیسابەکەیان بـــو بیننەوە . لەم چـــوار کەسە یەکیان من بووم . توتنمان بە عارەبە بردە نغـــەدە و لەوێ بارمان کردن و بۆ ورمـــیّ . لە هـــەورازی شیروانشەلیان لوریەکەمان گیرسا . لوریەکی دیکەش گیرسابوو یەك دوو ئەفسەری رووسی تیدا بوون . کەلیك خـــەریك بووین دەرباز نە بووین روسەکان بەپـــیّ کەوتنە ریّ و یەکیان کە ئازربایجانـــی دەزانـــی گوتـــی : " وەرە با بروین ئەوانە بۆ خـــۆیان دین . . ریکامان داگرت و بە ترکـــی دەستمان کرد بە قسان .

هـــەوا سارد و پروشەی دەکرد . توتنـــی عـــەجـــەمیکی رووتە بووین دوو کویّدریژی وە

پێش خـۆ دابوون و لە سـەرمان دەلەرزی. گەیشتە ئێمە و بە دەنگ گوتی :
ــ ئاغا سەلام عەلیکوم
ئەفسەری روس کەترکی دەزانــی لە وەلام دا گوتی :
ــ ئاغا سـەنسەن. ئاغا ئیشەکە دیلار" (واتە ( ئاغا خـۆتــی ئاغا بە کەر دەلێن) .
پاشان رووی لە من کرد وگوتی : "ئەمە چ زیانیکە؟ . بوچ وا رووتو برسین؟ ."
کوتم : "ریژیی پەهلەوی تاوانبارە. پشووی لە خـەلك بریبوو".
ــ ئیستا چی؟ . ئیستا بۆ وەخـوناکەون؟ . بۆ بوخـوتان بیری حکومـەتیـك ناکەـ نەوە. ئیستا خـۆ حکومـەتـی پـەهلەوی نەماوە؟ ."
قسەی کابرای رووس یا ئازربایجانی کاری تێکردم . بیرم لی دەکردەوە. ماشینە ـان هاتن. سوار بووین و لە چایخانەی رەشەکان دابەزین . نان و چامان خـوارد . بانێی کردم پولـی خـواردنەکەی مـنی دا. کەلیك جیا دەبووینەوە گوتی:
ــ "یەکیتی تان هـەبـی ".
گەیشتینە ورمـێ . توتنەکانمان فروشت و شتو مـەکمان کری و ساز بووین بگەریینە لەمالـی غـولام رەزاخان تونی شیخ جەلال بووم. گوتـی نابـێ بچـیـەوە. بە هافا لەکانـی ئی گوت : "بە میرزا حامید بلێن شیخ جـەلال نەیهیشت بیتەوە ".
شتومـەکـی کریبووم بە دراوسیکان‌دا ناردمـەوە. چووینە مالـی شیخ جـەلال . لە مالە پیریژنێکی دەولەمـەندی هـەمـجـەم پانسیونی گرتبوو. بەلام شوغلی شەریفی چ بوو؟ .
پاش‌هاتنی ئوردوی سوور بـۆ ورمـێ ئەفسەر و کار بەدەستی دەولەتی ئیران رایان دەکرد و دەچـوونەوە بو تاران. شیخ جەلال یەك دوو ترکی ئاشنای دیتبوونەوە . دەچوون خانوی ئەفسەری راکردوویان دەدیتەوە. شیخ جـەلال دەچـوو بە ئیجارەی دەگرت . دەچوو ینە ناوی . ئەو لێ‌ی وە خودەکوتین و بە ئیش زۆر وحـەمـار و کەلین و قوژبنمان دەـ پشکنی . بە سندوق چـەك و دەمانچـە و شیر و شتی باشمان دەدیتەوە. ئەوانـمان دەکویزتەوە و سۆزی ئیجارەکمان هـەلدەوەشاندەوە. خانویەکـی دیکمان بە ئیجارە دە گرت. رۆژیك لە مالـی ئەرمەنیەك بانگ‌کرا بووین. شیخ جـەلال تفەنگیکی جوانـی کـری گوتـی بییەوە مزلـێ . ئیوارە تاریك ببوو. بالتوم لەبەر کرد و لە ژیر بالتەوە تفەنگم لەشان کرد و رویشتم . لە شەقامـی پەهلەوی بو لای راستە بازار دەچـوومـە خـوار ئەفسەریك و سـی پاسەوان توشم بووم. ئەو دەم پولیسی شارەوانـی لیـە ورمـی ماجوون. بانگیان

کـرد م. من راوەستام و تفەنگەکەم هێنا دەر و گوتم لە سند وسەوە دێم. ریکا بە ترسـە و ئیستا دە مە مزڵ و تفەنگەکە دادەنێم.
ئەفسەرەکە گوتـی: "با بچینە شارەوانی. تفەنگەکەت لەوێ دابنێ. بەیانـی وەرە بیبەوە.
ــ نابەمـە شارەوانـی و تفەنگیش لەوێ دانانێم.
لیمان بوو بە چـە قـە. چـوسـەنیو گولان و لە چـەخماخـی تفەنگم دا و گوتم
ــ سـەیەنە پیش". لەو کاتەدا دوو سالاتـی رووس پەیدا بوون. ترکیان دەزانـی.
پرسیان ئەوە چـیە؟.
ــ کـرد م و لە سند وسەوە هاتووم و دەچمە مزڵی. ئەوانە دەیانەوێ تفەنگەکەم لێ بستێنن.
ــ بو قوماند انـی. وەپیشخویان دایین و بردیانین بۆ قوماند انی رووس لە ورمـێ.
ئەفسەریک هاتە دەرو پرسیاری کرد. ئەم زانـی بە رووسی چیان پـی گوت. بەئازانە کانـی گوت شێوە بەرن. پاشان بە منی گوت ئیوە دەناسیەوە؟. ئەم شەو بچـووە. سوزی وەرە تفەنگەکەت بەرەوە. بـێ تفەنگ گەرامەوە و حکایەتم بـو شیخ جـەلال گیراوە. گوتی:
"هیچ نیە بەیانی دەچـم دەیهێنمەوە. بانی بوە نەت داوە بە ئاژان دە نا دەچـوو.
بەیانی شیخ جـەلال گوتی: "خـوّت بچـوو تفەنگەکەی وەرگرەوە".
چـوسـە قـوماند انـی و ئەفسەرەکە هاتە دەر و گوتـی: ئیوارێ وەرە تفەنگەکەت بەرەوە.
ئیوارێ چـووم گوتی سبەی وەرە. بەکورتی شەش روژی رەبەق من هاتو چـۆم کرد و ئەورو سبەیان پێ گوتم. شیخ جـەلالیش هـەمـوو جاری دەیگوت: "بە مەرقەدی بابم ئابروو یان دەبن، دەیهەستینمەوە. جاری تو بزانە دەڵێ چـی؟".
روژی حـەوتەم چـوومەوە قوماند انی و دوو ئەفسەری دیکە لای کابراد انیشتبوون. یەکیان ترکی بانی دەزانـی. کابرا هـەستا و گوتـی: "بۆ تفەنگەکە هاتووی؟.
ــ نا. بە وی ئازربایجانیم گوت: "تکا دەکەم دوو قسەم هـەیە ئەم ئەفسەرەم بۆ حالی بکە تفەنگەکەم ناوێتەوە".
ــ چـی؟ بلی بزانم.
ــ من مالم لە سند وسە. حـەوت روژە هاتوو چـۆ دەکەم دەرۆم لە کەڵ دەکا و ئەمرۆ سبەی ئیمە دەمانگوت لە چنگ دەو زولمـی حکومەتـی پەهلەوی رزگار بووین. بەلام واد یارە ــ خـەتاکا ئیوە نیە. سەعدی دەلی:
"چو کنعان را طبیعت بی هنر بود ــ پیمبر زادگـی قدرش نیفزود"
سروشتی شیران وایە. هـەر کەس بێتە ئەم ولاتە دروزن دەبـێ و راستی لەبیر دەباتەوە

ئەو هاتو چــویەم بۆ پەیدەکا . ئەگەر نام داتەوە با بەلێ و دەمرۆمـەوە.
قسەکانـی منی بۆگیراوە . پیکەنین . گوتی راوەستە . تفەنگەکەی هێنا و لەگەڵ من هاتە
دەر . فایتونێکی راگرت. سواری کردم و پولی دا بە فایتونەکە و گوتــی : " مە ترسی ".
کە چــومەوە شیخ جــەلال گوتــی : " بە سەرقەدی بابم سبەی دەم هــەستاندەوە !
زستانی شیخ جــەلال خانەکەشی هێنا ورمێ . لە ماڵــی پیرێژنــی پانسیون بووین .
رۆژێک بەیانــی نانمان دە خوارد خانم گوتــی : " میرزا کەریم دەزانــی چــیە ؟
ئەو ژنە عاشقی تو بوە . دەڵێ مارەم کا . دەزانی چــەند دەولەمــەندە؟ ".
ــ خانم من پیرێژنــی چ لێ دەکەم . ئیستا من بۆ ژنهێنان نابم . شیخ جــەلال گوتی
ئاقڵنــی . سبەی دەمرێ . کەسی نیە . سەروەتی بۆ تو دەبــێ . من جوابم نەدانەوە
پیرێژن بەو خــەیالە باشی بە خیو دەکردین .
شیخ جــەلال زمانی روسی دەزانی و هــەر دوای هاتنە دەر لە زیندان لــە
ورمــێ هاتوو چــوی روســەکانی کردبوو . ئاغای شکاك و هــەرکی دەهاتنە مزلەکەی وباسی
یەکیتی و پیك هێنانــی حکومــەتیان دەکرد . رۆژێك بڕیار وابوو لە مزگەوتــی سونتی یان
کوبوونەوەیەك ساز بکرێ و شیخ جــەلال وتار بدا . بەیانی رومان کردە مزگەوت. خــەلکێکی
زور هاتبوو. ئەفسەرێکی رووسیش کە ترکــی دەزانــی لە پــەنا شیخ جــەلال راوەستابوو.
کاتــی وتار دان بوو ئاغایەکــی شکاك بانگی کرد : " راوەستن با شــەمرخان بــێ ".
شیخ جــەلال گوتی : " تا کەی راوەستین ؟ . ئاوڕی داوە کابرایەکــی رووتەلە لەوێ وەستا
بــوو، شانــی گرت هێنایە پێش و گوتــی : " ئەوە شــەمرخان ". ئاغای شکاکان هاروژان
بوو بە هــەرا و راپەڕان داپسان . کەم مابوو تەقــەو فرتەنە سازبــی، کابرای رووس چــوە
سەر کورسی و بانگی کرد : " هــەر کەس دەست بجزێوی لەو ســەیدانە کوێــی لە بزمار دەدری
کوبوونەوە دەستپێکرا . شیخ جــەلال لە بارەی زولم و زوری رەژێمی کورکراو و خــویریەتی
ئاغاو سەرەك عــەشیرەتــی کورد و لە بارەی یەکیتی وتارێکی جوانی دا .

دیسان قازی شیخ تەها

رۆژێك لە روژەکانــی بەهاری سالی ۱۳۲۱ لە پردێتمان قازی شیخ تەها بە چــە
ند بار و بارگین و ژن و مندالەوە لە حــەسارەکەمان وەژور کەو... لێی وەدەرکەوتــین .
عــەروا بە زمانلوسی و بە پیکەنینەوە گوتی : " پــەنام هێناوە . . . لە لیقە و ماندا پەنا

بۆ پیاوان دەبەن ". بابم گوتی : " پەنات هیناوە مالی خوتە و بە خیر هاتی .
مال و ئەرە وبرەمان بردە ژوور و لاخەکانی ناردنەوە . قازی پاش تیکچوونی حکومەتی
رەزاشا لە بەندیخانە هاتبوە دەر و لە ترسی پیرانان مالەکەی برد بوە گوندی ( رکاوی )
زستان خۆی بە سەر مالە دەرویشان‌دا بریبوو . بەهاریش‌ولاخی پەیدا کرد بوون و
رووی کرد بوە سندوس و هاتبوە کورناوی . قازی نیزیکە دوو حەوتوو لە مالی ئیمە بو
زور بە رەحمەت نەبوو . زوریشمان قەدر دەگرت . بەلام دووکوری جحیل لەمال‌دا دیاربوو
بۆی دەدەر نەدەبرا . دل پیسی لە ژنەکەی دەکرد . روژیک مالەکەمان بۆ لە عارەبەنا
و چوە نەغەدە . ئیتر جەنابی قازیم نەدیتەوە .

زەمبیل و نوشتەی پینج تمەنی

بەهاری مستەفای ئاموزام هاتبوو سەرمان بدا . مام ئەسپارد بووی کە کاکم بەرینە
زەمبیل خزمەت حەزرەتی سەید و نوشتەی بۆ بنووسی چاک دەبیتەوە . ئاموزاکەم هەلی
بیجاین کە بچینە زەمبیل . کاتیک مەسەلەی نەخوشی کاکم دەهاتە کوری ئیتر بوعیلاجی
ئەو هیچمان وەپیش‌چاو نەدەهات . دایک و بابم رایان هاتە سەر سەفەر . بوئەوە کە
کاکم هەر لە مال دانە نیشی و توزیک دنیا ببینی . بەهاری زوون کاتی کار و کاسبی
نەبوو تا ئەودەم دەگەراینەوە .

روژیک سێ کەسی ریگامان داگرت چووینە قەرەبلاغ مالی مام . لەوی کوریکی
دیکەی خزمی خومان هەلگرت و چوار کەنجی هەرزەکار ریمان داگرت و بو
زەمبیل . ئاموزاکەم گورانی بیژیکی دەنگ خوش‌ و لە ریگا بە گورانی و سەیر دەرویشتین .
لە وەتەمین‌تەپی پەریبووین توشی کابرایەک بووین بە تەنیا بەرەو ئەولا دەرویشت . پاش
ماند و نەبوی کردن گوتی : " خەلکی سەقزم و ئەم ریگایەش‌ناشارەزاتیم ". کابراش‌لە
گەل ئیمە کەوتینە ری . بریارمان دابوو شەو بچینە قەرەکەند . دوور و نیزیکی گوندی
بووین کەوتینە سرت و خورت . تەکبیرمان لەوە دەکرد کابرا چون لە خومان‌هەلاویرین
پینج کەس‌لە مالیک چۆن دەحاویتەوە؟ . کابرا هەستی کرد بووکە باسی ئەو دەکەین
گوتی : " برا ئەم سرت و خورتە چیە؟ . بە خوا من ناشارەزام . کەس‌ناناسم خوا
ئیوەی بو گەیاندوم . بچنە کوێ لەگەل ئیوەم . ئەم شەو لیتان جیا نابمەوە و سوزیش خوا
حافیزیتان لی دەکەم . قسەکانی زور پیاوانە بوو . گوتمان کە وایە کشتمان ئەچینە
مزگەوت . با دەسنویژ هەلگرین و راست روو دەکەینە مزگەوت .

کەوتینە نیو گوند. مزگەوت لە دوورەوە دیار بوو. کور وکاڵ لە هەیوانی مزگەوت ویستا بوون. بە جاریک پینج لاوی قوز سلاویان کرد و چوونە ژور. تازە لە جەماعەتی نوێژی شیوان دەبوونەوە. چووینە سەر بەرماڵ وگوتیان با نوێژی بە جەماعەت بکەین. دەستە فای ئامۆزام دایکوتا قامەت وکاکم وە پێش کەوت و نوێژی بە جەماعەت تەواو بوو لە نیو عالەمەکە بوو بە دەنگ. "مەلا و فەقێی میوانی منن... ئەوی دیکە ناوەلا دینە مالە من."

ئاخرەکەی سۆفیکی کەیخودا بە ناوی ( عبد الکریم کارەش) هەستا و گوتی:

ــ فەرموون با بچینەوە. "ئیتر کەس قسەی نەکرد. هەمووومان چووینە مالی کارەش. مالیکی ئاوەدان و خەلکیکی روو خۆش. تەشەوریان هەلکردەوە. مریشکیان سەر بری و پلاو فیلی تێ نەدەچوو. کەوتە پرسیاران. کاتیک گوتمان کوری میرزا حامیدین ئینر راست بوەوە و ماچی کردین وگوتی. "ئیمە خزمین وئاغە یەکین و زور لیکتر نیزیکین. بەئاوات بووم خەبەریکی بابتان بزانم. بەخیر هاتن و چاک وخۆشی دەوریانە کرایەوە. دوای نانخواردن بە دابی محال گوتیان با جورابین بکەین. لە گەل ئامۆزاکەم نەخشەمان کیشابوو کە شەوچەلە بە کابرای سەقزی بکرین. جورابینمان لە گەل کرد دو و دەستمان لێ بردەوە. کابرام هەلپیچا کە بنیری میوژ وگوێز بکری. کابرا گوتی:

ــ من بە کالتەم دەزانی. ئەمە کەمە. با دەستیکی تر بکەین لە سەر دەوەنەن و ئەمەش دوو تەمەن. پولەکەی دانا. ئیمەش هەر بە هیوای پیشوو دامان مەزراند. نەی هیشت بیست گوریە بکەین تەواوبوو. شەو بۆ خەوتن یێ خەفیان بۆ بردینە مزگەوت. جحیلی گوند لیمان کوبوونەوە دەبێ جورابین بکەن. چار نەبوو. بومان دەرکەوت ئەگەر کابرای سەقزمان لەگەل نەبایە کەوا و پاتولیشیان لێ دەبردینەوە. فرشتەیەک بوو لە فریامان هاتبوو.

بەیانی کابرا مالاوایی کرد و رویشت. کاک ( عبد الکریم کارەش) نەی هیشت ئیمە بروین. ئەو روژەش میوانی ئەو بووین. روژی دوایی کەوتینە رێ و شیواری چووینە زەمبیل. هەوەل جار بوو تەکیە و خانەقام دەبینی. خانەقایەکی گەورە. دەتگوت عەمباری توتنە هەمرزەی دەهات. دیوەخانەکیش لەولاتر بوو. ئەوێ بۆ ئاغا و میوانی قەلەو فەرش کرا بوو. ئەو چێشتی کەئەمە شامیان دایێ و هەر کەسەش سەولەیەکی گەنم و جویان هاوێتە سەر کوشی. هەر لەسەر نانخواردن لە گەل ئامۆزاکەم دەستم پێکرد.

من ئەو دەم بیرم کرابـووە و ناوی صلاوات و بەرامبەریم بیستبوو. بیزاری خـوم لـە وـ
سیتە چـەوسانەوە دەر بری . ئەو هـەر کەس دەبوایە لە جێگای خـو رابکشی و ئەگەر
بەرمالیك جاجمێکی وەکیر کەوتبایە باشبوو دەنا دەبوایە تا رۆژ لە سەرمان لە بن دەستی
خـوی بدا . تاریك و روونـی بەیانی بۆ نوێژ راستیان کردینەوە . دوای نوێژ هـەر یەکە
کولێرەیەکی گەنمە شامیان بو هاویشتین . پاش خواردن سوفیەکـی ریش پانـی مل ئەستووری
رومەت سوور بانگی کرد : " ئەوانەی دوینی و پێری هاتوون سەرمخەستن بایرون . ئیـستا
حـەزرەتی سەید دیتە دەر . زیارەتـی بکەن و بچن نوشتە لە فلان مـەلا وەر بگرن و برون " .
دەرکردنیکی رك وراست بوو . ئیمەش دەبوایە بروین . پاش بەینیك لە بەر دەرگای خانەقا
بوو بە قـووە و گریان و شیعر و سلاوەت و جـەزم بوون . بـوو بە کەلەکە و پال پەوە نان
بو دەست ماچ کردنـی سەید یزەمبیل . مـەلایەکی لە تەنیشت راوەستا بوو نوشتەی دەدا
بە خـەلك و پولی وەر دەگرت . نورەی ئیمەش هات . ئاموزاکەم گوتی : " قوربان ئەوە پەنا ـ
مان هیناوە . ئەو برایەمان سەرو دل دەیگری و لە تو بەدەر پەنا و عیلاجـمان نیە " .
سەید دەستیکی بە سەرکاکم دا هینا و بە مـەلای گوت : " نوشتەیەکی ( صرع ) ی بو بنوسە .
وەد رنگی کەوتین تا سەید چـوە ژور . مـەلا نوشتەی بو نووسین و پینج تمەنی لی وەرگرتین
ئیتر ئەم سەفەر و دیتنی ئەم وەزعـە و ئەم فریودانە بوو بە بناخـەی دژایەتی من لە گەل
ئەم تاقمە فریودەر و بـیّ خیرە و موفتە خـورە .

لە زەمبیل گەراینەوە . نـەخـوشی کاکم چاری نەکرا و تا دەهات توند تر دەبــوو
لەگەل ئەوەش یەکـی کار و کاسبی نە دەخست . شیخ جـەلالی دەربەندی کوندی کورتاو
لە غـولام رەزاخان بە ئیجارە گرتبوو ئەم جارە ببوە ئاغامان . رۆژیك لە گورتاوی پەیدابوو
گوتـی : " تفەنگیکم لای وەستامحەممەدی تورکە چـیە ئەتیّ بچی بوّم بینیەوە . چار نەبوو .
رۆژیکی بەهار دەلینگی خـوّم روهینا و بەرەو سابلاخ . لەسەر کانی ( کانیەماسەیدە ) ـ
زەلامیك دانیشتبو نانی دەخـوارد . سلاوم لیکرد . ئاویکم خـواردەوە و کابرا گوتـی :
" بو کوی ئوغر بـی " .
دەچـمە سابلاخ
ـ بە شار ویران دا دەچـی یان بە شەرگە دا ؟ .
ـ بو دەچمەوە شارویران زور دوورە . بە شەرگەدا ئیواری لە سابلاخـم .
ـ ترست نـیە روتت بکەن ؟ . دە لین لە شەرکە ری دەگرن .
ـ ئەوەی روتم دەکا هـەر وەك من پیاوە .

ــ دەلـێی چـی نەکول تو بێیم؟. من نیەه دروم. ئەم زستانە لە شنو کارم کردووە پولیکم پـێ یە. بۆ مالی زوریش بە پەلەم .
ــ وەرە با بڕوێن . دوو کەسین کێ دەموێری خـومان لید ا؟ . گەوتینە ری تاریك داهات بوو لە پردی سوور پەرینەوە و لە قـەراغ شـار کابرا گوتی : " من ریگام بیرە دایە تو شـە و دەچـیە کوی؟ .
ــ من کەس ناناسم. شەو بەە مالی ئێوە . لە منت نەکەوی . جا دەبوو ئەو پرسیارە بکەی؟ زور بە نا بەدلـیـ ـــ جا کەوایـە بیرە دا فـەرمـوو.
گەیشتینە مالـی کابرا و لە دەرگای دا . ژنیکی کورتە بالای قوزی لە دەستان خـوی دەرگای کردەوە و بە سەری زمانـی ماندوو نەبوونـی لیّ کرد . مالیکی پاك و خاوین سە ماوەر تیّ هاویژراو دەتکوت چاوە روانی هاتنەوەی میردەکەیەتـی . زور کەمیان پیکەوە قـسە دەکرد . سەر لە ئیوارە جیگایان بو راخستم و لیّ ی نوستم . کابرا بەیانی زوو هـەستا و چـوە حـەمام. بە ژنەکەی گوت هـەلّی بستینە با بچێتە نوێژی . کاتیك کابرا وەدەر کەوت ژنەکە بانگی منی کرد و گوتی : " ناچـیە نویژی ؟ . هـەستام چـوومە مزگەوت و هاتمەوە نان و چام خـوارد و مالاوایـیم کرد و چـوومە دوکانی توکمچـی . تفەنگەکەم وەر گرتەوە و چـوار بستە فیشەکم کری و لە سەیدانی سـەنگوران توشـی کورەکانی میناغای قـزلجـە بووم کە بە مندالی پیکەوەمان خـوێند بوو. چاك و خـوشی و گوتیان دەبـی میوانی ئیمە بـی . گوتم دەروم و شـەو دەچمە کوسە کەریزی ". لەوان هـەلبرام دوکانداریك بانگی کردم گوتـی : " ئەوانەی لە گەلیان راوەستا بووی دەیانناسی ؟ ".
ــ بە مندالی پیکەوە خویندومانە.
ــ ئەوانە ئیستا کاریان دزی و ریگریە . وریا بـە . دێنە سەر ریگات ".
سوپاسی کابرام کرد و نانیکم خـوارد و لە شار وەدەرکەوتم بو کوسە کەریزە . فیشەکـم دەکیرفانی نان و بستیەکم هاویشتبوە سەر و قوچاخ ملی ریّ یام گرت.
نەگەیشتبومە بەردە کونتیّ دووسواری چـەکدارم گەیشتێ . ماندوو نەبونیان کرد و گوتیان : " خیر بێ دەچـیە کویّ؟ .
ــ دەچـمە کوسە کەریزی
ــ ئەدی ئەو تفەنگە بـیّ فیشەکە چـیە؟ .
ــ بـیّ فیشەك نـیە و تفەنگە گریوە و پەنجا فیشە کیشی لەگەلە.

ـ دەكەری چاویکی لێ بکەین بزانین چیە
ـ برون بە ریگای خۆتاندا . بە ئیوە چی چۆنە و چیە؟ .
ئەوان رویشتن و کاتیك گەیشتنە چایخانەی وسوکەند لەوێدا بەزیبون . لەودا چایەکیان خواردەوە و یەکیان گوتی : "ئیمەش دەچینە کوسە کەریز . دەتوانین سوارت کەین" .
ـ باشترە خۆتان برون و لە من گەرین . ئەوان سوار بوون و بە کاروانە رێدا جاروبار ئاوریان دەدایەوە . منیش بەدوای ئەواندا هەتا بەر بناری . لەوێ تێ هەلگەرام بۆ ریگای دریاز و رەسەریان کەوتم . کە وەسەر کەوتم دیتم هەر دووکیان دابەزیون و چاوەروانی من دەکەن . لە بن بەردیك چوکم دادا و تفەنگیکم هاویشتنێ لەنیوان ئەسپەکان لەعەرزیمدا . ئەسپ دەر پەرین و هەر یەکە بە لایەکیدا . ئەوان وەدوای ئەسپان کەوتن و منیش رێم داگرت ئەوچومە کوسە کەریزێ .

## بەرەو شامات

پاش ئەو سەفەرە حاجی مەلا خالیدی دەربەندی تەشریفی هاتە مالمان و ـ گوتی : "هاتووم میرزا کەریم لەگەل عەولای کورم بچێتە شامات ( دێی وەیسلغا ) مالە مەلا سەید مەحمود . کچیکی هەیە دەمەوێ بۆ عەولای بخوازم . بابم فەرمووی لەبەر دەستی خۆتدایە . من ئەو سالە ئەسپیکی رەشی جوانم کریبوو . دەمانچەی چاك و بوشناخ . مەلا عەولا هات و چوینە سوارە کەوتینە رێ . هیچمان نەچوینە شامات و شارەزاتێ نین . ئەوچوینە کوسە کەریز مالە خوشکیکم لەوێ بوو . بەیانی ریگامان دا گرت و چوینە گردەگروێ . لەوێ پرسیاری ریگامان کرد گوتیان : هەر وا لاری بروو و لەو کیوە سەرکەون شاماتە . بەکویرەرێ و دۆلیکدا کەوتینە رێ و لە کیویك وەسەر کەوتین لەودیو دەشتیکی پان و بەرین هەر سپی دەچوو ئاو دایگرتبوو . گوندیك لە بن کیو بوو چوینە خوار و رومان کردە نیوگوندی . پرسیمان گوتیان ( دەلکدانە ) . کە چوینە نیو گوند خەلك لە بەر دەرکی مالیك کۆبونەوە و دەگریان . سلاومان کرد و پرسیمان ئەوە چیە .؟
ـ مام قویتاس نە خونە ولەگیانەلادایە و کەس نیە یاسینی لە سەر بخوێنی . چوونە ترقەکامەلای بینن . بێ ئەولا ولا خوم لە سەر ئەسپ فرێدا خوار و وەژوور کەوتم . سلاوم کرد و چومە بن سەری نە خوش و دەستم کرد بە یاسین . من یاسینم بانی لە

بەسەر سوو. خەلك واقیان ورما . كرد یانە سرت و خفورت. مام قسویتاس موسلمانسی بانێ وخوا یاسینی بو نارد . ولاخیان وەرگرتن و تفاقیان دانێ و مەلاعەولا هاتە ژوور. نان وچایان بۆسازكردین و یاسینێكی دیكەشم دەقەبەل كرد و كابرا چاوی هەلینا . كابرای لە دوای مەلایان ناردبوو هاتەوە خواو راستان مەلا لە مال نەبوو. مام قسویتاس وەزمان هات و بەسۆم دەركەوت دووبرای لە گورناوی دراویسیمانن . سولتانی مام قویتاسیش كە لە كاروانسی شەهیدان دا ناوی هاتەوە لە دوا رۆژدا بسو بە تیكوشەرێكی خەباتگیر و لە زیندان دا ئیفلیج بوو ئاخرەكەی پسێ چوو.

نان و چامان خوارد و ولاخەكان حەسانەوە و گوتمان . " دەچینە (دیی ـ وەیسئاغا) و ناشارەزاین. لافاویش ریگای نەهیشتوون و شارەزایەكمان دەوێ وە پیشمان كەوێ. زوریان هەول دا شەو میوانیان بین . كوتمان بە پەلەین و دەمان برۆین .

(خالەمامە) ی ژن برای مام قسویتاسیان رەگەل خستین . زوریان نسحەت كرد كە دەلای راست نەكەوێ و دەستی چەپ بگرێ . بە ئیمەشیان گوت كە لە پرد پەرینەوە لە ئەسپ دابەزین و تا پشتێنە خۆمان رووت كەینەوە و ئەسپەكان بە دوای خۆمان دا رابكیشین .

خالە مامە كەوتە پیش و ئیمە ش بە دوای دا . لە پردێ پەرینەوە و خومان روت كرد تا پشتێنە . ئاوێكی سارد و بایەكی ساردی دەهات. ولاخمان دەكیشان . ولاخ دەچەقین و بە زەحمەت دەهاتنەوە دەر . ئاو دەگەیشتە پشتێنە مان. لە نیوەی ریگا و لە نێوەی ئاودا مامە خالە گوتی . " هەر ئاوا برۆن و دەلای راست مەكەون . من دەگەرێمەوە كس نیە تفاق بدا بە كامێنەكانم . " .

ـ پیاوی چاك بە ئیمە شارەزانین بمجێمان مەهیلە . زور پارامەوە فایدەی نەبوو. هەلم كیشا دەمانچە و لولە دەمانچەیەكم لە پشت ملی كوتا و گوتم برو سەگباب شەویش ناهێلم بچیەوە . چۆن دەتەوی ئیمە بخنكێنی و تو تفاق بدەی بە كامێنان . .

ـ بە زوریم دەبەی ؟ جا ئەوەش پیاوەتیە؟ .

ـ وە پیشم كەوە و لە سەری مەروو . خالە مامەم وەپیش خودا تا گەیشتینە وشكایی .

مالە مەلاسەید محمود پیشوازیەكی بێ وینەیان لێ كردین . جیگای ولاـ خەكانیان نەبوو . هەر یەكە بردیاننە مالیك . مەلا سەید محمود پیاوێكی قسە خوش رووخوش بەریز میواندوست وپیاوی ئاوا كەم هەبووە بەلام كیژەكەی . تا ئەورۆژە كیژی واجوان و شوخ و قیت و قسوزم نەدیبوو. نامەی حاجی مەلامان دا بە مەلا سەید محمود و گوتی :

- ئێوه حه‌تویه‌ك لیره‌ن . لافاو ته‌نیشیته‌وه ده‌رناچن . یا عه‌ولا كچه‌كه‌ ببینێ و ئه‌گه‌ر رازی بێ هه‌ر ئیستا لێی ماره‌ ده‌كه‌م . تو خوشت كیژه‌كه‌ ببینه‌ . "
عه‌ولام تێ بمردا به‌لام بوی نه‌گیرا . ئه‌و ماله‌ی ئه‌سبه‌ر مه‌لا عه‌ولای لێ بوو ژنی ئه‌وانم راسپارد كه‌ له‌ گه‌ل كیژه‌كه‌ قسه‌ بكا . روژیك ژنی ماله‌كه‌ پێی گوتم : " سه‌ید زاده‌ ئیشتیای له‌ تویه‌ . میرد به‌و كوره‌ ناكا . ".
مه‌لا عه‌ولا پێی نه‌ده‌گوت . به‌منی ده‌گوت تو قسه‌ی له‌گه‌ل بكه‌ . ئاخری روژیك پیم گوت : " ئیمه‌ له‌ سه‌ر تو سه‌حته‌لین . مه‌لا عه‌ولا كوری چاكه‌ . بابینت له‌ سه‌ر قسه‌ی تو راوه‌ستاوه‌ . "
چاویكی لێ كردم . گوتی : " تو بوخوت شاقه‌لت زور ده‌زیزن بو خه‌لك ده‌بارێیه‌وه‌ . كه‌نگی ده‌زیه‌وه‌ چاوه‌ روانت ده‌بم . "
هیچ . مه‌لاسه‌ید مه‌حمود نامه‌ی بو حاجی مه‌لا نووسیه‌وه‌ و ده‌ست له‌ . . ده‌ریژتر گه‌راینه‌وه‌ و به‌ داخه‌وه‌ نه‌متوانی بچمه‌وه‌ دێی وه‌یساغا . به‌لام ده‌سالێنی پێ چوو بوو سه‌ید زاده‌ ، و قسه‌كانیم له‌ بیر نه‌ چوو بووه‌ . پاشان بیستم شووی به‌ كه‌سیك كرد بوو له‌ ساله‌كانی ۳۵ و ۱۹۳٦ به‌م لاوه‌ دوست و براده‌ر و ره‌فیقیكی خوشه‌ویست و جوامیری من بوو .

## شیخ واحید و قه‌مره‌ قشلاخ .

له‌شامات به‌دلیكی شكاو و یه‌كی شاد و هیوادار یه‌ره‌و سندوس گه‌راینه‌وه‌ . به‌لام ده‌بوایه‌ به‌ قه‌مره‌ قشلاخ دا بچینه‌وه‌ . به‌ مه‌زه‌بی جحیلان :، ده‌كرا به‌ ناوچه‌یه‌كدا بروی و سه‌ری دوست نه‌ده‌ی . ده‌م زانی تازه‌ بوكیك به‌ سه‌فه‌ر چوته‌وه‌ ماله‌ بابی و جاوی له‌ رێ بوو به‌ ویدا بچمه‌وه‌ . پیش‌نیوه‌ رویه‌ بوو گه‌یشتینه‌ قه‌مره‌ قشلاخ . له‌ ماله‌ بابی دوسته‌كه‌م پرسی و پێیان نیشان دام . كه‌ چووینه‌ حه‌ساری و لیمان وه‌ده‌ر كه‌وتن دایكی بانگی كرد فاتم وه‌ره‌ میرزا كه‌ریم هاتوه‌ . ولاخیان لێ وه‌رگرتین و چووینه‌ ژور . ه‌ خیر هاتنیكی گه‌رم و چاك و خوشی و یلار ولاتاو به‌لام وه‌زعی ماله‌كه‌م جوریك هاته‌ به‌ر چاو . من جاری دیكه‌ش له‌وێ میوان ببوم . ئه‌م جاره‌ مالی فه‌رش كراو وچه‌ند ده‌سته‌ نوێ بو پالەو پشت داترابوون و سه‌ماوه‌ر ده‌كولێ و خه‌ریكی نان و چیشت بوون .
كردم به‌ گالته‌ و گوتم : " ئه‌وه‌ چییه‌؟ ده‌لێی ماله‌ بوكێیه‌ . فاتم گوتی : " خه‌ونم ده‌بیو ده‌مزانی تو دێی .

دایکی گوتی: "شیخ واحد میوانمانە. دەرویشی لەگەڵن. چۆتە ماڵێکی دیکە و بۆ نان خواردن دێتەوە." گوتم میوانی تۆیە یا میوانی فاتمی یە؟.

شیخ واحید کێ بوو؟. بیستبووم کابرایەکی کوێر ماوەیەک بوو لە سندووس و شنۆ و ناوەیران پەیدابیوو. خۆی بە تایفەی شیخی سندولان ناساند بوو. چەند دەرویش گەروگای لە خۆ کۆکرد بوونەوە و دەستی کرد بوو بە راو ورووت و دەسوڕاوە و دەیکرد و دەیخوارد. ساختەچی و داوێن پیسی وا نەبوو. من هەر ناوم بیستبوو رقم لێی بوو جا ئێستا هاتبوو لە ماڵە فاتمیش میوانبوو.

کە دایکی فاتمی ناوی شیخ واحیدی هێنا عەولای حاجی مەلا خالید سپی هەڵگەرا. گوتی: "کورە رابە بلا برۆین. تووشی کێشە دەبین. ئەو سەگبابە زستان هاتبوە دەربەند. من فەقێیم لێ هاندان و لە گوندیان دەرکرد. ئەمڕۆین من لە سێرە بیبینێ باسی سەرە. ئەختێکە ولام دڵخوشی داوە. ئەمن دەگرا برۆم. بینویەکی ئاوا بۆ رۆیشتن نەبوو. چیم بە فاتمی دەگوت؟. لەم باس و خواسەدا بووین شیخ هاتەوە. چوار پێنج دەرویشی مل ئەستوری لەگەڵ بوون وەژوور کەوت. خانە خوێشی لە گەڵدا بوو. بەخێرهاتنم کرد و دەوور لە شیخ لەو بەرگەتەندوور دانیشتم.

پرسی لە کوێوە هاتووی؟ خاوەن ماڵ هەڵیدایە و گوتی: خەڵکی گورناوییە کوری میرزا حامیدە.

— ها، وە بیرم هاتەوە. ئێمە دوو شەو لە گورناوی بووین باسی تۆش کرا دەمیان گوت لە ورمێیە. باوکت پیاوی چاکە. تاوێک مات بوو. پاشان چاوێکی لە عەولا کرد و گوتی:

— ئەوە کێیە لە گەڵت؟.

— براد مریکمە. چوو بووینە شامات و لە وێوە دێینەوە.

— ئەوە کوری مەلای دەربەندی نییە؟

— بەلێ هەوە

— ئەو سەگەی بۆ لەگەڵ خۆت دەگیری؟. ئەوە کافرە مولحیدە

— ئاگات لە یاری خۆت بێ. ئێستا لەگەڵ منە و میوانە

— نا . . . دەبێ رەجم بکری. فەقێی وەدوای من خستبوون و دەریان کردم.

— ئەوە رابردووە و ئێستا میوانە. رەنگە خەتای ئەویش نەبووبێ.

— نا ئەوە مەلعونە دەبێ پەت بکری

ـ ئاگات له زاری خـۆت بـی . کەرناتوانـی هیچ غـەلەتیك بکا

ـ تونن . ئیستا به دەرویشان دەلیم هـەر دوکیان پـەت بکەن .

کەوای گوت ئاگام له خـۆ نەما . بەری چاوم تاریك بوو . بەتایبەت فاتم دەمبیست کە قسه بە من دە گوتری . ئیتر قاپشی دەمانچـەم ترازاند وگوتم :

ـ هـەر سەگبابیك لە جێی خـۆی ببزوی وەك سەگ دەی تووپینم . دیارە تۆ ریزی خوت نازانـی . دەبا سەگبابیك جوله بکا . بەولاتدا دەسوریمەوە کەر نازانی لە چـی دە کەرێـی .

خاوەن‌مال و ژنەکان کەوتنە بەین و بەسەر شیخ دا هاتن :

ـ قـوربان ئەوە میوانی ئیمەیە . چەندمان‌خـوێن‌دەوی . من هـەستام وگوتم لـە کەل چاوشان لە ژوریك‌دانابم . توچاوەشی لەنان دەگەرێـی . فاتم ودایکی هاتن و لەئامیزیان گرتم و نایێ بوری . شیخ کەوتە کلکە سوتە .

ـ تو بەخـورایی تورە بووی . کەر کەکەل توی نەبوو . ئەوانە سوکایەتیان بە من کرد بوو .

ـ تۆ دەزانی ئەوە هاقالی منە . میوانە . تو شیخی دەبی لەسەرخۆ بی . جا ئەگەر خەدەر وەك خـەلك بی فەرقت چیە .

دەرویش‌گەتا ئەو دەم بیدەنك بوون وەدەنك هاتن : " قوربان پیاوی خـوا ئەبێ بەحەرێی نابـێ بە چورە ئاویك شلوی بـی . ئیمە ماتا نەفامین توونی سەد گوناح ئەبین ئیـوە دەبـێ بمان ببەخشن .

شیخ گوتی هـەستە وەرە لای من .

ـ فـەرقـی نیە ولیرە دانیشتوم .

ـ نابی . بە سندولان دەبی بێیە ئیرە .

دەرویشەکان . " دە بـی قـەزای شیخ سویندی خـوارد وبچو لەوێ دانیشە . پاشان دایکی فاتم هات‌باسکی گرتم و بردمـی لای شیخ دانیشتم

شیخ چایەکـی لە پیش‌بوو هـەلیگرت لە پیش‌منی دانا . نانیان هینا . سفرەی من و شیخ نانی گەنم و پر لە خـوراکی جور بە جور . ئەوانی تریش‌نانی‌جۆیان بو دانا بوون . ( پیویستە ئەوە روون کەینەوە کە شارویران لە بە ر ( سن ) گەنمی نەدەبوو پتر خـەلك نانـی جـۆی دەخوارد . یەك یەك مال گەنمیان دەبوو ) .

پاش‌نانخواردن هـەستام دەستم بشوم . فاتم ئاوی بە دەستم‌دا دەکرد . گوتم شیخ تەماعـی دەو ایکت کردوە . گوتی : " ئەویش‌وەك تو .

لەگەل شیخ رێك کەوتینەوە و دەستمان کرد بە قسان و عەولا هاتەوە سەر خەو. دوای چا خواردنەوە سوار بووین و بەنابەدلی قەرە قشلاخمان بەجێ هێشت.

بەهار دەستمان کردەوە بە کار و کاسبی و لەسالان زیاتر کوێرەوەریمان هەبوو. ئاشنایەکی عەجەممان هەبوو لە رادانە دەژیا. لە ترسی تالان کردن حەفتا سەر مەر و مایینێکی هێنابوە لای ئێمە و زەحمەتی ئەویشمان لی زیاد ببوو. عەجەمێکی لای سەراغەمان بە نوکەر گرتبوو. گوێدرێژێکمان بۆ کری بوو لە کێوی گوێتیان بێنێ. رۆژێك عەجەم لە کوێتیان نە هاتەوە. وەدوای کەوتین و هەموو سندوس گەراین عەجەم ئێستانێ بەکەرەوە رۆیی و نە هاتەوە.

# بەشی چوارەم

## سەرەتای ژیانی سیاسی و شانازی

باری ئابووری و کۆمەڵایەتی کوردستان لە سەر و بەندی حکومەتی رەشی رەزاشادا لە رادە بەدەر شپرزە و کەلەلا بوو. بێجگە لە فشار و زوڵم وزۆری ژاندارمی دەوڵەتی بێکاری و هەژاری لە دێهاتی کوردستان پشتی خەڵکی شکاند بوو. ئامراز وکەل و پەلی جوت لە ئامور وگاسن تێ نەدەپەری. بە برەوترین حاسل و بەرو بووی وەرزێر و رەشایی گوندی توتن بوو. پتر لە هەشت ـ نۆ مانگ بەخاو وخێزانەوە پێیەوە خەریك دەبوون ئاخرەکەی یان وەبەرباران دەکەوت یان لە دوخانیە بە نمرە ٢و٣ دەنووسرا و یان دەکرا بە جیهەندەمی و دەعەمباری دەوڵەتی دەکرا. پاش ئەو هەموو کوێرەوەریە و بێنە وبەرە ئەگەر لە دەست ژاندارم و کارناسی قەبلاندن و قۆلە سەعموری دوخانیە رزگار بوو بایە دەکەوتە دەست ئاغا. ئیتر کابرای توتنچی نەیدەزانی توتنەکەی چەندی گرتوتەوە و چی بۆ ماوەتەوە. دەبوایە دەست بگرێتەوە ئەگەر ئاغا ویژدانی هەبوو شتێکی دایە بانە و دەنا دەبوایە لە شار خۆ لە دوکاندار و قەرز خواز بدزێتەوە و بە لا رەملی بڕوانێتەوە. نموونەیەکی ئەوتۆ لەگەل خۆم رووی داوە.

دراوسێکمان هەبوو کوڕێکی باش و زەحمەتکێش و کاسبکار. لە گۆرناوێ توتنی دەکرد ئەوساڵە توتنەکەی رەش هەڵگەرا بوو هیچی لێ پەیدا نەبوو. کاتێك لە دوخانیەی نەغەدە پوولی توتنمان وەرگرت. عەلی هیچی بۆ نەما بووە. گوتم با بچین کەباب بخۆین و بچینەوە. گوتی: "بە میرزا غەنی عەلیا لەی قەرزدارم و ئابڕوم دەبا."

رام کێشا بۆ نێو بازار و نانمان خوارد و تووشی میرزا غەنی عەلیالی بووین. دوای ماندوو نەبوونی کردن گوتی قەرزەکەت بۆ هێناوەتەوە؟. عەلی گوتی: "ئاغا میرزا غەنی لە توتن هیچم بۆ نەماوە. بەلام رۆژی بازار حەیوانێك دێنم دەفرۆشم و پولەکەت

بسوتێنم ". کابرا وەك سەگی هار بەگژی داچوو، زۆری قسە پێ گوت و نەنانەت جنێوی ناموسی پێ دا . عەلی هیچی نەگوت تا لە بازار دەرباز بووین و گە یشتینە تەپۆلکەی قەبران کە ئەودەم خانووی لێ نەبوون و چۆل بوو. میرزا غەنی وەدوای کابرای ـ کەوتبوو دەستی لێ هەڵ دەگرت. عەلی لە پڕ بایداوە سەر و دایگرت بە جنێوان . میرزا غەنی داپێواند و ملی حیز کرد وڕۆیشت.

گوتمان حیساب و دەراوی توتن ئاغا وەری دەگرت و هیچی نەدەدا بە وەرزێری فەقیر . بەلام بەو حالەش بێجگە لە هێندێ سەرەك عەشیرەت و دەرەبەگی دەولەمەند کە خوێنی خەلکیان مژی بوو ئاغا و دەرەبەگی کورد سوالیان لە سەگ دەکرد . من لە بەشی یەکەمی ئەم نوسراوەدا بە کورتی باسی ئاغاوەتی لاجانم کردوە. بەلام دوو نموونەی دیکەشم لە بیرە و بۆ باس کردن دەبن .

کاك عەولای ئاغای پردئاوی لە ناوچەی شنو سبەینان لە خەو هەلدەستا و دەچوو لە سەربانی هەمەر دەوك دەستی دەکەلەکە دەنا و چاوی دەگێرا تا جیرانێك پیالە ماستێکی بۆ بێنی و نانی پێ بخوا .

یەکی دیکەش عەولای بادینا وی پیرانان بوو. ئەم ئاغایە سێ تمەن بە سەید ـ عەولای قەلاتی قەرزدار بوو. ڕۆژێك لە ورمێ دەهاتەوە و سەید عەولا لە خانی تۆشی دەبێ . داوای پولەکەی لێ دەکا . دەلێ ئیستا نیمە وچووم دەدانم چاك کردوون و بۆت دەنێرم . سەید عەولا هەلی دەپێچی و دەلێ :" ددانەکانم دەیە"

لە هەل ومەرجێکی ئاوادا ڕێژیمی پەهلەوی ڕوخا . پلەی سیاسی خەلکیش سەر بوو. ئیتر بە ئاغا و رەعیەتەوە خەلك بۆ بووژانەوە و دەولەمەندی و پەیدا کردنی سەروەت ومال وەخۆ کەوتن . هەرچی سەرەك عەشیرەت و ئاغا و دەرەبەگ بوون دەستیان کرد بە تالان و ڕاووروت و خو فروشتن بە شەکروچا و نوکەری بۆ حکومەتی ڕزیو و نەماوی تاران و هەول دان بۆ هێنانەوەی حکومەت بو کوردستان .

ئەوی کاسب و زەحمەتکێشیش بوو بەشی زۆری دەستی کرد بە هاتووچووی عیراق و ئالۆ ویر لە گەل کوردستانی گەرمێن و لەم ڕێگایەوە خەلك دەهات بووژێتەوە .

عیل وعەشیرەتی کورد کە چەکدار بوون لە جیاتی بیریك لە چارە نووسی خۆ بکەنەوە و بۆ یەکیتی هەول بدەن لەشکریان لێك دەکرد و یەکتریان دەکوشت.

لە هەل ومەرجێکی ئاوادا لە مەهاباد ( سایلاخ ) ڕێکخراوی ( کومەلەی ژ.ك ) دامەزرا .

برادەریکم لە نغەدە هەبوو بە ناوی کاک ( حەمەدەمینی هیجری ) . بە هۆی مەلا حەمەدەمینەوە لەگەلی بیبوومە ئاشنا . دوستایەتیەکمان لە برادەری و دوستایەتی ئاسایی تێ پەریبوو . وەك دوو برای خۆشەویست و یەك مال لەبا نزیك بووین . لە تیزیك ئاشی قولیخان سەوزیخانیکی هەبوو بەهار و هاوین وپایز لە سەوزیخانە دەژیا وکاری دەکرد و زەحمەتی دەکیشا . زورجاران شەو لە نغەدە لای ئەو دەمامەوە . حەمەدەمین لە جاران پتر باسی یەکیتی و برایەتی وکوردی دەکرد و هێندی لە قسەکانی بو من تازە بوون . سالی پایزی بوو روژیك گوتی : نابێ شەو بچیمەوە کارم پێتە . پاشان گوتی : " بابچین دەسنویژ هەلگرین و دە چینە مزگەوت " . لەریگا گوتی : " کاریکم پێتە و دە بێ هەر لە لای خوت بێ . نابێ لە کن بابیشت باسی بکەی . لە تۆ رادەبینم و دەبێ بە قسەم بکەی " .

ـ ئەگەر بکرێ بە چاوان . لای کەسیش باسی ناکەم . خەیرە ئیشەلا . چیە بیلێ

دەسنویژمان هەلگرت و چووینە مالیك . کە چووینە ژور ( رەحمانی کوری میرزا کەریمی مەعروفی ) م لەوێ دیت . رەحمان باوکی لەرادە بەدەر فەقیر بوو . خوی دەستی لە خویندن هەلگرتبوو حیسابی بۆ دوکانداران دەنووسی . کوریکی بانو دەمناسی و نیوانمان خوش بوو . رەحمان بە خێر هاتنی کردم و بردمی بۆ ژوریکی تر . کورسیەك دانرا بوو وەم زانی خەلوزی تێدایە . جاجمیکی جوانی بەسەر دادرابوو .

هەر سیکمان دانیشتین و رەحمان گوتی با دەست پێ بکەین . جاجمەکەی لابرد . لە سەر مەجموعەیەك قورعانیك و شیریك و ئالایەك دانرا بوو . رەحمان دەستی پیکرد :

ـ دەزانی لە چەنگ ژاندارم چمان کیشا . دەبێ یەك بین و بۆ رزگاری کوردستان هەول بدەین . خەیانەت بە یەکتر نەکەین . کومەلەیەك دامەزراوە دەبێ ببینە ئەندام و بە قورعان و بە ئالای موقەددەسی کوردستان سویند بخوین کە نهینیەکانی کومەلە ئاشکرا ناکەین و بە گیان ومال بو بردنە پیشی ئامانجەکانی کومەلە تێدەکوشین . " .

کەوتمە ژیر تەئسیری قسەکانی و سوێندم خوارد و لە دەفتەر ناوم نوسرا و ئەندامی ١٨ کومەلە بووم لەناوچەی سندوس . کاتیك هاتمەوە مال باسی سەربەخویی کورد و ئازادی و یەکیتی م دەکرد بابم قسەکانی متی پێ سەیر بوو .

لە گوندی خومان دەستم پێ کرد ئەوەی توزیك تیگەیشتووگەنج و رەنگ پیاو بوو قسەم لە گەل کرد و کردمن بە ئەندامی کومەلە . دەستم کرد بە هاتوو چوو بۆ گوندەکانی

دەور وبەر. زور زوو کومیتەی نەغەدە (کەپاشان دەرکەوت ئینسانی ترسەنوک و بیکارە بون) و یەکیشیان لە کوری خەباتەدا نەمان) بوتیکوشان لە ناوچەی سندوی و شنو کردمی بە مەمور. کەمتر دەهاتمەوە مال و ئیتر کار و فیکرم تەبلیغات و تیکوشان بو کومەلە بوو. یەك دووجار سەفەری مەهابادم کرد و لەگەل دلشادی رەسولی و رەحمانی کەیانی و شاپەسندی کوئەبوومەوە. جاریك نامەیەکیان دامی بو کۆمیتەی نەغەدە. چووم لە مزگەوتی سور نویژی بکەم. دیتم مزگەوت چولە و تەنیا فەقی یەك دیتو دەمچی و دەوران دەکاتەوە. نامەکەم کردەوە لەچەترلا پەردا بوو خویندمەوە. نامەی رەسمی و موری کومەلەی پیوە بوو. فەقی لیم نیزیك ببووە و دیار بو لە بنەوە تەماشای کردوە و موری کومەلەی ناسیوە. پاش ماوەیەك کە چومەوە سابلاغ شاپەسندی پیی گوتم: " نامەی تو برد بووت لە مزگەوتی سور خویند راوەتەوە. زور پیی تیکچووم و گوتم راستە. لام وایە ئیتر ئەم کارە دووپات ناکریتەوە.

بوك هینان و شایی و زەماوەند

نەخوشیەکەی کاکم تا دەهات توند تر دەبوو. گوتیان ژنی بو بینن لە وانەیە تەئسیری هەبی. وەسیتی مامە رەشی وردە مالکیکی فرە پیاو وەدەولەمەندی گوندی - (پی بەجگ) کیژیکی پاك وجوانی هەبوو بومان خواست. چونکە ورمی جلی بوکیمان کری و بەهاری بومان گویزتەوە. لە تەواوی دوست و برادەر و ئاشنایانمان گیراوەو حەوت روژ شایی و زەماوەند و هەلپەرکی بوو. گشت خەلکی گوندی بە گەورەو بچووکەوە وەك برایەك بەشداریان لە شاییدا دەکرد. شایی بە خوشی کوژمرا و بوکمان هینا. ئەوەش بوە هومید یك بو باشتر بوونی کاکم.

من کەمتر خوم بە کار و کاسبیەوە ماندوو دەکرد. لە ناوچەی شنو ولاجان وسندوس خەریکی پروپاگاندە و تیکوشانی سیاسی بووم. ئەودەم دوکتور سمایلی ئەردەلان روژنامەیەکی لە تاران دەر دەکرد بە ناوی (کوهستان). روژنامەکەم دەکری و - زنجیرە وتاریکی تیدا بلاودەکراوە بەناوی (کورد و کوردستان سنە و ئەردەلان) بە وردی ئەو روژنامەم دەخویندەوە و سەرنجی رادەکیشام.

هەوەلین وتاری سیاسی

باشم لە بیر نیە . ئەوەندە دەزانم رۆژنامەی (كەیوان) چاپی ورمێ لە ئەو وەلامی ئەم شیعرەدا گە بلاو ببووە .

" زەمانی شادی وعەیشە لەغوصە ودەرد وغەم هەلدە
ئەگەر سەردی كەری كوردی لە ئاثاری عەجەم هەلدە "

وتاریكی توندی نوسیبوو . وتاری (كەیوان) لە نێو كور وكۆمەلی روناكبیرانی كوردا ببوە جێگای باس و خواسی رۆژ . لە زور ناوچەی كوردستان لە ولامی (كەیوان) دا وتار نوسرابوون . لە سندوس منیش لە وەلامی رۆژنامەی ناو براودا وتاریكم نوسی . كومیتەی كومەلە لە نغەدە ، وتارەكەی بە تایپ و رونیو بلاو كردەوە . رۆژێك كاك قاسم پیروتی ئاغای گردە قیت كە یەكێك لە خوێندەوار و ژیری ناوچە بوو لە نغەدە بانگی كردم و پیرۆز بایی لێ كردم . گوتی لە ورمێ ئەم وتارەی تۆ چاپ دەكەم . بلاو بوونەوەی ئەم وتارە لە نێو گەنج و لاوانی نغەدەدا لایەنگری زوری بو پەیدا كردم . لە لایەكی دیكەشەوە بوو بە هوی تەشویق و تێكوشانی پتری من لە خەباتدا .

لە گەل پەرەگرتنی رێكخراوەكانی كومەلە دەستەلاتی بەرێوە بەری كار وباری شار و شكایەت و لێ پرسینەوە دەكەوتە دەست كومیتەی نغەدە . بەلام ئەندامانی كومیتە زورەیان لەوكەسانە بوون كە لە كونەوە ملیان بو حاكمێتی قەرەپاپاخەكان راكێشابوو خویان بە پیاوی قولیخانی نغەدە دەزانی . عەجەمەكانی نغەدە نەیان دەویست مل بو دەستەلاتی كوردەكان رابكێشن . هەمیشە لە سەر حاكمێت لە شاری نغەدە لە نێوان كورد و قەرەپاپاخ كێشە بوو . پاشاخانی ئاختەولە و محمد تەقیخانی حەسەنلیان عەجەمەكانی نغەدەیان هان دەدا و دەیانویست قولیخان بكەنە حاكمی سندوس . كومیتەی نغەدە لە كۆبوونەوەیەكدا بریاری دا كە من بچمە شاری شنو و رووسەكان لە مەترسی پەلاماری قەرەپاپاخەكان بو سەر كوردان ئاگادار بكەم . ئەو دەم هێندی سالات و چەند ئەفسەری رووس لە شنو دەبوون . سوار بووم چوومە شنو . بەهەلكەوت شێخ سمایلی شنو ئەم شەوە میوانداریەكی گەورەی بو رووسەكان و ئاغاو پیاوماقولەكانی شنو ساز كرد بوو . ئەفسەری سیاسی ئوردووی سوور لە شنو ئازربایجانی بوو . بە درێژی قسەم لە گەل كرد . لەوەلامی قسەكانی مندا گوتی : " ئێوە دەبێ خوتان چەكدار كەن . دژی دەرەبەگەكان یەك بگرن . نەهێلن ئاغاكان سەر بەرز كەنەوە . ئەوان خزمەتی تاران دەكەن . بچووە . یەك بگرن و خو چەكدار كەن .

ئەوسەفەرەدا لەگەل شیخ عارفی کوری شیخ سمایل بوومە ئاشنا و دوستیکی نیزیک
کە پاشان باسی ئەو دێتە گوری .

لە گەرانەوەدا چوومە حەسەن نوران ماڵە هەمزەی سوارە. هەمزەی سوارە
ئاغایەکی بە زیبك و ئازا و زالمی ناسەمتان بوو. هەر لەو کاتەیدا خوی بە
کوردی ولات پاریزدەزانی . بەلام دیهاتی چوتری ورمیشی هەموو تالان کرد بوون .
لە گەل قەرە پەپاغان نیوانی نەبوو. حیسابیان لەسەر دەکرد . عەجەمان دەیانگوت
" هەمزئاغانن ئاتەشی گیلسە داهیچ " واتە ( سوارە هەمزاغا بین کار تەواوە ) .
هەمزئاغا گوتی " بەهەمووتواناوە بوپاریزگاری کوردەکانی نەغەدە ئامادەم . هەر
کاتیك ناسەی رەسمیم لیێ بنووسن بە خوم و لەشکرەوە دەگەمێ . ( دیارە بوتالان
ئەهات ) . کە هاتمەوە نەغەدە کومیتەی نەغەدە بریاری دا کە ( حەمەد ) ی کوری
هەمزەی سوارە بێنیتە نەغەدە و بیکا بە حاکم. هەرچەند من ئەندامی کومیتە نە
بووم بەلام نارەزایی خوم لەوبریارە راگەیا نەد و لە نیولاوەکاندا بلاوم دەکردەوە کە
کومیتەی نەغەدە ئاغایان بە سەر خەلك دا زال دەکا . من لە سەر قسەی رووسەکان
کە یەك دوو جار لە ریگا و لە ورمێ و لە شنویە لەگەلیان دوا بووم لە نیو لاوانی گوندی
و نەغەدەدا دژی راو ورووتی دەرەبەگەکان قسەم دەکرد .

## بەلای لا بە لا

گوتمان شیخ جەلالی دەربەند گورناویێ لە غولام رەزاخان بە ئیجارە گرتبوو .
پایزی سەیدیکی پیری کویری قوردماخی نارد بوە گورناوی و کرد بوویە کویخا . سەید
حەمەد دەیگوت لە ئی ماڵە شیخ کەمالیم و بەو بونەوە خوی بە شیخ و بە ئاغا و بە کویخا
دەزانی . دوو سێ سوفیی کەرپشی لە خوکو کرد بوونەوە . رو ژیك لە مزگەوت سەید
گوتی : " ئەوی ماڵە جوتبەندەیە دەبێ بو ئاوردووی زستان دوو بارە گوینیم بو بێنێ .
من گوتم ـ " چەند ساڵە بیگارمان نەکردوە و ئیستاش بیگار ناکەم .
ـ ئەگەر بیگار نەکەی دەبێ خانووم بو چول کەی و بروی .
ـ لە بەر سەیدایەتی ریزت لیێ دەگرم دەنا بە پیاوت نازانم و جوابیشت نادەمەوە .
هەستام وەدەر کەوتم . نامەیەکم بو غولام رەزاخان نووسی . غولام رەزاخان نامەی

بو شێخ جەلال نوسیبوو کە سەید لە گوڕناوی لابەری . سەید لێم بە قین دا چوو بوو دەستی کرد بوو بە شەیتانی و فیتنە بە تایبەت مالە مێرد و ماسوو خزمی ئەو ژنەی لێ تێژ کرد بووم کە لە قەرە قشلاخ میوانی بووم .

هەوەل مانگی زستانی بوو شێخ جەلال نامەی بو نوسیم کە بچمە ورمی . ئیوارەیەک لە نەغەدە دەهاتمەوە، پێش ئەوە بچمەوە مالی خومان لە مزگەوتلا مدا . خەلکێکی زور لە مزگەوت دانیشتبوون و سەید پێش لەوێ بوو . سلاوم کرد و پێلاوم دەرنەهینان لە سەر کورسیەکی پێش کورە دانیشتم . باسی کومەلە و تیکوشان و کورد و عەجەمی نەغەدەم بو خەلک دەگیراوە . برادەرێکم گوتی : " با سبەی بچینە میرئاوی کارێکم هەیە . پێم خوشە تو لەگەلم بێی " .

ـ ناتوانم چونکە شێخ جەلال نامەی بو نوسیوم و دەبێ بچمە ورمێ . خوم حازر دەکەم " . سەید هەلیدایە و گوتی : " من نازانم لێرە چکارەم . شێخ جەلال بو نامە بۆ من نانوسی ؟ . هەمووخەتای تۆیە دەتەوی بەدەر کردنم بدەی " .

ـ کارم بە تۆ نیە و تۆش کارت بە من نەدابێ . کە وام گوت سەید راست بووەوە و بە حرمەکانی ژنەکەی گوت : " کەلەگاییتان لێ دەکا بو راست نابنەوە " . ئیتر بە جارێک پێنج ـ شەش کەس راست بوونەوە . لەگەل هەستانی ئەوان ئەز رابووم و دەستم هاوێتە سەر چەخماخی تفەنگ و کشامەوە گوتم وەک سەگ دەتو تەقێنم . دەوروبەرای قادر خەنجێ کە زور برادەرمو یەک مال بووین لەپشتەوەرا لوولەی تفەنگەکەیان گرت و پاشەو شکێنیان کردم و تفەنگیان لە دەست دەرهێنام . دوو ماسی فاتمی ئامبازم بوون .

هەلم کێشا خەنجەر و داموەشاندە یەکیان هاواری لێ بلیندبوو لە سەر پشتێنەدی بە حاستەم گەیشتبوە سەر پەراسووی . خەنجەرێکی دیکەم داوەشاندە ئەوی دیکەیان دەستی وەبەر هێنا چوار قامکی هەلبرین . خوێن بە سەر بەرمالی مزگەوتیدا رژاو بوو بە هەرا . غارم دا سەید نەیانهێشت و لە مزگەوتیان وەدەر نام . لە نیو گوند بوو بە هەرا . لە بن دیوارێکی نەدیو راوەستام نەوەکوو پەلاماری مالمان بدەن . خەلک کو بوونەوە و بابم هاتە دەر و ئێکرا چوونەوە مزگەوت . لەم نیوەدا کوێم لێ بوو فاتم دەیگوت : " ئەو هەتیوە لوسکەی مەلا دوو کەلاکی لێ خستووین " .

ئەو بەریەوە کورناوی قازی مالە سوفی عەلی . ئەوێش کوێخای غولام رەزاخا بوو . کوری سوفی عەلیم نارد ئەسپ و تفەنگ و پالتو ولیباسی گەرمی بۆ هێنام و سوزی نسێی سوار بووم و بەرەو ورمێ کەوتمە رێ .

لە زینوی شیرواتشالیان کە پشتمە کاک ( هـەمزەی نەلوسی ) برای قمرەتپاغای ـ هـەشت سواری لەگەل بوون دەچـوە ورمـی . هاوڕێ بانی‌بوون و دەیانناسیم هـە تا گەیشتینە ورمـی پیکەوە بووین . کاك هـەمزە لە ریگا باسی شەری یەکەمـی دەگـیراوە کە لە گەل رووسان بە شەر هاتوون . برایەکیان بریندار بـوە هـەمزەی سوارەی هاویشتو بەتە سەرشان و بە جـۆری نە هیشتوە. هـەم شەری کردوە و هـەم هیناویە.

شیخ جـەلال تەنیکەی دوو مانگ لە ورمـێ رایکرتم . دەچـوینە مالـی غولا مرەزا خان و خـەلکی تر هاتو چـۆیان دەکرد و لە زور بارە وە چاوم دەکراوە و بیرم فراوانتر دە.و ئەو دەم تەنیا غولام رەزاخان رادیوی هـەبوو گوێی دەدایە و باسی شەری ستالین گرادی بۆ دەگیرایەنەوە .

مانگی رەشمەمە بوو لە ورمـێ گەرامـەوە . تا من هاتیمەوە بابم لەگەل مالە کابـرای مـەسەلەتی کرد بوو ، ٦٠ تمەن خوێنی قامکەکانـی دابوو. پاش‌چـەند روژ لەگەل کەیخودا و ریش‌سپی ئاوایـی چـوینە مالە کابرا و ئاشت‌بووینەوە .

## کارەساتـی پشت شکین

بەهاری سـالی ١٣٢٣ بەلایەکـی گەورەم بەسەر شان دا هات. ژیانم لێ تیك چو کاکم کە تاقە پشت و پەناو دانـیشارم بوو هـەر ئەو بوو کە دەرەتانـی سـەفەر و سەربەستی ـ ژیانیکی پاك و خاوینی بـۆ پیك هێنابووم و نەیدە هیشت کار بکەم و ماندوو هیلاك بـم کوچـی دوایـی کرد وشیانـی لی تیك دام. دایك و بابم زەبریکی قورسی گیانیان لـێ درا . خـەفەت و کەسەری دایك و بابم هـەر ئەوە نەبوو کە رۆلەیەکی جوان چاك و کاسب و خوشەویستیان لە کیس‌چـوە بەلکوو ئەوەش‌بیوە سەر بار کە من‌نازم لی شیواوە و بە تە نـیا ماومەوە. زەبریکی قـورسم وی کەوت. ەجاریك روحییەم تیك شکا . وەك گیژانم لێ هاتـبو دەستم بۆ هیچ نەدەچـوو. ناهـەق نەبووم . برایەکم لە کیس چـوبوو کە قەت‌جاریك لە جاران دەستی وبەر دەستی نە هینا بووم . نەیدە هیشت ماندووبم کاربکم. دەیویست کوك و پوشتە و پاك و خاوین بـوو بێمەوە . من برایەکـی ئاوام لە دەست‌چـوو بـوو .

دوای مانگیك مـەلاحمەدەمینی بورهانی و فـەقـی ئەحمەدی نەقـەدە و مـەلا مەعصوم و مـەلا سەعید ئەحمەدەدین و چـەند دوست و برادەری دیکە هاتن‌و لـە گەل

خوویان بردم بۆ دەربەند و شنۆ و حەوتوویەك گێڕامانم . زۆریان دڵخۆشی دامەوە و ئامۆژگاریان کردم کە تازە و داماون بۆ تووانایی . ماڵیکت بە ئەستوە بوە و ئەشێ وەخۆ کەوی جەنگەی کار وکاسبی لادێ بوو. کاردار وەگیر نەدەکەوت . ئامۆزا گەورەکەم پێشتر رۆیشتبوو بە جێی ی هێنشتبووین . کاتی ئاوداشتن و شەومرە بڕین و جێی توتن خۆش کردن بوو. دەبوایە خۆم لە کار هەڵکەم. بە شەو دەچووە جووت و تا چێشتەنگاو جووتم لێ دەخوری . بە رۆژ دەچووە ئاو داشتن . تێکۆشانی سیاسیم وەلا نابوو. دەست وبرادەری نەشەدە حەوتووی جارێك دەهاتن سەریان دەدام. جاروبار سوار دەبووم شانە کانی ڕێکخراوم بەسەر دەکردەوە. ماڵی خوێ و ئاوەدان و بە زەوقی ئیمە ئەمسی خەم و خەفەتی بە سەردا باری بوو. تاقە دڵخۆشیم هاتنی دەست وهاو ڕێیان بوو .

لە لایەکی تر لەو ساڵەدا دەغڵ و دانەکمان گرتبووی و دەغڵەکانی ئیمە لە گورناوی تاق بوون . ئەوساڵە دەغڵ گران بوو بە تایبەت لە ئازربایجان قاتی بوو. عەجەم بۆ سواڵ کردن روویان کردبوە کوردستان و برسی بوون . رۆژیك لە جووتی دەچووەوە توشی کوره جحێلێکی جوان چاکی عەجەم بووم ڕێگای داگرتبوو لە برسان لاکەی دەهات. لێم پرسی : "لە چی دەگەری ؟ خەڵکی کوێی ؟ ناوت چییە؟ .

ـ ناوم غولامە. خەڵکی شوشەوانم لە کارداری دەگەریم . لە تەوریز لە ماڵە ئەربابێك ـ خزمەتم کردوە . دەریان کردووم . دەمەوی کارداری بکەم ".

ـ چی دەزانی ؟ . جووت کردن ، ئەلەفان کێشان ئاوداشتن چ کارێك دەزانی ؟ .

ـ هیچ نازانم بەلام فێر دەبم .

لەگەل خۆم بردمەوە ماڵ و نان و چام دایە و گوتم لەلای من کار بکە. بەو شەرتە چیت پێ دەکەمین بیکەی . ". گوتی قوربانیشت دەبم. دەی ساڵێ چەندت دەمی ؟ . نازانم . قەرارم لەگەل کرد تا زستان چل تمەن پول و لیباسی بدەمی . لەگەل خۆم دەبردە جووتی و پاش چەند رۆژ فێر بوو ئەم جار بە تەنیا دەچوو. زەلامێکی بالا بەرز هاتبووە سەر خۆ فیری کاری ماڵ و سەحرا ببوو خۆشم دەویست. کاتی وینجە درون هات وغولام بوو بە مەلەغان کێشێکی گەورە و تا رادەیەکی زۆر حەساند بوومیەوە.

رۆژێك نیوەرو لە هەیوان نانمان دەخوارد عەجەمێك هاتە ژوور سواڵی دەکرد . بە ترکی گوتی لەرێی خوادا ستیکم دەنێ برسیمە . غولام کە سەری هەڵینا تێکچوو.

هەستا چوە ژوورێ . بابم گوتی بزانە غولام بۆ وای لێ هات؟، کە چوومە ژوور دەگریا .
ــ غولام ئەوە چییە بۆ دەگری ؟
ــ "ئەوە بابمە سوال دەکا . لە پار پاییزەوە ئاگامان لێکتر نییە . ئەم دەزانی چیان لێ
دەسەرێ . ئێستا ئەوە دەیبینم .
ئەوم وەرە هیچ نییە . بە خێراتێی بکە . من پارەیەتی دەدەم . غولامم هێناوە دەمرێ .
شانۆیەکی دڵ تەزێن . هەردووك دەستیان کرد بە گریان . دایك و بابیشم لە
گەڵ ئەوان دەستیان کرد بە گریان . عەجەمەمان دانا . نانی باشمان دایە . گوتی
" مندالەکانم لە نعفەدەمن . دایکم لە هەموو شت توریەی بۆ پر کرد . کابرا رۆیشت و ئەو
دوای چەند رۆژ غولام گوتی ئیجازە بدە بچم سەرێکی دایکم بدەم . دایکم زۆر شتی دا
یە و چووە نعفەدە . رۆژێکی تر بە عارەبە وینجەمان برد بوە نە غەدە غولام گوتی :
" با بە کن دایکم دا بچینەوە . کە چووین لە کونە کاولێکدا چەند تەلیسیان کرد بوو
بە سێبەر لە بنی دا کۆبونەوە . ژنێکی جوان بالا بەرز کولمە سوور لە گەل سێ کیژی منال و
یەکێ بۆگەیشتوو لە بن ئەم تەلیسانەدا دەژیان . زۆر تێکچووم، کزەم لە جەرگی هات.
ئەوەندەی تر هەستم بە چەپەلی نیزام کرد . هاتینەوە پاش چەند رۆژ غولام بە دایکی
گوتبوو " با میرزا کریم خوشکەکەم بێنێ حەیفە لە برسان دەمری ". بەلام لەوە خراپتر .
رۆژێك لە نعفەدە تووشی بابی غولام بووم سوالی دەکرد . سلاوی کرد و گوتی : ئاغا
بیر ئەرزم وار". واتە قسەیەکم هەیە . لاهوابوو شتێکی دەوێ .
ــ فەرموو مامە پێم بزانم چیت دەوێ ؟
ــ تۆ ژنت نییە . مالی من هی خۆتە . فەرموو با بچینەوە . دایکی غولام باش دەتوا
نی خزمەتت بکا . ئێستا جیگاشی هەیە .".
پێنج قرانم دایە و رۆیشتم . جارێکی دیکەش بیرم لە چارە نووسی ئەم هەژاوانە کردەوە
کە ناچارن لە برسان پیاو بەرنەوە مالی خۆیان .
رۆژێك لە نعفەدە دەگەرامەوە تووشی کوێجحیلێکی جوان چاك و رەنگ پیاو بووم
ریکای داگرتبوو بەرەو شنو دەرۆیشت . ماندوو نەبوونیم لێ کرد و پرسی : "خەلکی
کوێی ؟ "
ــ خەلکی گورناوێم .
ــ گورناوی مەلای هەیە؟

ـ نه خیر مەلای نیه .

ـ مەلای راناگرن ؟

ـ ئەگەر مەلای چاك بێ بۆ چی؟ . ئاغا جەنابت مەلا بی ؟ .

ـ من ئامۆزای شیخ حەسەنی غەوسابادم. لەم شیخانەی قولەرین . باوكم تەماوە . برایەكم لای شیخ حەسەنە و برایەكم لەگەل خەوسە. دایكم و دووخوشكم هەن. ئەگەر بگونجی لە گوندیك پیشنوێژی بۆ خەلك دەكەم و بانگ وەمەلا دەلێم و ئەركم زور هاسانە . خانویەكم دەوێ و هیچی تر.

ـ جاری با لەم گوندە بچین نان و چایەك بخوێن و بحەسێوە پاشان قسەی لێ دەكەین ، لەمالی ئیمە لامان‌دا و تەماشام كرد كوریكی قسە خوش‌تیگەیشتوو خویندەوار. خوّم لێی خوش‌كرد بیكەم بە كومەلە .

گوتم . " ئیرە مەلای نیە . بابم پێش‌نوێژیان بۆ دەكا . پیشتر بەراتیان دەدایە . ئیستا دوو سالە بەرات‌ونەناگرێ و پێش‌نوێژیشیان بوو دەكا . مالەكەت بێتە ئیرە . خانوش هەیە . ئیمەش دراوسێیەكی باش‌دەبین .

ـ كورە لە خولام دەوی . ئەگەر ئەوەی بكەی قەت‌لە بیرم ناچی . تو بلێی خەلك رازی بن .

ـ ئیوارە خەلك كوّ.كەمەوە و قسەیان لەگەل دەكەم و رازیش دەبن . بانگی كەیخودا كانم كرد و ناردمان مالە سەید برایم‌مان باركرد و هینامان . دوو‌برابوون زور فەقیر و هیچیان نەبوو. شیعری باشیان دەزانی و دەنگیان خوش‌بوو دەفەیان باش‌لێ دەدا دایكیكی فرە بەریز و ئینسان و باشیان هەبوو. دوخوشكیان هەبوون یەكیان بیوە ژن بوو میردی مردبوو هەتا بلێی جوان و شوخ و رەنگ زن و بە حورمەت. بەناوی " شونە" ئەوی دیكەشیان منداال بوو بەلام زور جوان . بەد بەختیان ئەوە بوو ئیدعای شیخایەتیان دەكرد، نوشتەیان دەنوسی ، دەچوونە سەر نەخوشان و ئەم كارە حیزانە . كاریان نەدەكرد . ئەو سالە فەعلەیی زور گران بوو . هیچیان نەبوو بەلام نەدەچوونە كار . بەشی زور هەر لە مالی ئیمە بوون و لە هەموو شت‌چاوەدێریمان دەكردن .

كوری قسە خوش‌و رەحمەت‌سوك پیاو لێیان بیزار نەدەبوو. دەرویشی فیر ببوون و هەرچی هەمیان با خوّیان و لەگەل میوان دەیانخوارد . خوشكیان زور جار لای دایكم باسی دەكردن كە تەمبەلن كار ناكەن .

دەغلەكانم گەیشتن و كاتی دروێنە بوو. بەكجار زور بوون و منیش بە تەنیا . غولام

فیری مەلعغان ببوو. بەتاوی یارمەتی و تەنیایی سەید برایم هاتدا کە بێ یارمە یم بدا . وای تەدەکرد کە هەست بکا کە هەمو کار دەکا . بەلام زیاتر لە فەعلە بوم حیلەب دەکرد و یارمەتیم دەدا .

## ئەحمەدی حاجی قادری هەریری

بیجگە لە سەید برایم کە یا رمەتی دەدام دیسان پیویستیم بە کاردار و یا فەعلە هەبوو. لە نەغەدە بە برادەرانم ئەسپارد بوو کە فەعلەم بۆ پەیدا کەن . رۆژیک چومە نەغەدە حەمەد مینی هیجری گوتی . "چاك بورهاتی . ئەحمەدی کوری حاجی قادرم بو گرتووی و ئەورۆ بوم دەهیناى . حاجی قادری هەریری گەورەترین دەولەمەندی کوردی نەغەدە بوو . ئەو کورەی دەرکرد بوو دەسوراوە . ئەحمەد مان دیتەوە و قەرارم لەگەل کرد رۆژی بە چوار تمەن بێ دەرمغ بکا . پیشەکی . ەتمەنی لی وەرگرتم و رەگەلم کەوت . ئەحمەد دەرۆژ کاری کرد و رۆژیك کە هەستاین بو سەر کار بچین نەمابوو. ماوەیەك بێ چوو رۆژیك لە نەغەدە لە گەل چەند برادەران دەخولاسەوە توشی ئەحمەد بووم . گوتم ئەحمەد تو دەتمەنت لە کە. یاوەرە کارم بویکە یا پولەکەم بدەوە . هەر وەك سەگی دەربەکەم داهات . "کرمانج، فەعلە پشمان پێ دەکا و لە نێو بازار ئابروشمان دەبا . داوای شەرەف دەکەم". گوتم . "هەتیوە ئەگەر شەرەفت هەبایە کارەکەت تەواو دەکرد و خوت نەدەشاردەوە. ئیستا تاوانبارهیشم دەکەی ؟".

ـ دەست هەلناگرم شەرەفی منت شکاندوە . لەبازار بروام پێ ناکەن ".

ئیتر ئاگرم گرت . لێی گەرامەوە تا هیزم تیدابوو زللیکم لیدا . ئەوە لە جیاتی پێنج تمەن، باشان حیسابت لە گەل دەکەم .

ئەحمەد وەدوام کەوتبو دەیگوت لە جیاتی ئەمزللەیە دەبێ پێنج تمەنم بدەیەی . کورەکان گالتەیان پێ دەکرد و دەیانگوت هەقتە دەبێ پێنج تمەنت بداتی . ناچار چوومە دوکانی حاجی قادر و گوتم حاجی تۆ ئەو کورەت بو شلتاخ بەرەلا کردوە . عەیب ناکەن . میرزا عەولای کوری هات دەوسی شەقی لیدا و دەتمەنەی من تیدا چوو.

سیخ عارفی کوری شیخ سمایلی شنویە

بە هۆی سەفەری شنو وچەند جار یەکتر دیتن لە گەل شیخ مارف ببووینە ئاشنا . رۆژێك تەماشام کرد لە جەنگەی گەرمای هاوین دا سوارێك لە دەرگی دابەزی . کە دەرکەوتم شیخ مارف بوو . ولاخم لێ وەرگرت و بەخیر هاتنیکی گەرم و میوانداری و کەلێك باسی تیکۆشانی سیاسیمان کرد و پاشان گوتی : " من گیر نایم . کارێکم هەبوو لام دا . لامو ایە بۆ برای خوت دەریخی ناکەی .

ــ فەرموو . لە دەستم بێ بە چاوان .

ــ مالە ئەو سەیدەی لیرەن خوشکێکیان هەیە . ئەوە ژنی سەید کەریمی دنخە بووە . پێم خوشە بزانم میردم پێ دەکا ؟

ــ جا بنێرە سەری . بیوە ژنە و ئازادە . برایەکانی کوری باشن و لام وایە خزمایە تمی جەنابتیان پێ خوش دەبی .

ــ نا ئەوانە بۆ خزم نابن . پولیان بەدەیەی هەموو شت دەکەن . من ژنەکەم پیویستە کەریم حالی دەبی ؟ . پێم خوشە بەدوینی . چەند رۆژی تر پیاو دەنیرم وەلامم بۆ بنووسەوە .

بەلێم تحویل دا و دە شیخ مارف گەیشتم . لەگەل شیخەکانی غەوسابات نیوانیان ــ نەبوو. دەیویست بە سەید زادە شوشە فیر بێ و بیکاتە قومرغانە . کاریشی هەر ئەوە بو.

رۆژێك ( شوشە ) بە تەنیا هاتە مالی ئیمە . گوتم : " دەزانی شیخ مارف لە سیرە بو لە ئیوە شی دەپرسی ؟ " .

ــ ئەو کونیە لە چی دەگەرا؟ .

چون شتی وا دەلێی ؟ ئەو منی راسپارد بیێت بلیم شوی پێ بکەی .

چاوێکی بە مانای لی کردم . گوتی : " وا لە تۆ رانەدەدی . پێم وابوو بۆ خوتم پێ دەلێی . هەزار کەرەت لەو پیاو تری . تو ئەو خویریە نا ناسی . هەر لە سوك کردن دەگەرێ . نازانم بۆچی ئو بە من رازی نی ؟ " .

ولامەکەی تاوێك ماتی کردم . گوتم : " راستی ئەوەیە تو ژنیکی یازنە لە قول و دەست و پێ سی و کارت نەکردوە . منیش وەرزیریك شەوورۆژ کار دەکەم . ژنی من دەبی نیوە شەو هەستی هەویر بکا و تەندور وئاوران سازبکا و نانی بکا و بچیتە سەرزایە .

گوتی : " یازنەکانم لە سەر بەرد ورد و خاش دەکەم . دەیمە قەرەواشی دایك و بابت . لەو روژەوە لە گەل سەید زادە شوشە ئاخافتن و هەستان و دانیشتنمان جورێکی دیکە بوو . بەلام قسەت لە خوشە ویستیەکی پاك و بە ئابروانە تێ نە پەری .

سەروازی کشتوکاڵ و کاسبی خۆم ئەو ساڵە لە گوندی ( ئاڵی ملك ) رەز-
یکێنم بە ئیجارە گرتبوو کابرایەکی خەڵقیوم لە سەر دانا بوو بیفرۆشی . جار وبار ئێواران
دەچووە ئاڵی ملك و لە مێشە و دارستانەکە راوە کۆترم دەکرد . رۆژێك کابرای لە سەر
باخم دانا بوو لەگەڵ عەجەمێکی جیرانی بەشەر هات و عەجەم سەری شکا . کە خوێنی
بینی هاواری کرد و لە باخەکانی دەور وبەر و لە گوندی را دەپاژدەکەس بە چەوەخە
وە رویان کردە کەپرەکەی ئێمە . لە سەندوس خانووی دوو تەبەقە لە سەر باخ دروست دە-
کەن و پێی دەڵێن ( کولەباخ ) . دیتم لە خواری بین دەرەقەتیان نایەین . چووینە
سەر کولە و پێژەمان هەڵکێشا و لێ گەڕاین تا وەنیزیك کەوتن . لە پر دەنگم دان و ناپر-
یکم دەمپال کردن . بو بە یا حەیسەن و هەر یەکە بە لایەکدا تێی تەقاند . خولا وەنحە
سینی هەتا پایز ترێ خەلاس بوو جیرانەتیمان زۆر خۆش بوو .

## باپیرئاغای سوفیانی .

ئەو ساڵە غولام رەزاخان گوندەکەی بە باپیرئاغای قادری کوری مام وسینی سوفیانی
ئەم بارە بوو یا بە ئیجارەی دابوو . لە جەنگەی گیرەو جەنجەر و خرمان کوکردنەوەدا _
رۆژێ باپیرئاغا هاتە گورناوی . رعیەتەکانی کۆکردەوە و گوتی : هەر چی جوتبە-
ندە بە دەبێ لە شنویەرا عارەبەدارێکم بۆ بەریەتەوە سوفیانی . خەڵکەکە هیچی نەگوت و
نەشیان دەتوانی هیچ بڵێن . سیستمی دەرەبەگایەتی و رعیەت بێ سەروزمان بوو .
گوتم : " باپیرئاغا هەموو دەزانن من لێرە لە بیگار تەرخان بووم . لام وایە تۆش
بیگار بە مە ناکەی " .
باپیرئاغا گوتی : " من شوانی شیریم شوانی بەرەکەت نیم " . بیگاری نەکەی دەبێ بڕۆی .
سبەی خەڵکیان دەنگدا بچن لە شنویە را دار بهێننەوە لاجان . من گوتم ناچم و دەڕۆم .
غولام رەزاخان هاوین هاتبووە چیانە . چووم لای یەم گوت باپیرئاغا جوابی کردووم "
گوتی : " وەرە گورناوی قازی . لەوێ خانوو هەیە . "
هەر چەند دراوسێ و دۆست وبرادەر گوتیان وەختی ماڵ بارکردن نیە و ماڵ ویران
دەبی گوتم بیگار ناکەم و ناچمە ژێر بار . ماڵەکەم گوێزتەوە بۆ گورناوی قازی . خرمانەکانی
گورناوی ئەو ساڵە لە سەر جوگەی چیانە و لەگەڵ گورناوی قازی ئە یەر موبەر بوون .
درباس و دەغل و دانمان کۆکردەوە و دەبوایە جێگایەك بدۆزینەوە ماڵەکەمانی بەرینی .

بابم سوار بوو وەدواى جێگا کەوت. لە شەریفەدین لە لاى (حامید ئاغاى) قەرەپەپاخ جێگاى دیتبووە. دەغل و دانمان کۆکردەوە و بارمان کرد چووینە شەریفەدین .
چەلتوکمان ما بوو من بۆدروینەى چەلتوك وکیژە و کۆکردنەوەى پتر لە کورناوى دەبووم و لە مالى سەید برایم دەبووم کە وەك مالى خوم وابوو. روژ بە روژ لە گەل (شوشە) پیوەندیمان قایمتر دەبوو. غولام رەزاخان کە زانى بارم کردوە لە دواى ناردم و گوتى "تۆ دەبێ بیبیەوە لاى خوم . ئەوسال گاو وەرینجە و تفاق هەر چى هەتە بیبە .
ئەوە پارسەتیەکى باش بوو هەر لەوکاتەش دا دژى باپیرئاغا بوو. لە کومیتەى نەغەدە دەرکردن و زەرەر و زیانى خستن باس کرد . بەلام نە دەستەلاتى نەواند و نە کومەلە سیاسەتى ئەوە بوو کە دژى دەرەبەگان لە سەر زەحمەتکیشان وەدەنگ بێ .
شەریفەدین گوند یك بوو لە نیزیك راد انە . گوند یکى قشلاخ و خاوەن ئاو ولەوەر بۆجوت وگا نەدەبوو. شەش حەوت مالى لێ بوون تەنیا کاسبى و مانگایان دەلەوەراند و کاسبى دیکەى نەبوو. یەك دوو پەلە زەویان بە ئیمە نیشان دابوو پایزى چاندمان و ئیتر بیکار مامەوە . تەنیا چاکەى شەریفەدین ئەوە بوو مەلا رەسووى عەباسى براى مەلا عەولاى زەلیلان کە لە دەست مامەشان (حاجى عەولاى قەلاتان) راى کرد بوو مالى هاتبوە ئەم گوندە و جیرانیکى باش و هاودەنگیکى باشى بابم بوو. خاسیەتیکى دیکەى ئەوە بوو ( کاك ئەحمەدى براى شیخ حەسەنى غەوساباد ) مالى لە وى بوو دووژنى هەبوون . خوى دەروى بۆ نیو دەرویشان و من ناچار وەك ن دراوسى دەبوایە هاتووچویان بکەم و هیندى حاجەتى مالیان بە سازبنم.
بەلام حامید ئاغا . بە عومرى خوى قسەى راستى بەسەرزماندا نەدەهات . کابرایەکى زەلام درو زن ترسەنوك . ( دەیانگوت لە دوخانیەى سابلاغ سەنگور بە کینە دێن و لیك هەلدەکیشنە دەمانچیان. حامید ئاغا لەوێ دەبێ هەلدێ و بە سەر تا توتنان دا دەکەوێ . یەکى سەنگور دەلى : "دەلیم دەدایەت نیم حامید ئاغا لەتسى کن سێ حامید ئاغاى تسێ دەبن ) .
من هەر لەساردى پایزەوە بیکار بووم . پتر دەچومە نەغەدە و لە مالى مەلا سەمەدەمین یا فەقى ئەحمەد و یا حەمەدەمینى هیجرى دەبووم. کومەلە دەهات تەشکیلاتى ئیدارى دابمەزرینى و دەستەلات بنوینى . بەلام بەرپرسانى کومیتەى نەغەدە ئەرتەسە نە بوون کە شایانى ئەم کارە بوون . میرزا برایمى ئیندرقاشى لە لایەن کومیتەى نەغەدەوە کرا بوو بە بەرپرسى ئەمنیەتى شار . چایخانەى هەبوو خوێنى

نه خـــویند ەوار بوو. چاپخانەکەی سـەکۆی ئەندامانی کومـەلە بوو. لەبەر ئەوە کە دەستی دەرویشت زوربەی کوبوونەوەکانــی کومـەلە لەمالی ئەو دەبەستران.

من لە گەلّ هێندێ لە لاوەکان لە دێهات دەستمان‌کرد بە پیك هێنانی دەستەی نیزامــی لاوان. کوردێکی کوردستانی ئەودیو بە ناوی ( مـەلا سەلام ) هاتبوە ئەم دیوە و لە گوندی ئارنە ببوە مـەلا. کوریکی قوچاغ، دلسوز، نیشتمان پەروەر، پۆلی نیزامـی لاوانی لە گوندەکانــی قەلاتان و ئارنە و دێلانچــەرخ و حەلبوکویك و هی تر پیك هێنا بوو. پیوەندی ئەوکومیتانەی لاوان بە منە وە بوو. کومیتەی نغـەدەش‌لە ریگای منەوە پیوەندی پێوە دەگرتن. لەسەر بە دەست‌گرتنی حکومەت‌لە شاری نغـەدە، ناکوکـی لە نیوان کورد و قـەرەپەپاخـەکان روژ بەروژ زیاتر دەبوو. ناچار دەبـوایە هیز نیشان ـ بدرێ. بریار درا لە سابلاخــەوە هیندێ چـەکدار بین. لەسەرانسەری سندوس بــە خـەلکمان راگەیاند کە هـەرچی سوارە و چـەکـی هـەیە تاوهـەل نەبە بگاتە نغـەدە. ئەو روژەی دیاری کرا بوو میرزا وسینی فروهەر بە جلی نیزامی ئەفسەریەوە لە سابلاخــەوە ـ گەیشتی. نیزیکەی ٥٠٥ سواری کورد بە چـەکەوە بە ریز و نەزمیکی تایبە تـی کە دووـ کەس بە ناوی ( مرادی ئایشەخالە و کەریم‌گاشان ) رێبەریان دەکردن، گەیشتنە نغـەدە و نیشان دانــی هیزیکی گەورە بوو. میرزا وسین بە دریژی قسە ی کرد و کوبوونەوە بلاوەی کرد. بەلام ئیتر مـەسـەلەی دەستەلات‌لە سندوس بەجاریك چارە سەر کرا.

لە بەهاردا کومیتەی نغـەدە بە بونەی لەدایك بوونــی ستالین بریاری دا جیژن بگری و ئەفسەری روسیش‌کە هاتبوونە نغـەدە بانگیان بکا. کومیتە بریاری دا کە من وتار بدەم. مـەوولینجار بوو لە کۆبوونەوەیەکـی وا گەورەدا قسەم دەکرد. سوفی سەعید و سوفـی سالح دوو برای کوردی دلسوز ونیشتمانپەروەر بوون. مریدی شیخ عـەبدولقادری نەهری بوون و هـەر بەو بونەوە بۆ کوردایەتــی سوتا بوون. بە هـەردووکیان وینەیەکـی گەورەی ستالیں یان هـەلگرتبوو لە پیش‌خـەلك دا دەرویشتن تا گەیشتنە دەوخانیە کـــە مزلـی رووسەکان بوو. ئەوانیش‌هاتندەر و میتینگ دەست پیکرا و من چـوومـە سەر کورسی وتاریکی پیشتر ئامادەم کرد بوو بە راشکاوی خوێندەوە. وتارەکە برادەریك بە ترکی وەری دەگیراوە.

زستانـێ لە شەریفەدین دەخلەکانمان دەریان هاویشت بوو هیچیان‌لـێ تێنین نەبوو. بە ناچار هـەر بەو دەخل و دانە یەرێ دەچــووین کە لە گورناوی هێنا بوومان.

لە بەهاردا بیکار بووم. لە بیگار و ژیر دەستەلاتــی دەرەبەگانیش‌بیزار ببوم و نەم دەویست

بچمه گوندیك كه تونی بیگاری ئاغا و ژێر دەستی بم . له شەریفەدەین كەس كاری پێمان نه بوو. حامید ئاغا مانگی جاریك دەهات نانێكی دەخــوارد و دەڕۆی . حاسلی ئــەم گوندە بۆحامید ئاغا بریك گیا و مالیاتیك بوو لەو ولاخانەی دەستاند كه خەلكی راد انه لێ یان دەلەوەراند . سەرەتای بەهار بوو ویستم لە مەحال سەرێكی مالــی مامم بــدەم. ئیوارە دەرنگ گەیشتمە سابلاخ . ولاخم لە كاروانسەرایەك بەستەوەو هاتمە شەقام. لــە پڕ تونی كێخا عــەولای برازای كوێخا ســەروز بووم . پاش ئەوە مەسەلەمان كرد بوو هەموەل جار بوو یەكترمان دەبینی .

كوێخا كه چاوی بە من كەوت ئامبازم بوو یەكترمان ماچ كرد وگوتــی : " تەلاقم كەوی لە تۆدەگەرام . وەرە با برۆین . ".

ــ بــو كوێ راوەستە كارم هــەیە .

ــ كارومار نازانم . لێرە پێوە بووم و كەسم نیه . وەرە با برۆین .

چوینە مزلی كوێخا . نانمان خوارد و هیندێ وەرەقــەی دەرخانیەی هینان. گوتــی :

" دەوومانگه لە سەر پولــی ئەوەندە توتنە مــەحتەلم. ئیستا دەلێن پول هاتوه و لــــە میاندوا دەیدەن . بێم لیك دەوە چــەندە و لە گەلم وەرە میاندوا پولەكە وەر سرم ".

ــ من بە سواریم و ئەسپەكەم لە كاروانسەرا قرەدەبــێ .

ــ ئیستا دەنیرم بیهێننە كن ولاخــەكانی ئیمه .

عیلاج نەبوو. شەو تەماشای وەرەقەكانم كرد و كۆم كردنه وه هــەمووی نیزیكەی دوو هــەزار تمەن دەبوو. وەرەقەیەكیان لە نیو بوو تەنیا بە سیفر ( ٢٤٠ ) نووسرابوو. پاش لێی ورد بومــەوە بە حــەرف نه نوسرابوو. ئەم ژمارەیە لە ئاقــە نوختەیەك دەبوو بـــە ( ٢٤٠٠ ) . دەوسەد و شازدەتمەنی زیاد دەكرد . بە كوێخا عــەولام گوت ئەم وەرەقــە ئاوایە. بانوختەیەكی بۆدانیم و ( ٢١٦ ) تمەن زیاد بكا. كەس بەكەس نیه .

كوێخا گوتــی . " كاكه لێ گەری. مال ویرانم مــەكە . ئەوی دەیكەشم لە كیەر دەچــی .

بریكمان قسە كرد ( گوتــی باشە . نوختەی بۆدانی . دەهات قەلەمــی بۆ بەرم دەستی دەگرتم . كاكه لێ گەری مال ویران دەبم . بە قــەی كوێخا عــەولام نەكرد و سیفریكم لێ زیادكرد . بەیانی چــوینە میاندوا. كه گەیشتینی حیسابدار پولی دەهینا بو سابلاخ چــەند ئاغای دیكەش چاوە روانیان دەكرد . كوێخا تفەنگەكەی دا بەمن و لە گەل ئە وان خۆی دە ماشین ئاخنی . پاش ماوەیەك سواری ماشینێكی رووسان بووم چــوومەوە سابلاخ كه چــوم كوێخا عــەولا لە دوكانــی حاجــی عــەولای چــەلەبی دانیشتبوو.

که چاوی بەن کەوت هەستا و هاتە دەرکوتی . "دەرم هینا". با بچین نان بخۆین نانمان خوارد وکوتی . "با بچین کەواوپاتولیکت بۆ بکرم".

ـ کەوا و پاتولم هەیە . پولە زیادیەکە بێنە بەش‌کەین .

ـ ئەوە رووت کردنە . پولی خۆمە و دوومانگە لە سەری دەحەتەلم.

ـ من پولی تۆم ناوی . ئەوەی زیادم کردوە تیوەم دەوی . پاش‌چەقەیەکی زور ١١٠ تمەنم لە کویخا عەولا ئەستاند وچووم بارگیەم زین کرد و چووەوە مالە مام. دوای چەند رۆژ بومالی گەرامەوە.

## ئیجارەی باخی تری

لە شەریفەدین هیچ کار و کاسبیم نەبوو. رۆژیک حەمەدەمینی هیجری ؟ رتی "کوندی ( میهماندار) باخیکی ترێی باشی لی یە. با بە ئیجارەی بگرین. ملکی میرزا رەحمەتی شافیعیە . رۆژیک چووین تەماشای رەزەکەمان کرد بەریکی باشی هەبوو. بریارمان دا بچم لە مام بازیدی خانچی تویەری میرزا رەحمەت لە تازە قەلا بە ئیجا رەی بگرم . خەبەرمزانی میرزا رەحمەت هاتوتە تازە قەلا . میرزا رەحمەت‌گوندەکانی خۆی بە رەسول‌ئاغای کوری کاك حەمەدی مەمیندی ئەسپارد بوو. ( ئەمە راست ئەو پروسەیەبوو لە کوردستان کە لە ولاتەکانی تریش‌لە کاتی ریشە داکوتانی سەرمایەداری دا بەرژوازی شار بۆ پاراستنی سەروەت‌و سەرمایەکەی لە گەل دەرەبەگی‌گوندی خزمایەتی دە گرد و پیوەندی بە تین دەکرد . بونموونە زور لە ساباخیان کچیان دەدا بە دەرەبەگەکان و یان ژنیان لی دەخواستن ) .

کاتیك چووە تازە قەلا میرزا رەحمەت و رەسولاغا لەوێ بوون . میرزا رەحمەت نەی دەناسیم بەلام رەسولاغاوەم بازید باشیان دەناسیم . دوای بە خیر هینان مام بازید پرسی . "خیرە شوکر ئەوە چونە ریت‌خەلەت کردوە؟".

ـ بیستم ئاغا لێرە یە و هاتووم باخەکەی میهماندار بە ئیجارە بگرم. خۆت دەزانی لە شەریفەدین هیچ کاسبی نیە و بیکارم . حەمەدەمینی سەوزەچی لە نغەدە شەریکم دەبی".

میرزا رەحمەت‌گوتی . بە چەند بە ئیجارەی دەگری ؟

ـ نازانم ئاغا . چەند باشە ئەوەندە . دەمانەوی قازانجی لی بکەین .

مام بازید گوتی : "هەزار تمەن چاکە ؟".

ــ هەزار تمەن زورە . حەوت سەد تمەن باشە .

ــ میرزا رەحمەت گوتی : "باشە بیدەنێ .

مام بازید گوتی ئیجارە نامە بنووسە و بنێرە سەری .

میرزا رەحمەت گوتی : "ئیجارە نامەی ناوێ . بچنە سەری و بە ساحیبی کەن .

چووینەوە نغەدە و لەگەل حەمەد ەمین چووینە میهماندار . خەلك دەیان گوت ئەو باخە قەت هیچی لێ پەیدا نە بوە . باخەوانێکی عەجەمی لەسەر بوو گوتی : "باخەوانی من بدەن دەمروم . دەبوایە پێنج یەکێك ( واتە سەد و بیست تمەن ) باخەوانی بدەمێ . گوتمان : مێ لە سەر باخی بێ و چەندی لێ پەیدا بوو باخەوانی خوت هەلگرە . عەجەم بە ئیجبار لە سەر باخ مایەوە . هاوین لە گەل حەمەد ەمین هاتینە سەر باخ . بەلام باغ بەریکی گرتبوو کە س شتی وای نەدیبوو. ئەم جار ئێمە دەمانویست باخەوان بروا باخی بە جێ نەدەهیشت. کیژێکی جوان ولە بار رەند الکاری هەمبوو دایکی نەمابو لەگەل کوریکی چکولە هێنا بوویە باخ لەوێ دەژیان . لەگەل کچەکەی دەستبازی و گالتەم دەکرد . مەشەدی ترسی ریکەوت کە کیژەکەی فریو بدەم . روژیك گوتی من لیرە نابم چەندم دەدەنێ رازیم و دەمروم . سەد و ٢٠ تمەنمان دایە و باخی بە جێ هێشت . هاوینی ئەوساله لە سەر باخ زور خوشم رابوارد . لەنغەدە دوست وبرادەر دەهاتن و لە نێو گوندی دەسوراینەوە . جارو بار سەریکی مالێم دەداوە و دەمنا لە کولەی باخی رام دەبوارد . حەمەد ەمین نەی دەهێشت کار بکەم . هەموو روژی دووبار تریێ لی دەکردەوە و دەیبردە بازار . باخەکە بەری ئەوەندەزور بوو ناچار بووین بیکەینە کشمیش. زوریشمان دا یەوتی بوّ زستان . بە کورتی پاش هەموو شت حەوت سەد تمەنی قازانج کرد .

ئەوساله عارەبەیەکم لە عەجەمێکی فەرخوزادی کریبوو سێ تمەنی لە سەرم ما بوو. نیوانی فەرخوزاد و میهماندار سەعاتە رێیەك پترە . هەموو روژی ریگای دا دەگرت و دەهاتە میهماندار . لە ریگا پیلاوەکانی دادەکەند و بە پێ خواسی دەروی . کە دەگەیشتە نیزیك کولەی باخی لاقی لە ئاوەردەدا و کەوشەکانی دەکردە پێ و ئیمە لە سەرکولە دەمان بینی . حەمەد ەمین دەیگوت : "مەشەدی هات".

مەشەدی دەگەیشتی : "سەلام عەلیکوم". بالا مشەهدی نە خیر بێ . توزیك دادەنیشت

دەمگوت ." ممنندی ببەخشە ئیستا هیچ پولم بەدەستەوە نیە بوّت دنیرم." .
ـ قەی نا کا خوا بە زیادی کا . دەرویشت . سی مانگەی هاوین ئەوە سەیری ئیمەو مەشهەدی بوو .
ئەوساله بارزانیەکان هاتبوونە کوردستانی ئیران و بەسەرگوندەکانیاندا بریبون . ١٣ مالیان نارد بوە میهماندار . هـەموو روژی دەهاتنە باخ و تریّمان دەدانی بوّ مندا لە کانیشیان بەرنەوە .

## دیسان بیگاری دەرەبەگان

من لە گورناوی بارم کرد بوو زیانیکی زورم لیّ کەوتبوو تەنیا لە بەر ئەوە کە بیگار بو ئاغا نەکەم . لە شەریفەدین هـەر چەند جیگای کاسبی و کشتوکال نەبوو بەلام ـ ئەوەندەبوو ئاغا کاری بەکەس نەبوو دەکرا پیاو بە ئازادی بژی . ئەوساله حامید ئاغا چوو بوو شەریفەدینی دابوو بە ئیجارە بە رەسووی قـەلاتان کوری قادری پیروت‌ئاغا .
رەسوئاغا و پیروت‌ئاغا دوو برابوون لە قـەلاتانـی کن گردە قیتی خـویان بە دەرەبەگ دەزانـی و هاتبوون شەریفەدینیان بە ئیجارە گرتبوو. هـەموو روژ سوار دەبوون دەهاتن لەوی دادەبەزین . داهاتی شەریفەدین تەنیا ئەو پولە بوو کە بوّلەوەرانەنی مالات لە خـەلکی رادانە و ضرخوزاد دەستینرا . قازانجیکی دیکەشی ئەوە بوو کە بیگاریان بە رەعیەتەکان دەکرد .
لە شارویران و سندوس لە نیو دیهوکریان ئەودابە گلاوە هـەبوو پایزان جوتبەندە یان دەنارد لە (پایین) نیزیك شوشەوان، مالیّ عارەبەداریك بو سوتەمەنـی ئاغا بینن ، جاری واهـەبوو دوو کەرەتیان پـیّ دەکردن . ریگای دووشەوورۆژ زور جار کەلی جوتی لە ریگا بە هیلاك دەچـوو. بەلام هـەر چـونـی بوایە دەبوو سوتەمەنـی ئاغا دابین بیّ و زستان سەرمای نەبـیّ .
رەسول‌ئاغای قـەلاتانیش پایز لە سەری کردبین کە دەبـی بچن لە (پایین) مالی عارەبەیەك دارم بوّ بینن . حـەوت مالی جوت بەندە بـووین ناچار بووم بچم ریگای سیّ روژان داری سوتاندن بوّ ئاغا بینم . پایزدرنگ‌بوو . نە دەکرا بو هیـچ کوی بار بکەم و بروّم . ئەوەندە بوو بریارم دابوو ئیتر لە ژیر دەستەلاتی دەرەبەگ دانەنیشم .
زستانی شەریفەدین ئەوساله زور ناخوش‌گوزەرا . لە مانگی بەفرانبار دابوو مـەلا سەید

عەلی ئالیاوی و مەلا مەعصوم و مەلا بابە ویسی و چەند مەلای دیکە میوانمان بوون چەند روژ لەوێ بوون وپاشان بریارمان دا بچینە سابلاخ . لە قاوە خانەی کوسەکەریز ـ زور مەحتەل بووین ماشین نەهات . سەعات دەی شەو بوو لوریەك هات سواری کردین و نیوە شەوە گەیشتینە سابلاخ . لە میوانخانە جیگامان وەگیر نەکەوت. گوتیان با بچینە خانەقای تەویلە و سوفی ئەحمەد دەناسین ، شەو کەرمە لەوێ دەمخەوین . فیکری چاك بوو. چوینە خانەقا وبانگی سوفی مان کرد جواب نە بوو. سەرما، دەلەرزین . لە بر مەلا مەعصوم گوتی بکشینەوە و دەنك مەکەن . چوە پشت دەرگا ( بانگی کرد : " سوفی سوفی دەرگا بکەوە ئەو مەیتە بێنینە ژور . حاجی . . . عەمری خوای کردوە ." کورج دەرگاکراوە و مەلا خویان دەژووێ راکرد . بریکیان قسە بە سوفی گوت و شەو لە خانەقا لیی نوستین . بە یانی مەلا سەید هاشم هات و چوین لە مالی ئەو نان و چامان خوارد .

## لە دیهاتەوە بو شار

هەر لە زستان دا بریارم دا ئیتر لە گوند دانە نیشم و چی تر بیگار بو ئاغا نەکەم . چەند روژی مابوو بو نەوروز چومە نەغەدە کە خانوو پەیدا بکەم. بە هەلکەوت توشی کاك ئەحمەدی سەروکانی بووم . پاش چاك و خوشی گوتم هاتووم خانویەك پەیدا کەم و مالەکەم بێنمە نەغەدە. کاك ئەحمەد گوتی : " من لیرە خانووم هەیە. خانووی خوتە وەرە دانیشە و هەتا پیت خوشە تێیدا بە . ئیستا عەجەمیکی رووتەی تیدایە وەرە بچین پێی بلێین چولی کا". کە دەچین خانویەکی گەورە خوش حەساریکی مەزن بە عەجەمەمان گوت تا دوو روژی تر چولی کا . من بو شەریفە دەین کەراسەوە و مالم بار کرد و هاتمە نەغەدە. فیری ژیانی شارستانی نە ببووین دایك و بابم ماوەیك زور ناڕەحەت بوون. شارستانی بێ کار و کاسبیش بەلا یەکی گەورەیە . جوت و عارەبە و یەك دو کامیش و کەلیچە و پاتالم هەبوون فروشتمن و تاقە گامیشیکم بو دوو هێنەوە . پولیکم هاتە دەست و چومە تەوریز. لە تاجریك شوشە و بلوریاتم کری و هینام بە دەستە بە دوکانداران فروشتەوە و خیریکی باشم کرد . کەوتمە سەرکاسبی و بابیشم لە پیش دا کانی سەرتاشیك هیندی وردە والەی دانا بوو هەم خوی پیوە خەریك دەکرد و هەم

پیکمیەك بوو بو کار و کاسبی من .

هاتنی نەغەدە تیّ هەلچوونەوەی تیکوشانی سیاسی بە دواوە بوو. لاوەکان لەم کودبوونەوە و کومیتەی نەغەدە زور جار کاری پیّ دەسپاردم . ( محەممەدی قادری ) کاك حەممەدی سەروکانی کە پاشان هەموەلین کەس بوو لە کوماری دیموکراتی مەهاباد میدالی قارەمانی وەرگرت و دەرمرجەی (کاپیتانی) درایە، هاتە نەغەدە. ئەو بۆ کورد نمما بوو شەو وروژ هەلدەسورا و تەبلیغاتی دەکرد . لاوەکانی کوڵەکردەوە مەشقی پیّ دەکردن . کوفاری نیشتمانمان بە لاوەکان دەکری و لەگەلمان دە خویندەوە .
نەغەدە ببوە ناوەندیکی گەرمی تیکوشان . کوردەکانی گەرمینیش روویان تیّ کرد بو تیکەلی و سەودا و کرین و فروتن لەنیوان برایانی گەرمین و کوێستان ،لە باری ئابووریشەوە خەلکی بوژاندبوو. باریکی سەنفی ئەم برەوەبازار و هاتووچویە ئەوە بوو کە مفتە خوری پەیدا کردبوون . بە سەدان کەس بە ناوی ( دەلال ) بیکار دەسورانەوە و بە سەر حیسابی سەودا و مامەلەی خەلکی تر دەژیان . کومیتەی نەغەدە کە حاکمەتی گرتبوە دەست ئەوەندەی عورزە نەبوو دار و لەلمەیەك بۆ ئەو مفتە خورانە دابنیّ .
روژیك برایەکی هەولیری لە بازار شتیکی فروشتبوو هاتبوو لە بن دیوار پارەکەی بژارد . دەلالیك چاوی پیکەوت کە وا کوردیکی گەرمین پارە دەژمیری . چوە کنی و وتی : بدە بۆت بژیرم ".
ـ لۆ لوخوم چیمە . وا خوم ئەیژیرم .
ـ ئاخر من دەلالم
ـ من چی بکەم تو دەلاری
ـ من دەلالم و دەمیّ شتیکم دەیەی
برای هەولیری هەر ڕق ت بووە و گوتی : " یەك دەرار، دو دەرار، سێ دەرار، لۆ لۆ خۆناچن کەوادی بکەن ". کابرا خەریك بوو کیشەی پیّ بکا . چووم بریکم سەر کونە کرد و رویشت .

کومەلە دەهات وەك هیزیکی نیزامیش خۆ بنەبنیّ . هیندیك لە کادرە بە کار و چالاکەکانی کومەلە لیباسی ئەفسەری شیوە رووسیان دەبەر دەکرد . یەك لە و تیکوشەرانە کاك سەعیدی قولپی بوو. چەند سوار چاکی لە خۆکو کرد بوونەوە وەك مەعموری کومەلە کاری دەکرد . هیندی کەسیش هەر بەوناوە کەلکی خەراپیان وەرگرتو ـ راووروتیان دەکرد .

رۆژێك لە سابلاخ بە مەیدانی ئاردیدا دەرویشتم کابرایەکی رەشتالەی گروی شالیکی لە نیوقەدی هالاندبوو دەسحیبیکی دەنك گەورە لەشان و وەکازێك بە دەستە وە و هاتە پێش وگوتی : بەشی دەرویش بدە".

چاویکم لێ کرد نالەبارم هاتە بەرچاوگوتم : "دەرویشی چی؟ شەرم ناکەی سوال دەکەی؟ برۆ بۆخوت کارێك بکە ."

ـ تۆلەم قسانە گەرێ بەشی دەرویش بدە

ـ دەرویشی چی؟ ساختە چی ؟ هەر وام گوت هێندی ورتکە بەرد و خیز لەوێ روکرابوو، دەستیکی ورتکە بەرد هەلگرتو هاویشتیە زاری وگوتی : "سوکایەتی بە ئەولادی پێغەمبەر دەکەی؟ .

ئیتر هەلم کیشا دەمانچە و لولە دەمانچەیەکم دە پشت ملی کوتا و وەپیش خۆم دا بو ـ شارەوانی . سەیە پیوەی رەحمەتی سەروکی شارەوانی بوو، دەستی کرد بە پارانە وە . دوکاندارەکانی گەرەك بانگیان کرد، بە قورئانت بم بەری مەدەمن . بە بیانووی نوشتەو دوعا ژنی گەرەکی نە هیشتوە . وەپیش خۆم دا نوشی وسینە زەرد و کاك سەعیدی رەحمەتی بووم . خۆی هاویشتە سەرچەکەی ئەوان و دە پاراوە و دەیگوت : " ئەمجار ئازادم کەن لێرە نامینم دەروم تۆبە دەکەم ." بە دوو قول سوران دا ناردم بو شارەوانی . پاشان دەرکەوت جاسوسی ئینگلیز بووە . دابوویان بە تەواریشان و بردبوویان .

## حیزبی دیموکراتی کوردستان

خەزەلوەری سالی ١٣٢٤ شاری سابلاخ بوو بە ناوەندی خەباتی رزگاریخوازی کورد و لە سەرانسەری کوردستانەوە دەرەبەگ و سەرەك عەشیرەت و خاوەن ملك بو سابلاخ بانگ دەکران . کومەلەی ژ. ك بوو بە حیزبی دیموکراتی کوردستان و کونگرەی حیزب لە ٣ ی خەزەلوەر بەسترا .

## دامەزرانی حیزبی دیموکرات

لە مانگی گەلاوێژی ١٣٢٤دا ئاگادارییەك بە ئیمزای ٧١ کەس لە ڕووناکبیر و پیاوماقوڵ و مەلا و وردەبۆرژوازی و دەرەبەگ و سەرۆك عەشیرەتەکانی کوردستان لە بارەی دامەزراندنی (حیزبی دیموکراتی کوردستان) بڵاوکرایەوە. هێندێ لە بەڕێوەبەرانی کۆمەڵە و قازی محەممەدیش ئیمزایان نەکردبوو. دەقی ئاگادارییەکە بەم جۆرەیە. بە بێ دەستکاری بڵاوی دەکەینەوە.

بیسمیلاهی ڕەحمانی ڕەحیم. ئاگاداری حیزبی دیموکراتی کوردستان

هاونیشتمانان، برایان

ئاگری شەڕی دووهەمی جیهانی کە لە لایەن وە زۆریێ خرانی دیموکراسی وە بە دەستی دوژمنانی ئازادی دەست پێ کرا بوو بە باسکی بە هێزی سەربازانی وڵاتەکانی هاوپەیمان کوژاندراوە. جیهانی دیموکراسی سەرکەوت، وە جیهانی فاشیزم کە ئەیویست نەتەوەکان و گەلانی جیهان بخاتە ژێر ئەسارەتی ستیلەرێگر و خوێن خۆر بە تەواوی نابوت بوو. هەرچلۆنیك کە چاوەڕوان دەکرا ڕێگەی ئازادی بۆ نەتەوەکان و گەلانی جیهان ئاوالە کراوە.

ئەمڕۆ تەواوی گەلانی جیهان ئەیانەوێ لەم ڕێگەیەی کە ئاوالە کراوەتەوە سوود وەرگرن. ئەوان ئەیانەوێ لەم وادانەی کە لە پاکتی مێژوویی ئاتلانتیکدا دراوە سوود وەر بگرن، ئەوان ئەیانەوێ کار وباری خۆیان بە ئارەزووی خۆیان بە جێ بگەیەنن.

ئێمە کوردەکان کەلە ئێران دەژین بە درێژایی چەندین ساڵ و چەندین سەدە لە پێناوی مافی نەتەوایەتی وە هاوجێگایی خۆماندا خەبات دەکەین وە کردومانە. وەلەم ڕێگایەدا قوربانیەکی زۆرمان داوەبەڵام حاکمە دیکتاتۆرەکانی ئێران هیچ کاتێك بۆ بەستنی پێویستەکانی ئێمە ئامادە نەبوون وە تەنانەت نەیان هێشتوەلەو مافانەش کە بەگوێرەی قانونی

ئەساسی دراوبە ئەیالەت وە ولایەتەکان سوود وەر بگرین. ئەوان بە هۆی گوللەو بۆمبا وتوپ و گرتن و تەبعید و کوشتنو بەخسیر کردن وەلامی ئیمەیان داوەتەوە. بە تایبەتی لە سەردەمی دیکتاتۆری بیست سالەی رەزاخاندا ئیمە بو لەبەر کردنی جل و بەرگی نەتەوایەتی کورد بەش ئازاد نەبووین. ئەوان بە هۆی نوکە نیزە بە هۆی ئەفسەرە دز و خائنو ریگرەکان تەواوی مەوجودیەتی ئیمەیان، ژیان و ناموسی ئیمەیان خستبوە ژیر پێ.
ئەوان بۆ نابوت کردنی نەسلی ئیمە لە هیچ چەشنە کارەساتیکی دڕندانە و بێ شەرمانە نەپرینگاونەتەوە. ئاخر ئیمەش ئادەمیزاد بین، ئیمەش میژوو، زمان، ڕیوڕەسمو دابو ن تایبەتی خۆمان هەیە. وە ئەمانەمان خوش ئەوێ. بۆچی ئەبێ مافی ئیمە پێ شیل بکری؟ بۆچی ناهیلن بەزمانی زکماکی خومان مندالەکانمان پەروەردە بکەین. بۆچی ناهیلن کوردستان ببیتە ولاتیکی خود موختار، وە لەریگەی ئەنجومەنی ولایەتیەوە کە لە قانونی ئەساسیدا دیاری کراوە کاروباری بەریوە ببردریت.

هاونیشتمانەکانی خوشەویست! پیویستە ئەمەی بزانن کە هەق نادریت هەق دەستندریت. بۆ ئەمەی هەقی خومان دەسەلاتی نەتەوایەتی و هاوجیگەی خومان وەدەست بینین ئەبێ خەبات بکەین. بو ئەم خەباتە یەکیتی پیویستە، بۆ ئەمەش تەشکیلات و دەستەی پیشرەو پیویستە. دامەزران وەدەست بەکار بوونی حیزبی دیموکراتی کوردستان لە مەهاباد بو ئەم ئامانجە بە ریزمیە. ئیوە هاو نیشتمانانی خوشەویست، ئەبێ چاووگوێ خوتان ئاوالە بکەنەوە، لە دەوری حیزبی خوتان وەخر بن وە بو وەدەست خستنی مافی قانونی و نەتەوایەتی خوتان فیداکاری بکەن حیزبی دیموکراتی کوردستان سەروکو ریگە نیشاندەری ئیوەیە. بە تەنیا لە ژێر ئالای ئەم حیزبەدا نەتەوەی کورد لە خەتەری تیدا چون نەجاتی دەبیت وە مەوجودیەتو ناموسی وە پیویستیەکانی نەتەوایەتی ئەو پاریزکاری لیێ دەکریت. بەتەنیا بە هۆی ئەم حیزبە گەلی کورد ئەتوانیت لە نیو سنوری دەولەتی ئیراندا خود موختاری نەتەوایەتی وەدەست بخات.

هاونیشتمانانی خوشەویست: ئیمە جیا لەمافی قانونی و ئینسانی خومان شتیکی ترمان ناوی. شوعاری ئیمە لەو بەندانەی ژیرەوەدا بە کورتی نیشاندراوە ئەم شوعارانە بخوینن‌ەوە وە لە هەموو پیاویکی کوردی حالی بکەن.

ئەمانەن شوعارەکانی ئیمە

١ ــ نەتەوەی کورد لە داخلی ئیراندا بۆ هەلسوراندنی کار وباری مەحەللی خوی

سەر بە خـــوئازاد بێت. وە لە سنوری دەولەتی ئیراندا نەتەوەی کورد خود موختاری خـــوی بخاتە دەست خـــوی.

٢ ــ مافی خوێندن بەزمانی زکماکی خـــوێ هەبێت وە تەواوی کاروباری داثیرەکان بە بە هوێ زمانی کوردی بەرێوە ببردرێت.

٣ ــ لە سەر ئەساسی قانونی ئەساسی ئەنجومەنی ویلایەتی کوردستان بە زوویـــی هـــەلبژیردرێت بەتەواوی کار وباری کومـــەلایەتی و دەولەتی رابگا وە چاوەدێریان بـــە سەر دابکات.

٤ ــ کار بە دەستانی دەولەت بە بـــێ قسەدەمێ لە خـــەلکی مـــەحەللی بن.

٥ ــ ئەمێ لە سەر ئەساسی قانونێکی گشتی دا لە نیوان لادیـــی و خاوەن مولکا ندا پیک هاتنێک پێک بهێندرێت وە دوا روژی هـــەر دووک لا دابین بکرێت.

٦ ــ حیزبی دیموکراتی کوردستان تێ ئەکوشیت کە لە خەباتەدا بە تایبەتی لەگەل ــ نەتەوەی ئازەربایجانی وە گەلەکانی تر کە لە ئازەربایجان ئەژین( ئاسوریەکان وەئەرمەنیەکان وە هتد ) بە کیەتی و برایەتیەکی تەواو پیک بهێنیت.

٧ ــ حیزبی دیموکراتی کوردستان بە ئامانجی بەرەو پیش بردنی کیشتوکال وە بازرگا نی کوردستان وە پەرەپیێدانی کاروباری فـــەرهـــەنگی و تەندروستی وە باشتر کردنـــی ژیانی ئابوری و مـــەعنەوی گەلی کورد دەست ئەکات بە سوود وەرگرتن لە سامانەکانی سرو شتی وە کانکاکانـــی کوردستان وە لەم رێگەیەوە تێ ئەکوشیت.

٨ ــ ئێمە ئەمانەوێ بە تەواوی گەلەکانی ئیران هـــەلی تیکوشینی بە ئازادی بدرێت بو بەختەوەری و پیش کەوتنی نیشتمانی خوێان.

بژی کوردستانی خود موختار و دیموکراتیک"

ئەوانەی ئەم بەیاننامـــەیان ئیمزا کرد بوو لە سەر یەک لەم دەستە و تاقمە پیک هاـــتبـــوون. " ٢٤ دەرەبەگ و خاوەن ملك ١٦ سەروک عـــەشیرەت ١٨ وردە بورژوازی شار ٩ روناکبیر ٤ پیاوی ئاینی ".

لەم سەر و بەندەدا سایلاغ بـــبوە ناوەندی تیکوشان و هاتوچـــوو کوبوونەوەی کورد لە هـــەموو لایەکەوە. روژی دووی مانگی خـــەزەل وەری ١٣٢٤ هـــەوەلین کونـــگرەی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئیران پێک هات. پاشان لە ژمارە یەکی روژنامـــەی کوردستان دا ئەم بەیاننامـــە بلاو کرا یـــەوە.

دەقی بەیاننامەکە بەم جۆرەیە

حیزبی دیموکراتی کوردستان

لە دوای ئەوەلە هەوەلی مانگی خەزەڵوەر (آبان) ی ١٣٢٤ حیزبی دیموـ کراتی کوردستان لەمهاباد دامەزراو بەیان نامەی خۆی بلاو کردەوە لە رۆژی ٢/٨/١٣٢٤ دا هەوەل کونگرەی خۆی کە تێکەل بو لە سەرانو ونوێنەرانی کوردان بە ترتیبی ژێرو .

١ ــ ماکو وآرارات . آغای عمر خانی جلالی .آغای شیخ حسن . آغای شیخ کی . آغای حسن آغای دلابی . آغای عبد الله آغای ملان . آغای فخری .

٢ ــ سوما ــ برادوست ــ دەشت ــ مەرگەوەر . آغای عمر خانی شریفی . آغای طاهر خانی سمکو . آغای عباس آغای فن‌نەك . آغای قویطاس آغای مەمدی . آغای حاجی ـ وەتمان . آغای شیرو . آغای عبدی . آغای حسن تیلو . آغای تمر خان . آغای مراد آغای نورکو . آغای زیید . آغای عزو . آغای حسن هنارە . جنابی آغای حاجی سید عبد الله افندی .

٣ ــ شنو . آغای موسی خانی زەرزا . آغای قرنی آغای زەرزا . آغای میرزا سعید آغای قاضی محمد . آغای کاك حمزە .

٤ ــ سندوس . آغای احمدی کاخضر . آغای قاسم آغای پیروتی . آغای محمد امین آغای پیروتی .

٥ ــ لاهیجان . آغای عبد الله آغای قادری . آغای کاك مامند قادری . آغای کاك حسین محمدی . آغای پیروت آغای امیر عشایری . آغای محمد امین آغای پیروتی .

٦ ــ پیران . آغای محمد امین آغا . آغای قرنی آغا .

٧ ــ میاندواو . آغای محمد حسین خانی سیفی قاضی

٨ ــ بوکان . آغای عبد الرحمن شرفکندی . آغای رشید علیزادە

٩ ــ منگور . آغای ابراهیم آغای ادهم . آغای مام حسن . آغای کاك سلیمان . آغای کاك حمزە . آغای مینا آغا .

ئێستا کە باسی دامەزرانی حیزبی دیموکرات هاتوتە گۆڕێ و دامەزرینەران و بەشدارانی هەوەڵین کونگرەی حیزب ناسراوە بۆ جێ نابێ کە مەرامنامەی حیزبی دیموکراتیش بۆ ماتەوە لێرەدا تومار بکەین . هەروەك لە سەرەتادا نوسیومە مەبەست لەم بیرەوەریانە نوسینی مێژووو لیکولینەوەی بەسەرهاتەکان نیە هەر بۆیەش لە شی کردنەوە و لیکداتەوە و لیکولینەوەی چونیەتی و تیکەلی و نیوەرۆکی بەرنامە و دامەزرینەرانی حیزبی دیموکرات خۆ دەپاریزم .

## مەرامنامەی حیزبی دیموکراتی کوردستان

فەسلی یەکەم ١ ـ نێوی حیزبەکمان حیزبی دیموکراتی کوردستانی

٢ ـ بنلغەی حیزبەکمان لە سەر ئەمانەی ژیرەوەدا دانراوە . حەقیقەت، عەدالەت، تەمەدون . تەواوی نیزامنامە و قانونەکانی حیزب لە پاش تەصدیق کران لە کونگرە بە جێ ئەکمیینەریت.

٣ ـ قەڵەم و گوڵە گەنم بە نیشانەی حیزب قبول کراوە .

فەسلی دوهەم

٤ ـ لە سەردەمی ئیستادا ئامانجی هەرە گەورەی حیزب بریتیە لەمە کە لە نێو سنوری دەولەتی ئیراندا پاریزگاری لە مافەکانی گەلی کورد بکات وە بۆ بەرەبی دانی ئەم مافانە رێور شوێنی خودموختاری دابمەزرینیت. لە تەواوی ئەو ئەیالەتو ویلایەتانەی کە بە دریژایی مێژوو کوردی لێ ئەژیت وە زەحمەتیان تێدا کیشاوە هەروەها لە مەلبەندی کوردستان ئەبێ لە سەر ئەساسی دیموکراسی دا سودی کومەلانی گەل لە بەر چاو بگیری ئەبێ بەبێ لە بەر چاو گرتنی جیاوازی نەتەوایەتی وە قەومیەت و مەزهەب حقوقی بەرابەریان بێ بە ریت بۆ هەڵبژاردنی نوێنەر بۆ مەجلیسی شورای مەللی .

٥ ـ ئامانجی حیزب بریە لە بەرە پیدانی دیموکراسی وە لە سەر ئەساسی ئەمە بو بەختەوەری بەشەریەتی دەکوشی .

٦ ـ حیزب لەگەل دەولەتی ناوەندی هیچ دوژمنایەتی و ناکوکیەکی نیە وەبەستە ئەشیا ئەبەوی لە ریگەی ئاشتی یەوە بۆ دامەزراندنی بەرە پێدانی فەرهەنگو تەندروستی

وە کیشت وکال کەلی کورد کە لە ئەنجامی دەسەلاتی بەدەفەری ئیستعمارد ا وەپا ن کەوتوە تیّ بکۆشی . وە بو ئەمەس دەاوای مافی خود موختاری نەتەوایەتی دەکات.

<u>فەسلی سییەم</u>

٧ ــ تەواوی مالیات و داهات بە گویرەی پیداویستی وەکو ئەکریت وە لە سەرئەسا سی حیسابی بودجە تەنزیم ئەکریت وەد ابەش ئەکریت.

٨ ــ حکومەتی میللی لە یەکەمین هەنگاوەوە دەست ئەکات بە ئاوەد ان کردنەوەی ولات وە پەرە پیدانی تەشکیلاتەکانی ئابوری و سیاسی وە لەبەر ئەمە ناتوانین زیاتر لە سەد ا ٣ ی مالیاتی وەکو کراو بە حکومەتی ناوەندی بدات.

٩ ــ ئەبیّ تەواوی مەئمورەکانی کیشوەری و سیاسی وە تەشکیلاتەکانی کیشتوکال لە کورد ان بیت. حکومەتی نەتەوایەتی هەر کاتیک بە پیویستی بزانیت ئەتوانیت مشاوریکی دەرەوە بانگ بکات. تەواوی کاروباری کومەلایەتی و دەولەتی وعەد لیە ئەبیّ بە زمانی کوردی بنوسریت و بەریوە ببردریت.

١٠ ــ حیزب بو پەرە پیدانی کیشت و کال تیّ ئەکوشیت ماشینی نویّ کیشت وکال بکریت حیزب تیّ ئەکوشیت ئەو داهاتەی کەلادیّیەکان وەدەستی ئەخەن بەباشی بفروشری

١١ ــ حیزب تی ئەکوشیت بو ئاوەدان کردن و خاوین راگرتنی دییەکان وتەواوی ئەوکوسپانەی کە بوکوچ کردنی لادیّیەکان لە دیّیەکرا بوّ دیّیەکی تر هەیە لەنیوان لا ئەبات.

١٢ ــ حیزب بە بیّ لەبەر چاوگرتنی جیاوازی نەتەوایەتی و قەومیەت و مەزهەب لە ژیانی سیاسی و ئابوری و فەرهەنگی و تەندروستی تەواوی ئەو زەحمەتکیشانەی کە لە کوردستان ئەژین پاریزگاری ئەکات.

١٣ ــ بە ئامانجی پەرەپیدانی عیلم و شارستانیەتی لە نیو خەلکی کوردستاندا خویندنی ئیبتیدائی و ناوەنجی ئەبیتە ئیجباری وە لە تەواوی قوتابخانەکان ئەبیّ خویندن بە زمانی کوردی بیت.

١٤ ــ بە ئامانجی بەرەو ژور بردنی رادەی خوینەواری و ژیانی شارستانەتی کەک کەلیک کانگای زانستی وکتیب خانە وقەرائەت خانە وکلوب و تیاترو مەیدانی وەرزشی دائەمەزریت.

١٥ ــ تەواوی ئەو مەئمورە کوردانەی کە لە ئەیالەت و ویلایەتەکانی تر لەئیدارە

كان و لەشكر دا كار ئەكەن ئەمیّ بو كوردستان بگیّردریەنەوە .

١٦ ــ حكومەتی میللی بە لەبەر چاوگرتنی قازانجی خوی لەگەل دەولەتەكانی تر وە لەنوبەی یەكەمدا لەگەل دەولەتی مەزنی شورەوی پیوەندی فرهەنگی و ئابوری رائەگری

١٧ ــ حكومەتی مەحەلی كورد لە تەواوی ئەو كونفرانسە بەینەلمللی یانەی كە بو ژیانی بەشەریەت دائەمەزرین بە گویرەی نفوسی خوی تەواوی حقوقەكانی خوی داوائەكات

١٨ ــ حكومەتی خود موختاری كوردستان ئەبی ئیختیاری ئەمەی هەبیت كە ئیمتیازی كانگاكانی رەعەمەل هیندراو وە رەعەمەل نەهیندراوی كوردستان بە هەر كەسیكی بی پەویت بدات .

فەسلی چوارەم

١٩ ــ حكومەتی میللی بو دابین كردنی پیداویستەكانی خەلكی كوردستان لە ریگەیكی هەرزان و بی دەردی سەر وە بەربەرەكانیەكی بە تین بە پیچەوانەی سەلەم خور و گران جان ومحتەكیران بەریوە ئەبات .

٢٠ ــ حكومەتی میللی ئابوری كوردستان پەرە پی ئەدات وە لەتەواوی شارەكان سەنعات دائەمەزرینیت . ئەمیّ دەستی بەد فەری ئیستعمار لە سەر سەروەتی تەبیعی ئیمە ببردریت بو خومان ئەمیّ لەو سەروەتە سوود وەر بگرین وە لە عەینی كاتدا بە قازانجی بەشەریەتی بگەیینین .

٢١ ــ ئەمیّ لە تەواوی كاروباری سیاسی و ئابوری و كومەلایەتیدا ژنانیش وەك پیاوان خاوەنی حقوقی بەرامبەر بن .

٢٢ ــ مافی كەمایەتیە نەتەوایەتیەكان كە لە كوردستان ئەژین ( ئازەربایجانی ئەرمەنی ئاسوری ) بە تەواوی ئەبی لەبەر چاوبگیریت .

حیزبی دیموكراتی كوردستان ــ ئازەری ١٣٢٤

پاش دامەزرانی حیزبی دیموکراتی کوردستان ئەندامان و ریکخراوەکانی کومەلە بوون بە بەشی حیزب و تیکوشان بەناوی کومەلە لە گوری دا نەما. حیزبی دیموکرات بە گورجی دەستی کرد بە دامەزراندنی هیزی بەرگری و گرتنی پیشمەرگە و دانانی قوتابخانە بەزمانی کوردی و داتانی چاپخانەی کوردستان و دەرچوونی روژنامەی کوردستان و دانانی رادیو لە مەهاباد و هەنگاوی بە کەلکی دیکە. بەلام هەر لەسەرەتاوە دەسەلات کەوتە دەست خاوەن‌ملک و دەرەبەگ و هیندی بورژوازی شار و کەسانی هەلپەرست کە خویان لە دەزگاکانی حیزب و مالە قازی نیزیک کرد بووە. ئەمە لە لایەک، لە لایەکی دیکەوە لە نیو زەحمەتکیشانی شار و گوندا ببوو بە شایی و زەماوەند و جیژنە و خوشی و لە کەم گوندی کوردستان شەوو روژ شایی و هەلپەرکی نەبوو.

روژی کرد نەوەی چاپخانەی کوردستانم لە بیرە بەراستی بەو بونەوە هیندی کەس هەر بونا و وتاریان دەدا کە هیچ پیوەندیکیان بە روژنامە و چاپخانە و نوسین و زانستو فەرهەنگەوە نە بوو. یان روژی دووی ریبەندان روژی راگەیاندنی کوماری دیموکراتی کوردستان ئەم کەسانە وتاریان دا ( سەیلی ئیلخانی زادە، برایمی ئیلخانی زادە، زیرو هەمرکی، رەحمانی ئیلخانی زادە، شیخ حەسەنی شەمسی بورهانی، برایمئاغای ئەدهەم، جەعفەرئاغای کەریمی، حەسەناغای مەعروفی و . . . ) کە هیچ یەک لەوانە نەک هەر بە کوماری مەهاباد و جولانەوەی رزگاریخوازی کورد وەفادار نەبوون، بەلکوو خەیانەتیشیان پی کرد و لە پشتەوە خەنجەریان لی دا .

لەم سەروبەندەدا رایانگەیاند کە خویندکار بو یەکیتی سوفیەت دەنیرن . کومیتەی نەغەدە منی پیشنیار کرد کە بچم بو خویندن . بەلام من کورە جوتیاریک بووم نە کورە ئاغا بووم و نە کورە بورژوازی شار پاش هاتوچویەکی زور منیان بە بی دەلیل لە ریزی نیردراوان دەرهاویشت بوو. پاش ئەوە من بەجاریک لە تیکوشان دلسارد بووم و دەستم کرد بە کاسبی و خەریکی بەریچوونی ژیان بووم .

## چەند بیرەوەریەکی خوش

روژی کە مەلا مستەفا دەهاتە سابلاخ یەکیک لە روژە میژووییەکانی سەردەمی جولانەوەی کورد لە کوردستان بوو. خەلکی شار بە گشتی خوی بو پیشوازی ئامادە کرد بوو. لە گوندەکان و شارەکانی دیکەی کوردستانیشەوە خەلک هاتبوو. مەلا مستەفا بە پیشوازی

و به خیر هینانیکی گەرمو یێ وینه گەیشته نیو شار و له دەفتەری حیزب میوان بوو. ئەزیش سەبارەت به ناسیاری لەگەل کار بەدەستان و شارەزا بوونی تیکوشانم یەکیك لەو کەسانه بوم که توانیم له مەجلیسی بەخیر هینان و دانیشتن دا بەشدار بم. عالەمیکی زور دا نیشتبوون و قسه دەکرا. یەکیك له تایفەی قازیان که دوکتور بوو ماوەیەك بوو له تورکیا ژیا بوو تازه به میوانی هاتبووه هەلیه ایه و خوی به مەلا مستەفا ناساند وگوتی : قوربان من دوکتورم و له تورکیا دەژیم. بریارم داوه کاتیك بیمه وه کوردستان که هەمو شوان وگاوانیکی کورد روژنامەی بەدەستەوەبی و بیخوینیتەوە".

به رەحمەت بێ مەلا مستەفا گوتی : "جا ئەو دەم بوچ دێیەوە کوردستان . ئەو دەم گەلی کورد چ پیویستی به تو دەبی . ئەگەر راست دەکەی کوردی نیشتمان پەروەری ئەم رو وەرەوه کوردستان . کورد ئیمرو پیویستی به توهەیه . ئەگەر هەموو شوان وگاوانی کورد خویندەوار بوون ئیتر هیچ پیویستیان به تونیه و سەیەوه . "

کابرا بیدەنگ بوو مرتەقی لەبەر نەهات دەر.

## ناو دیتنەوه بو ئاغا

له سەر دەمی تیکوشانی کومەله و دامەزرانی حیزب دا کوری خویندەوار وزانا یان کو دەبوونەوه و دەیانویست وشەی کوردی بدوزنەوه و لەنووسین و ئاخافتن دا به کاری بینن . روژیك له مەهاباد له کوریك دا بەشدار بووم که باسی ئەم مەبەستەی دەکرد . هاتنه سەر ئەو بریاره که له جیاتی وشەی (خانم) وشەی (یای) بەکار بینن . که ئەم وشەیه له نیو هیندی عشیرەتی کورد به تاییەت (مەنگور) باوه وجوانه .

پاشان دەگەران که بو (ئاغا) ش وشەیەکی کوردی بدوزنەوه . پاش باسیکی زور حاجی بایزئاغا گوتی : "عەجالەتەن به ئیمەش هەر بلیین (یای) تا ناویکمان بو دەبیننه وه ".

## کی کوردە ؟

دیسان له سەر دەمی تیکوشانی کومەلەی ژ.ك دا هەستی ناسیونالیستی و ولات پاریزی خەلك هەر شەپولی دەدا و باس هەر باسی کورد و هەموو کەسیان به

کورد دا دەنا . رۆژێك لە کۆبوونەوەیەك لە ساباڵاخ باسی ئەوە دەکرا کە کێ کورد بووە . هێندێ دەیانگوت ( ئیبراهیم پێغەمبەر ) کورد بوە . هێندێکی تر لەوکۆنتریشیان بە کورد دادەنا . روویان دە ( برایمی محمود ئاغا ) کرد وگوتیان : " برایمئاغا تو بیر ورات چیە" برایمئاغا گوتی : " بە خوا من ئاقڵم لە شێخی بورهان و سەیدی زەمبیل بەولاوە بڕ ناکا . ئەوانم بێ کوردە و هەورازتر ناچم " .

## دەوری ربیبەندان و کۆماری دیموکراتی کوردستان

هەر لەمانگی بەفرانبارەوە لە شار وگوندی کوردستان شایی و خۆشی کەوتبوە نێو کۆمەلانی خەلك و لاوەکان دەستە دەستە دەچوون ناوی خۆیان لە هێزی بەرگری میللی دا دەنووسی . لە لایەکی تریش زۆربەی ئاغاو دەرەبەگ کرا بوون بە ئەفسەری حکومەتی میللی و دەرەجە و نیشانیان درا بوویە . لە هەموو ناوچەکانی کوردستان بەشی زۆری دەسەلات بەدەست ئاغاو دەرەبەگانەوە بوو . لە سنەوەر سەید ئەحمەدی کوری سەید تەها کرا بوو بە سەدری کۆمیتەی سنەوەر . شەووڕۆژ خەریکی رابواردن و پارە کۆکردنەوە بوو . رۆژی دو جار حەوت هەشت چەکداری وەدوای خۆ دەدا و بە بازاری نەغەدەدا نومایشی دەدا . کچی غولامرەزاخانی چیانەی خواست حەوتویەکی تەواو ژن و کیژی نەغەدەی بەزۆری بو شایی دەبرد . بێجگە لەوە جوابی حیزب وحکومەتیشی نەدەداوە . باشم لە بیرە ئێوارەیەك حەمەدەمینئاغای کوری کاك مامەندی کولیچی کە معاونی پێشەوا بوو بو کارێکی حکومەتی هاتبوە نەغەدە و دەیویە سەید ئەحمەد ئەنجامی بدا . سەید ئەحمەد نەك هەرجوابی نەداوە بەلکوو لە نەغەدە دەریشی کرد .

حاجی مەلا خالیدی دەربەند کە یەکێك لە تێکۆشەرانی ناسراوی کۆمەلەی ژ . ك بوو قادرئاغای بابخالاوی لە دەربەند دەری کرد و رەزێکی بەدەستی خوی چەقاند بووی لە رەگ و ریشەی دەرهێنا . حکومەتی میللی کوردستان دەنگی لەبەر نەهاتە دەر .

لە شار ویران حەمەدئاغای ( لەجی ) دەستێکی چاپەزیکی خوی پەراند . رۆژنامە کوردستان خەبەری جنایەتەکەی بلاوکردەوە بەلام کەس هیچی بە حەمەدئاغا نە گوت .

لە شامات سمایلی شێخ ئاغایی رەعیەتێکی لەگەل سەکێك تێك خستبوو دەچالیکی

هاویشتبوو کوتبووی دەمێ قازی بێ لە ئەستوی سەکت بکاتەوە.

زور لە دەرەبەگەکانی مامەش و مەنگور و دیبوکری و قەرەپاپاخ رایان کرد بوو چوو بوونە پال حکومەتی ئیران و دژی کوماری ساوای کوردستان پیلانیان دەگیرا و خزم وکەس وکاریان لە کوردستان جاسوسیان دەکرد بەلام حکومەتی میللی کوردستان دەستی لی نەدەدان. نمونەی یەکجار زور لە خەراپەی ئاغاکان و بێ زبیکی بەریوە بەرانی حیزب و حکومەتی میللی کوردستان بە دەستەوەن کە لەنووسین نایەن.

هاوینی ١٣٢٥ کومیتەی ناوەندی حیزبی دیموکراتی کوردستان بە گوێرەی بریا ریک رایگەیاند کە هەر کەس چەکی هەیێ پەیوەستە خۆ بە هیزی بەرگری کوردستان بنا سینی. سەید ئەحمەدی سەید تەها کە سەدری کومیتەی نەغەدەبوو لەدوای ناردم وگوتی " پەیوەستە لەگەل میرزا برایمی قاوەچی بچیە رادانە و چەکداری ئەو ناوە بنیرن بو مەهاباد. هەر چەند بیانووم هیناوە کە نەچم فایدەی نەبوو. لە گەل میرزا برایم و- پەنج (قول سوور) چووینە رادانە. رادانە شاروکیکی پچوك و ناوەندی سندوسی خوار وە. خانویکمان دوزیەوە و ئالای کوردستانمان لە سەر هەلکرد و روژی دوایی لە نیو شارجارمان کیشا کە (کە هەر کەس چەکی هەیە بیتە ئیدارە و هەر کەس تەمەنی لە چل سال کەمترە بێ ناوی خوی بنووسی.). کە دەهاتن لیمان دەپرسین (چەکیان هەیە یان نا). ئەوەی چەکی هەبا دەمان نووسی. ئەوی بێ چەك با و ئامادەی رویشتن بایە بوهیز ئەویشمان دەنووسی. زور کەسی وا هەبوو چەکی هەبوو بەلام پیر بوو چەکەکەی دەدا و خوی نەدەچوو. لە روژی دیاری کراودا ١٢٠ کەسمان ئامادە کرد کە بەریێیان بکەین بو مەهاباد. لەنیو شار و گوندەکانی دەور وبەر عالەم کوبووە و بوو بە شین و گریان وەك روژی عاشورا. لە گورەپانی نیو بازار چوومە سەرکورسی و پتر لە سەعاتیك قسەم بو خەلك کرد و تورزیك هیدی بوونەوە و ترومبیلەکانی دەمیان بردن گەیشتنە جی و سوارمان کردن بو مەهاباد. پاشان من گەرامەوە بو نەغەدە و داوام لە سەید ئەحمەد کرد کە ئازادم بکا کاسبی خوم بکەم.

### لە شکر بو جەبهەی سەردەشت

لە نەغەدە خانووەکەی من بەرامبەری مالە شیخ محەممەد سدیق برای مەلا مستەفا بوو. مەلا مستەفا زور جار لەوی دادەبەزی و جیگای کوبوونەوە و هاتوو چووی بارزانیان و خەلکی

دیکەن بوو. لە گەڵ عەلی کوڕی شێخ محەممەد سدیق نێوانم خوش بوو. بڕیار درابوو لەشکر بو جەبهەی سەردەشت بچی. هێزی ئەساسی و شەر کەر لە حکومەتی میللی کوردستان دا بارزانیەکان بوون. ئەودەم هێندێ ئەفسەر و سەربازی رووسیش لە نەغەدە بوون. ماشینی رووسەکان هاتوو چویان دەکرد. مەلا مستەفا نارد بووی ماشینێکی رووسان بۆ بارزانیان بەرێ بو جەبهە. شوفیرەکە ماشینی نەدابوو. مەلا مستەفا توڕە بوو ناردی شوفیرەکەیان هێنا. مەلا مستەفا گوتی "بوچی ماشینت نەداوە. نازانی بو جەبهە لە هەموو شت پێویستترە. ؟ . کابرا توزێك فارسی فێر ببوو گوتی: "من ئیرانی نیم خوم کارم بە ماشینە".

مەلا مستەفا هەر دوك دەستی هاوێشتە سەرشانی و لە پێشەوە دوو شەقی لە گوندینی دا شوفیرێکی ئەرمەنی لەوێ بوو رووسی دەزانی. بەکابرای گوت: "ئەوە ژەنراڵە".

کابرای رووس دەپاراوە و دەیگوت: "تەواریش ژەنراڵ گو خوردم غەلەت کردم تواریش ژنراڵ مرا ببەخش". مەلا مستەفا گوتی: عومەرئاغا هەرە شێست کەس سوار کە و گیر سەبە بو سەردەشت".

ژن بە ژنە

هەر ئەودەم کە ماڵم لە گورناوێ بوو لە گەڵ کیژێکی دراوسێمان نێوانم خوش بوو پێم خوش بوو بیهێنم. بەلام ئەوانیش خوشکی منیان دەویست کە خوشکم رازی نە بوو.

هەوەلی پایزی ساڵی ١٣٢٥ روژێك باوکی کیژەکە هاتە نەغەدە و حاجی مەلا خالید مان بانگ کرد و کیژەکەیان لێی مارە کردم و خوشکی منیشیان لە کوڕی کابرا مارە کرد.

سەرەتای مانگی سەرماوەز بوو کومیتەی ناوەندی حیزبی دیموکرات فەرمانێکی دەرکرد کە لە تەواوی ناوچەکانی کوردستان لەشکر بو سەقز بروا. سەید ئەحمەدی سەدری کومیتەی نەغەدە لە سندوس و شنو ٥٠ ٢ سواری چەکدار کوکرد بووە کە بو جەبهە بچن نیزیکەی ٣٠٠ سواری کورد و قەرەپاپاخیشیان بە سەروکایەتی حامید اغای قەرەپاپاخ بو چومی مەجیدخان نارد بوو کە لە خەتی بوکانەوە بو سەقز بروا. بەلام حامید ئاغا لەشکری لە قەباکەندی و شامات راگرتبوو تا دیموکریەکان پردی بوکانیان خەرا کرد و لەشکری ئیران بەرەو میاندواو هات و لەشکری حامید ئاغا بلاوەی کرد.

بەلام سەید ئەحمەد — تازە لە سەفەر گەڕابووەوە پیاوێکی سەید ئەحمەد هات

گوتی : "سەید ئەحمەد بانگت دەکا".
کە چووم سوارە هەمووی ئامادە و بە ریز راوەستا بوون . ئەسپێکی سپی کوری مەحمود کەرتشین یان بو راکرتبوو وەك قارەمانێك دەهات و دەچوو. کە چوومە پێش گوتی :
" برو سوار بە بو سابلاغ بروین . روژی تیکوشانە ".
ـ تازە لە سەفەر هاتوومەوە . خوم و ئەسپەکەم هیلاکین . پاش دوو روژ لە مەهاباد خوم دەگەیەنمە ئیوە ."
ـ باشە لیرە بمینەوە بەلام لەگەل شارەوانی هاوکاری بکە . ". ئەوەی گوت و سوار بوو .
دەنگوو باسی شەر و هیرشی لەشکری ئیران بو ئازربایجان بە سرتە و جار و بار دەبیسرا . چەند روژیك بەسەر روشتنی سەید ئەحمەد دا تیّ پەریبوو ئیوارەیەك ئەنوەر دلسوز لە نەغەدە پەیدا بوو. ئەنوەر دلسوز کوردیکی کوردستانی گەرمین بوو هاتبوە نیو جولانەوەی کوردستانی ئیران و لە حکومەتی میللی کوردستان دا کاریان دابویە و لام وایە کرابوو بە سەروکی گومرگی ناوچەی لاجان و سندوس. جلی ئەفسەری لەبەر دەکرد و سمیلی گەورە . کومیتەی حیزبی لە نەغەدە هیچ ئاگاداری و دەنگوو باسیکی لە بارەی شەر و جەبهە بە خەلك رانەدەگەیاند . دیار بوو ئەنوەر دلسوز زانیبووی کە حکومەتی کوردستان شەر ناکا و لەشکری ئیران بو پیشەوە دیت لە مەهابادەوە خوی گەیاندبوە نەغەدە و دەیویست بەرەو عیراق تیّ ی تەقینی . لە نەغەدە ئەمری کرد جار بکیشن و خەلك کوببیتەوە . وای نیشان دەدا کە لە لایەن حکومەتی میللیەوە هاتوە و قسە دەکا . دوای نیوەرو بوو خەلکیکی زور بە هیوای خەبەری خوش لە کردی قەبران کوبونەوە . کاك ئەنوەر بە سمیلیکی زەردی زەلامەوە بە جلی ئەفسەریەوە هات و چووە سەر کورسی و بە ژیستەوە دەستی پیکرد . " لەو کاتەدا کە حکومەتی رەجعی تاران خەریکە هیرش بکاتە سەر کوردستان پیشمەرگە قارەمانەکان و هیزی بەرگری کوردستان بە قارەمانەتی بست بە بست خاکی نیشتمان دەپارێزن و کوردستان دەکەنە قەبرستانی دوژمن . لەم کات و هەل و مەرجەدا هەر کەسیکی دژی حکومەتی میللی کوردستان دعایە بکا و روحیەی خەلك تیك بشکینی بیّ موحاکەمە ئیعدام دەکری ".
خەلك بلاوەی کرد و ئیتر تا سالی ١٩٥٩ چاوم بە کاك ئەنوەر نەکەوتەوە . دەرکەوت دوای ئەو تارە شورشگیریە ئەو لە نەغەدەش گیر نەبوە و بەرەو عیراق تیّ ی تەقاندوە .

## هەڵاتنی سەید ئەحمەد و کارەساتی نەغەدە

دوو ڕۆژ دوای وتاری ئەنوەر دڵسۆز وەراکردنی، خۆم سازکرد کە بچمە مەهاباد. ئێواری سوار بووم چوومە (گورناوی) ماڵە دەزگیرانەکەم بەو مەبەستە کە براکەی ئەویش لەگەڵ خۆم بۆ مەهاباد بەرم. شەو خەڵکی گوندیم لێ کۆبوونەوە و باسی وەزعی شەڕ و هاتنەوەی لەشکر و بەربەرەکانی خەڵکمان دەکرد. بەیانی تازە زەردە و سەران دەکەوت لەخەو هەستام و دەم و چاوم دەشوشت، برای دەزگیرانەکەم بەغار لە کانی هاتەوە گوتی: "بەو بەیانە سوارێک لە لای نەغەدەوە بەغار دێت. لەگەڵ کو وای گوت خورپەم لە دڵی هات. ڕام کرد بۆ سەرڕێگا. سوار کە گەیشتێ ناسیم خەڵکی "ئالیاو" و لەو سوارانە بوو کە لەگەڵ سەید ئەحمەد چوو بووە لەشکر. گەیشتە حاستی من و ڕاوەستا. ماندوونەبوونیم لێ کرد و پرسیم: "بەو بەیانە خێرە؟. چونە وا هاتوویەوە؟".

— خێری چی؟ کوردستان تەسلیم بوو. دوێنێ سەید ئەحمەدی سەید تەها سوارەکانی کۆکردەوە و گوتی بڵاوە بکەن، هەر کەس بۆکوێ دەڕوا بڕوا. ئێتر بڵاوەمان کرد. من سوار بووم وئەم شەو لەڕێدا بووم. سەید ئەحمەد بە ماشینێکی حکومەتی میللی هەر بە شەو هاتوتەوە نەغەدە. ماڵ و شتومەکی تێکناوە و ژن‌ودایکی هەڵگرتوە و تفەنگی قوڵ سورەکانی هەستاندەوە و چەند پێشمەرگەیەکی لەگەڵ خۆ بردوون و ڕۆیشتوە بۆعیراق".

کە ئەو خەبەرەی بۆ گێڕامەوە بەپەلە گەڕامەوە ماڵە خەزوورم و تا ئەسپیان بۆ زین کردم چایەکم خواردەوە و سوار بووم بە سەر ڕەو بەسونەغەدە. لە چیانە لامدا ماڵە غولام ڕەزاخان کە خەزووری سەید ئەحمەد و سەرۆکی مالیەی حکومەتی میللی کوردستانیش بوو لە سندوس. چوار دەوری سەربانی تفەنگچی لێ ڕاوەستا بوون. دەنگیان دام گوتیان مەیە پێش. نوکەرەکانی غولام ڕەزاخانیم دەناسی. گوتم خەبەر بدەنە خان، پێویستە بیبینم. زۆری پێ نەچوو گوتیان وەرە بۆ حەساری. کەچوومە حەسار غولام ڕەزاخان شەست تیرێکی برنوی لە سەر شان بوو گوتی: "دامەیەزە. کەللەی (ئێنتیزار) وە بەر ئەو شەست تیرە دەکەوێ. گیر مەبە بچۆ نەغەدە. سەید ئەحمەد خوێڕی بوو

هەلات. مەنیجەتی برد . من لێرە پشتیوانی کوردەکانم . ئەگەر قەرەپیاخ لەشکر بکەنە سەر نەغەدە خەبەرم بۆ بنێرە . لە ڕێگا ئاگات لە خۆ بێ ".

( ئینتیزار ئاغای کەلوان بوو . یەکێک لەو قەرەپیاخانە بوو دژی حکومەتی کوردستان و هەر لەوکاتەشدا لەگەڵ ماڵە ئەمیر تومانسی چیانە دۆستایەتی هەبوو . )

لە حەساری غولام ڕەزاخان هاتمە دەر و ڕکێفم لە ئەسپی دا تا حەساری خۆمان گیر نەبووم . کە دابەزیم جیرانێکمان بە غار هات و گوتی : " ئەوە ڕەش و ڕووتی عەجەم ئیدارەی فەرهەنگ ویران دەکەن و دەرک و پەنجەران دەبەن ".

بە پەلە وەدەر کەوتم تەماشام کرد ئەوە دەرک و پەنجەرەی ئیدارەی فەرهەنگی کوردستان دێننە دەرێ . تفەنگێکم بە سەر دا هەڵتوقاندن و هەر یەکە بە لایەکدا هەلاتن . یەک دوێکم وەبەر قونداخە تفەنگان دان و بۆ ماڵێ دەگەڕامەوە برادەرێک هات سپی هەڵگەڕا بوو دەلەرزی .

ــ ئەوە چیە بۆ وا دەکەی؟

ــ کەس نەما ئیدارەکان هەموو چۆڵ کراون . سەید ئەحمەد هەلاتوە . ئیستا جاڕیان کێشا کە کوردەکان هەموو لە مزگەوت کۆ ببنەوە .

توزێکم دڵخۆشی داوە و ڕۆیشتین بۆ مزگەوت . تەماشام کرد مزگەوت پڕ بوە و کشتیان بێ چەکن و هەموو وەک تازیەداران سەریان بەرداوەتەوە . ئەندامانی کومیتەی حیزب و بەرپرسی ئیدارەکان کەس دیار نیە . حاجی قادری حەریری کە دەولەمەندێکی ــ قورسی نەغەدە و سەر بە قەرەپیاخەکان ولە کونە سندوسیەکان بوو هەستا و دەستیی کرد بە قسان : " هەموو دەزانن کە وا کوماری کوردستان ڕوخا و ئەوە سەید ئەحمەد هەلات و ئیمەش تا لەشکری ئیران دەگاتەوە وا باشە بچین ئاغای ( ئینتیزار) لە کەلوان ــ بینین و لێرە بمان پارێزێ تا حکومەت دێتەوە . ئێمە هیچمان پێ ناکرێ و لە بەینمان ــ دەبەن ." قسەکانی زور بێ تام و خوێڕیانە و بودەلانە بوو . زوری ڕەستەویاشان دانیشتەوە کش و ماتی خەلکی داگرتو کەس وەدەنگ نەهات . من دووسێ ڕیز خوار تر دانیشتبوم هەستام و چومە میحراب و تفەنگم چەقاند وگوتم :

" قسەکانی حاجی قادری قسەی کوردی نەغەدە نین . قسەی ئەوکەسانەیە کە لە کونەوە لە ژێر دەسەلاتی قەرەپیاخاندا ژیاون . کوماری مەهاباد نەڕوخاوە . بەهەزاران پیشمەرگەی هێزی بەرگری، بارزانیە قارەمانەکان لە جەبهەی سەقز و سایینقەلا وسەردەشت

شەڕ دەکەن. ئازربایجان تەسلیم نەبووە و بەر بەرەکانی دەکا. هەلاتنی سەید ئەحمەد خەیانەتە و بەمانای ڕوخانی کوماری کوردستان نییە. ئەو خوێڕیانەی خۆیان شاردوەتەوە نوێنەری خەلك نەبوون و کوردەکانی نەغەدە خۆیان کار وباری خۆیان بەڕێوە دەبەن و ڕێگا نادەن هیچ بیگانەیەك بێتە نێو شار تا لە مەهاباد خەبەرمان بۆ نەیە. هەر کوردێکی پەنا بۆ کەلوان و بۆ (ئینتزار)ی دوژمنی کورد بەری گوللەی پێی شاردەدەکەمەوە و شار بە دەری دەکەین. ئەوانەی چەکیان هەیە تا نیو سەعاتی دیکە دەبێ بە چەکەوە لە مزگەوت حازر بن. ئەوانەی تفەنگیان هەیە و ناتوانن بێن تفەنگەکان ـ بێننن و دەدەرین بەو کەسانە کە پیاوانە شار دەپارێزن."

تەواو لە قسەکانم نە ببوومەوە برایەکی کوردستانی گەرمێن بە ناوی (حەمەشنۆیی) کە لە نەغەدە دەژیا و لەوێ ژنی هێنا بوو ڕاست بووە و هات لاچاوی ماچ کردم و گوتی.

"هەر چی لەگەل تۆ خۆ بە کوشت نەدا پیاو نییە. بەخۆم و بە تفەنگەوە ئامادەم".

پیاوێکی تر بە ناوی (سوفی ڕەحمانی بەزاز) هەستا و گوتی: با ئێمەش پیاو بین و سەر بۆ عەجەمان دانەنوێنین. تفەنگێکم لە مال هەیە ئێستا دەچمەوە بوت دەهێنم و پولیشت چەندم دەنووسی دەیدەم".

بە دوای ئەوان دا ١٧ کەسی تر ڕابوون و گوتیان بە چەکەوە ئامادەین. لە ماوەی سەعاتێك دا ٢٥ تفەنگ لە مزگەوت کۆبووە. پتر لە ٢٠ کەس لە لاوەکان بێ چەك بۆ هاوکاری و هاتوچو ئامادەیی خۆیان ڕاگەیاند. هەوەل بڕیارمان ئەوە بوو کە هەر لەوێ کۆبووینەوە ئەم بڕیارانەمان دا :

١ ـ هەرچوار ڕێگای ئەسلی کە دێنە نێو شار بگیرین،

٢ ـ لە سەر هەر ڕێگایەك پێنج تفەنگچی و دوو کەسی بێ چەك ڕاوەستن

٣ ـ هیچ کەسی بە چەکەوە ڕێگا نەدری بێتە نێو شاری نەغەدە.

٤ ـ چوار کەس لە گەل من لە مزگەوت بمێننەوە و بە سەر کاروباری بازار و پەستەکانی سەر ڕێگاکان ڕابگەین.

٥ ـ سێ کەس بنێرینە تیلگرافخانە و خەبەرەکانی تیلگراف و تەلیفونمان بۆ بێنن.

٦ ـ هەشت کەس لە لاوەکان سەری ڕێگاکان بەدەن و نان و خواردەمەنی بۆ برادەران بەرن.

سەعات ی ١٢ ی نیوە ڕۆ بوو خەبەریان هێنا کە کومەلە سوارێك نێزیکەی ٣٠ـ

سواری چەکدار لە ڕێگای (قارنە) وە بەرەو نەغەدە دێن . بەگورجی لە سەر ڕێگا کان سێ چەکدارمان بانگ کردنەوە و لە سەر گردی قەبران بەرەو ڕێگای قارنێ لە حەسار و لە مەتەریزاندا داسەزراین . سوارێکمان بەغار نارد بزانێ کێن و لە چی دەگەڕێن . پێیان ڕابگەیەنێ کە نابێ بێنە نێو شار .

سوار بەغار گەڕاوە گوتی : " ئاغاکانی مامەشی تایفەی حەمەد ئاغان . لە ڕادیو تاران بیستوویانە کە کۆماری مەهاباد تەسلیم بووە . کۆبوونەوە و هاتوون دەڵێن ئەم شەو لە نەغەدە دەبین و سبەی بۆ مەهاباد دەچین .

مەسەلەکە ڕوون بوو . ئەمانە دوژمنی کورد و کۆماری کوردستان بوون . هاتبوون پێش ئەوە بە خەیاڵی خۆیان لەشکری ئێران بگاتەوە سندوس وەك ئەوریز لایەنگرانی کۆماری مەهاباد و بەرپرسەکان بگرن و بیانکوژن و تالانیش بکەن . بڕیارمان دا نە هێڵین بێنە نێو شار . من کورج شتێکم بەم جۆرە نووسی و بە سوارێکدا ناردمان .

" لە بەر ئەوە وەزعی شار ئاڵۆزە بڕیار دراوە ڕێگا نەدرێ کەس بێتە نێو شار . تکایە ئەگەر بۆ مەهاباد دەچن ڕێگای دیکە هەیە و بگەڕێنەوە . ئەگەر بتانەوێ بێنە نێو شاری نەغەدە ، تووشی کوشتار و شەڕی خوێناوی دەبن . "

سوار ڕۆیشت و پاش نیو سەعات ڕاوەستان و وتو وێژ گەڕاوە . ئەوانیش سەری ولاخانیان باداوە و بەرەو بالغچی و بە ڕێگای بناردا بۆ لای خەلیفان و دزە .

لە نێوان گوندی (خەلیفان و دزە ) تووشی ( میرزا ئەحمەدی کوڕی مەحمود ــ کەرشین ) دەبن . ئەحمەد لاوێك بوو جوان چاك ، شۆخ ، ئازا ، تێکۆشەر و تاقانەی دایك و بابی و تازە ژنمان بۆگوێزتبووە . لە هەوەڵی دامەزرانی کومەڵەوە بووە ئەندام بە بێ مووچە و بەرات شەووڕۆژ کاری حیزبی دەکرد و ببوە (قول سوور) ی نێو شارو ئەسپێکی شازی کڕیبوو مەعموریەتی گوندەکانیش ئەنجام دەدا . لەوکاتەوە سەید ئەحمەد ببوە سەدری کومیتەی نەغەدە ئیتر ئەحمەدی برد بوە لای خۆ و شەووڕۆژ لەگەڵ خۆ دەیگێرا . ئەحمەد لە نێو خەڵك زۆر خۆشەویستو لە نێو لاوەکانی نەغەدەدا جێگای تایبەتی هەبو . کاتێك لەشکر چوو بۆ مەهاباد سەید ئەحمەد سواری ئەسپی ئەحمەد بوو ئەوێشی لەگەڵ خۆ برد . لە مەهاباد کاتێك دێتە سەر هەڵاتن و بلاوە بەسواران دەکا ئەحمەد سوار دەبێ و بە تاقە سوارە دەگەڕێتەوە بۆ نەغەدە . لە نێزیك گوندی (دزە) تووشی ئەو مامەشانە دەبێ . دەیان ناسی و ئەوانە هەمیشە هاتوچۆی ماڵە مامیان

دەکرد. ماندوو نەبوونی و چاك و خوشی و پاشان دەلین: "ئەو ئەسپ و تفەنگە مالی کوماری مەهابادە و دەبێ بیدەی بە ئێمە."

ئەحمەد دەلێ: "ئەوانە حکومەتی نین و هی خوەن. ئەگەر حکومەتیشن بەسن نایدەم بە ئێوە". تێ‌ی رو دێن کە رووتی کەن. رکێف لە ئەسپی دەدا و لە نێویان دەر دەکەوێ. دەسرێژی لێ دەکەن و سێ گوللەی لێ دەدەن. ئەسپو تفەنگی دەبەن و دەرون. خەلکی گوندی (دەزە) دەچن مەیتەکەی دەبەنەو گوند و لە مزگەوت دایدەنێن و خەبەریان بو نەغەدە هینا. هەوالی کوشتنی ئەحمەد نەغەدەی لەرزاند. سەدان کەس ژن و پیاو گەورە و پچوك پیر و لاو بە شەو بەپێ و بە سواری بەرەو گوندی (دەزە) کەوتنە رێ. من ئەو شەوە لە بەر ئەمنیەتی شار نەچووم. بەیانی زوو سوار بووم کە چومە مزگەوت. تەرمی ئەحمەدی جوانەمەرگ و هەفال وهاوری تێکوشەر و خوشەویستم سێ گوللەی ئاغا خێز فروشەکانی مامەشی تایفەی حەمەد ئاغای پێوە بو لە مزگەوت دانرا بوو. هاویشتمانە سەر عارەبە و هینامانەوە بو نەغەدە. شاری نەغەدە تازیەدار بوو. خەلکی نەغەدە بە گشتی بە پیشوازی مەیتەکەوە هاتبوو. خەلکی گوندەکانی دەور وبەریش هاتبوون. لەم کارەساتە دلتەزینەدا رادیو تاران خەبەری گرتنی تەوریزی بلاو دەکردەوە. خەلك لە ترس و نیگەرانی دا بوو. لەوە دەترسان کە لایەنگرانی حکومەتی تاران بە خەلك وەربن و ئەوەی لە تەوریز و لەورمێ کردیان لە نەغەدەش بیکەن.

لەسەر قەبران هیندێ برادەری گوندی کە تفەنگیان هەبوو گیرامانەوە وەزعی بەرگری و پاراستنمان بە هێزتر کرد. دەوروژ دوای ئەم کارەساتە لوریەکی پر لە بارزانی لە مەهابادەوە گەیشتە نەغەدە. کە چومە پیشیان (نەزاری کوری سیمان بەگی دەر گەلە) بەرپرسیان بوو. یەکترمان دەناسی و پێشتر ئاشنا بووین. هومید یکمان هاتەوە بەر و خەبەرمان لێ پرسی. نەزار گوتی: "چەکداری بارزانی هێشتا لە ناوچەی بوکان و شاروێران ماون. مەلا مستەفا لە مەهابادە. ئەمری کردوە ژن و مندال و پیرە پیاوان بنێرین بو شنو چەکداری سەلت و بەکاریش لە نەغەدە بمێننەوە. ئێستا فیکری بنزین و جێگا بو چەکدارەکان بکەوە."

بنزین لە نێو شار وەگیر نەدەکەوت. برادەریك هات و گوتی "مشهەدی سەفەر بنزینی هەیە". مشتەدی دوکانی داخستبوو ناردم هینایان. دوکانمان پێ کردەوە و شەست تەنەکە بنزینی هەبوو بە نرخی روژ لێمان کری و بردمان لە مالیك دامان نا.

لوێرەی ژن و منداڵەکان بەرێ کرد بۆ شنۆ و جێگاکەمان بۆ چەکدارەکان لە ئیدارەکانی دەولەتی کردەوە. ڕۆژی دوایی میر حاج لەگەڵ چەند بارزانی گەیشتنە نەغەدە. لە ماشین دادەبەزی چوومە لای و بە خێر هاتنم کرد و زۆر بەکەیف بوو. گوتم: "واد یارە هیچ نەقەوماوە تو وا کەیفت سازە".

گوتی: "چی قەوماوە ؟ تو نازانی. تا ئیستا ئێمە هیچمان نەبوو خەباتمان دەکرد لە سەر دوا هاوار دەکەین و دەڵێین حکومەتمان هەبوە، کوماری کوردستانمان هەبوە و لێ یان تێک داوین".

ئیوارەیەک خەبەریان هێنا وگوتیان (ئینتیزار) ئاغای گەلوان هاتوتە نێو شارو لە مزگەوتی عەجەمان خەلکی کۆ کردۆتەوە. پاش ئەوە کە بارزانی هاتبوونە نەغەدە ئیتر ڕێگرتن و کێشکی جاران نەمابوو. خۆمان بە هێز دەزانی. (ئینتیزار) لەگەڵ چەند سوارێک هاتبوە نەغەدە و عەجەمی لەخۆ کۆ کردبوونەوە. لەگەڵ زیراری سیمان بەگ و چەند چەکدار چوینە مزگەوتی عەجەمان. چەکدارمان لە دەور وبەری مزگەوت دانا و خۆمان لە گەل سی چەکدار چوینە ژوور. منچوومە پیش بە خیر هاتنم کرد و گوتم: "ئاغا لەوکاتەدا هاتنی ئیوە بو نەغەدە کارێکی باش نیە. بارزانیەکان لێرەن و لە خۆیان ئەمین نین. باشترە هەر ئیستا سوار بی بچیەوە گەلوان".

ـ میرزا کەریم دەمرم دەکەی ؟.

ـ من دەمرت ناکەم. بە قازانجی تۆیە. ئیستا ئەو چەکدارانە لیرە بە جێ دێڵم تا سوار دەبی و لە شار وەدەر دەکەوی. گیر بوونت مەسلەحەت نیە".

ڕوژەکانی ئاخری سەرماوەز بوو مەلا مستەفا هاتەوە نەغەدە. پاش ئەوە کە قازی محمد بە قسەی ناکا و لەگەڵ ئەو لە شار وەدەر ناکەوێ، مەلا مستەفا لەگەڵ شەست چەکدار ـ دێتە گوندی (گەریزە) نیزیک مەهاباد. پاش ئەوە ڕوژی ٢٦ی سەرماوەز قازی دەچێتە میاندوا و سەر لەشکر هومایون دەبینی و لەشکر دێتەوە مەهاباد مەلا مستەفا شەو دێتە گوندی (مەحمەشە) و پاشان هاتە نەغەدە. لە ڕووبەرووی ماڵی ئێمە لەماڵی شیخ محەمەد سدیق دەژیا. شیخ سولەیمانیش لە ماڵی (محەممەدی ئەسعەری) دە ڕاسی ئێمە دەژیا. دەروکامینمان هەبوو شیریان دەدا. ئیتر هەموو ڕوژی شیر و ماست و هەر چی ویستبایان بۆمان دەناردن. ماڵە شیخ محەممەد سدیق وەک ماڵی خۆیان تەماشایان دەکرد و هەرچی پێیان ویستبا (عایشوک) دەهات و دەیبرد.

پاش ئەوە کە بارزانیەکان هاتنەوە نەغەدە ، من خۆم لە هەموو کار وباریکی سیاسی کیشاوە . کومیتەیەک داندرا کە مالیات لە دوکاندارەکان و خەلکی تر بە گوێرەی توانا وەر بگرێ و بو بەریچونی بارزانیەکان خەرجی بکا .

وەزعی ژیان لە نەغەدە شپرزە بوو . کاسبی و سەودا و مامەڵەیەک نەبوو. دەولەت ریگای نەدەدا هیچ شتیك بو نەغەدە بیت . بۆ نمونە کیلوی شەکر لە میاندوا بە ٣تمەن بوو بەلام لە نەغەدە بە ٢٥ تمەن وەگیر نەدەکوت . لەشکری عەجەمان هاتبوە ئاختەو لە و محەمەدیار و پیش‌تر نەدەهات . بارزانیەکان بیجگە لەوانەی کە لە نەغەدە بوون لە گوندەکانی لاجان و پیرانان و نیو مامشان دامەزرا بوون و دەسەلاتی تەواویان بە دەست گرتبوو. دەبارە وردە وردە فیری دەست دریژی و هەستاندن و زولم و زوریش بیبوون . لایەکیشی ناعیلاجی بوو دەبوایە بەرێ بچن و بژین .

لە وەزعیکی ئاوادا نەم دەتوانی بیکار دانیشم و بریارم دا بچمە میاندوا شەکر بکرم و بە وشتر بە قاچاخە رێدا بیهینمەوە نەغەدە . زستانیکی سارد و توش و ریگاویان ناخوش و بە ترس . بە زەحمەت دایکو بابم رازی کرد کە بچمە مەهاباد و نەچمە میاندوا کە شاری عەجەمانە . مالی دنیا ٣٠٠ تمەنم هەبوو ئەسپیکی زور باش و بەکاریشم هەبوو روژیك بەیانی سوار بووم و ئەمو چوومە کومە کەریز مالی خوشکم . خەلك هاتو چوی مەهابادیان دەکرد و دەیانگوت عەجەم کاریان بەکەس نەداوە . سوار بووم چوومە مەهاباد کە شەکر بکرم . لە بازار تووشی سەید رەحمانی کوری سەید عەولای قەلات بووم . دوستوناسیار و چەند سال پیکەوە ژیا بووین . نیوە رۆ بوو گوتی : " با بچین لە مزلی من نان بخوین ." مالە ئاموزایەکی لەوی بوو چوینەوە . پاش ئەحوال پرسی بابم گوتی : " چدەکەی ؟ خەریکی چی ؟ ".

ـ هاتووم هیندەی شەکر بکرم . لە نەغەدە زور گرانە .

ـ شەکری چی ؟ بێ خەبەری؟ . عیراقی هاتوون تفەنگو فیشەك دەکرن . لیرە زەحمەتە وەگیرت کەوێ . گیر مەبە و بچۆ شامات. دوست و ئاشنات هەن و تفەنگ بکرە . تا خەلك روویان تێ نەکردوە دەرفەتە . گیر مەبە ئەم شەو بچۆ گوندی ( حاجی خوش ) ـ مالە پورم . مالیکی زور دەولەمەندو ئاوەدان و زور پیاون . دەتناسن ، من باسی تۆم بو کردوون و کچیکی زور جوانیشیان هەیە لەگەل پورم رێك دەکەوی بوت دەخوازم .

نانم خوارد و سوار بووم بەرەو حاجی خوش. سواریکی کوك و پوشتە و بوشناغ .

لیباسی چاك ئەمیی چاك زین و لغاوی چندراو و جوان، بویە دەبووم لە هەموو مالیـك رام بکرن و بەخیر هاتنم بکەن . لەکوردەواری‌دا ئەم شتانە لەبەر چاو دەگیرین .
مـەسەلەی کوردیە دەلێن : کەوای سوور پلاو دەخـوا".
ئیوارەیەکی سارد و شونتفت هەلاویتنبا دەمیەست . گەیشتمە ( حاجـی‌خوش) پرسیارم‌کرد ماله ( قـەمیتەران ) لە کوێیە؟ . پیاویك مالەکەی نیشان دام . کە چومە حەسار هـەموو نیشانەیەکی دەولەمـەندی لێ دیار بوو . ماله قەمیتەران مەرداریکی گەورە و جوتبەندیکی ئاغا و لە شار ویران بە ناوبانگ بوون . گەیشتمە حەسار یەك دوو پیاو ـ ولاخیان لێ وەرگرتم و بە خیر هاتنیان‌کردم و بەکیان دیوەخانی بێ نیشان دام .
دیوە خانیکی پر لەمافورە، خاوین، گەرم کورە دایسا . دانیشتم پیاوەکە چەکەی لە بێ دەر ـ هینام و پیاویك ریش‌سپی، کەلە پیاو وەژوور کەوت. زور بە گەرمـی بە خیر هاتنـی کردم و پاشان کردی بە هـەرا :
ـ کوا ــ خـە جیج . . . کالـیێ . . ئەوە لە کوێن ؟ کوا سەماوەر؟ بو کەس دیار نیە؟
لە گەل هـەرای ئەو ژنیکی رەنك زن وریا روو خوش‌بە ریز وە ژوور کەوت . زور بە گەرمـی بە خیر هاتنی کردم و رووی کردە پیاوەکە و گوتـی :
ـ زەلام ئەوهەرا هەرایەت لە چی یە؟ . ئیستا هەموو شت حازر دەبـێ .
توزێ‌خوم گەرم کردەوە و پرسیم : " لە کوێ دەتوانم دەستنویژ هەلبگرم؟ ."
ژنەکە بانگی کرد : " کالـی . . . دا تەشت و مەسینە بینە بو دەستنویژ ."
ئەوەندەی نەچـوو کیژیکی جوان چاك، قیت و قوز کولمە سوور، پوشتە و لیباس‌خاوین ـ وە ژوور کەوت و تەشت و مەسینەی دانا و بە خیر هاتنی‌کردم و بەرمالی راخست و ئاوی بە دەستی دا کردم. لە کاتی ئاو بە دەست‌داکردن‌دا یەك دوو جار لە بنەوە چاومان لیك کرد و ناشزانم نویژەکەم چـەندە وەبەر کەوت . من تا ئەو دەم جوانی ئاوام کەم دیبوو یا هەر نەم دیبوو. تا من لە نویژ بوومەوە کالێ سەماوەری‌هینا و دەزگا ئامادە بـوو.
هەرلە نویژ بوومەوە کابرا کە بوم دەر کەوت ( مام هـەمزە)بوو بانگی کرد :
ـ دا وەرن چایە تیکەن ." دایکی کالێ کناوی ( خەجیج)بوو هاتە ژوور و لە بن سەماو وەر دانیشت. چایەکی تیکرد و من ئیتر سەرما و ماندوو بون و ریگام لە بیر چـو بووە و حەسابوومەوە . مام هـەمزە بانگی کرد و گوتی : " ئەمیی میوان برسی نەبـێ . ویـنجە و ئالیکی بدەنـێ . " . پاشان‌گوتی : " هەموو شتزورە لە خەمێ دا مـە بـە ".

مام هەمزە گوتی . " خۆ پرسیار عەیب نیە ، با ئیمە میوانی خۆمان بناسین".
ــ خەلکی نەغەدەم ئاشناو برادەری سەید رەحمانم. پیکەوە لە شار بووین و ئەو نارد ووەسی میوانتان بم ."
خات خەجیج وەدەنگهات . "دەك رەبی بە خیر بێی . ئاکا تو میرزا کەریم بی ؟ سەید رەحمان ئەوەندەی باسی تو کردوە هەر بە ئاوات بووین بت بهێنین ."
بە خیر هاتن و چاك و خوشی دوویاتە کراوە و چا یان تێکرد و دووسێ پیاوی دیکە هاتنە ژوور بە خیر هاتنیان کردم. نان و چیشتێکی فرە بە تام و چێژیان ساز کرد بوو. ئەو قسەو باسمان زور گەرم و خوش بوون. خات خەجیج کەوتە پرسیاران . وەزعی ژیان و دایك و باب و چەند خوشك و براو و بۆچی ژنت نە هێناوە و . . . ".
ئەویکی خوشم رابوارد و بەیانی دوای نان و چا خواردن، گوتم ئەسپەکەم بو زین کەن دەرۆم . زوریان هەول دا کە گیر بم . خات خەجیج و پیاوەکان گوتیان ئێرە مالی خۆتە و دەمێ پتر هاتوو چۆیە بکەی . وا دیار بوو خات خەجیج کەیخوداو کار بە دەستی مال بوو. پیش ئەوە چەکەکانم دەمێ کەم خەجیج بانگی کرد . "ئەرێ کالی . . ئەوە کوریەی جوانت نیە بو میرزا کەریم بینی . زور ساردە ". کالی چوتە کوریەکی زورجوان و نەرمی ( کورو) ی بو هینام . پیکەنیم و گوتم زور جوانن جا ئەوە بە چیت لێ وەرگرم .؟ "
مام هەمزە گوتی . "کورە دەمێ بان کە و بە نیشانەی وەرگرە". بوو بە پێکەنین و هەستام سوار بووم بەرەو دەلکەاتی . گوتیان چاوە روان دەبین بیرەدا بێیەوە .
نیوەرو بوو گەیشتمە دەلکەاتی و مالە مام قویتاس کە کاتی خوی باسێنم لە سەر خوێند بوو. بەلام ئیستا ببوینە خزم و برازای مام قویتاسم مارە کرد بوو. لە گەل کاك سولتانی نرکوری مام قویتاس چەند جار یەکترمان دیبوو دوستی نیزیك و هاوڕێ بووین .
کاك سولتان کە لێم وەدەر کەوت واقی ورما . چوینە ژوور و گوتی ". جاری پێم بسێژە بەو سەرما و سولە، بەم تا ئەمتی ریگا و ئەم تاوە هەموو لەشکری عەجەمی تیدایە، خیرە ئیشەلا و لە چی دەگەریی ؟ ."
ــ ئەو رو روژی پیاوانە . هاتوم دووسی تفەنگان بکرم .
هەر بە جاریك حەپەسا . " . تفەنگی چی ؟ جا وەختی ئەو قسانەیە ؟ .
ــ تو لەوە گەرێ . خوت ساز کە و بەیانی بچینە نێو کوران تو دەیانناسی و تفەنگ پەیدا دەکەین .

کاك سولتان لە نێو گورانەکانی سەر چۆمی جەغەتوو دەست و برادەری زۆر بوون و دەمیان ناسی . بەمیانی ئەسپەکمان بەجێ هێشت و بەپێ بۆ گوندەکانی گۆڕانان کەوتینە ڕێ . دەوسێ گوند گەراین و میوانی دەوسێ برادەری کاك سولتان بوین لە هەر شوێنێ باسی تفەنگمان دەکرد، پێمان پێدەکەنین و دەیانگوت باسی مەکەن .
کاتی نیوەڕۆ چوینە گوندێکی مەزن ملکی (حەمید خانی) گۆران . دەستە برایەکی هەبو لاماندا لە مالی ئەوان وچایان سازکرد وکاك سولتان پێی گوت لە چی دەگەرێین.
کابرا گوتی : " ئیرە ملکی حەمید خانە . خۆی لە سەر دەمی دیموکرات دا رای کرد بوو چریکی حکومەتی بوو. ئێستا سوارە و چەکداری هەن و پیاوی دەولەتە . لیرە نابێ باسی ئەم شتە بکەن ."
لێم پرسی : حەمید خان لە مالە ؟ .
ــ نازانم . هەموو رۆژی دەچێتە میاندواو . پیاوی دەولەتە .
ــ تکایە پرسیارێك بکە بزانە لە مالە .
کاك سولتان گوتی : " بۆ بە تەما چی ؟ .
ــ دەچمە لای حەمید خان و دەلێم لە تفەنگ دەگەرێم .
ــ ناکا وا بکەی، بە گرتنمان بدە و نەجاتیمان نەبێ .
ــ ئەم گۆڕانانە زۆر پیاون . هیچمان لێ ناکا . زۆر زۆر دەلێ نیە و بڕون .
کابرا هاتەوە وگوتی :" ئێستا لە میاندواو گەڕاوەتەوە . کابرا لە گەلمان هات بۆ مالی حەمید خان . حەسارێکی گەورە دوو تفەنگچی لە بەر دەرگا رایان گرتین تا خەبەر بە خان دەدەن . تاوێك پێ چوو کوڕێك مێرمندال هات بە خێر هاتنی کردین و پێشمان کەوت بۆ دیوەخان . دانیشتین وکاك سولتان نیوە گیان ببوو دەیگوت لەم کارەی تۆ سەرم سوڕ ماوە . زۆر پێ نە چوو سەماوەریان هێنا وچایان بۆ تێ کردین و پاشان نانیان هێنا وجارێ خان دیار نیە . کورەکەی جار وبار دێت تۆزێ دادەنیشێ و ئەڕوا. دوای نان خواردن حەمید خان وەژوور کەوت . پیاوێك بالا بەرز چوار شانە سمێلێکی زل کە لێوی داپوشی بوو، دەمانچە بە قەدەوە . دەستی لە دەستی ناین و بە خێر هاتنی کردین و پرسی : " لە کوێوە هاتوون و لە چی دەگەرێن ؟ .
ــ خان رەنگە پێت سەیر بێ ئەگەر بلێم لە چی دەگەرێین . من خەلکی نەغەدەم. خۆت دەزانی لەشکر هێشتا نە هاتوتە سندوس . پرە لە بارزانی . هاتبووم بەلکوو لەم گوندانە

تفەنگێك بكرم. زۆر گەڕاوین وەگیرمان نەكەوتوە. نیوبانگی جەنابتم بیستبوو ئەم شیعرەی سەعدیم هاتەوە بیر كە دەڵێ :

جز بە خرد مسند مفرما عمل ـــــ گر چـه عمل كار خـرد مـند نیست

بریارم دا بێمە لای جەنابت جانازانم .

ـ زۆر بە خێر بێن . بەلام تونازانی من دژی دیموكرات بووم و ئیستا چەكداری حكومەتم دەولەت گەڕاوەتەوە و بێجگە لە پیاوی حكومەت كەس ناتوانـی چـەكی هەبیت؟ .

ـ ئەوانە هەمموو دەزانم . من لە چوار چیوەی قانون و حكومەتدا نە هاتووم داوای چەك لە جەنابت بكەم. من نەدیو ونەسیاو هاتومە مالت . ئەگەر تفەنگ نەبێ نان و چامان خوار دوە و مالاوایـی دەكەین .

لە گەل ئیمە چایەكی خواردەوە و هەستا رۆیشت . زۆری پێ نە چـوو كورە میر مند الە كە تفەنگیكی برنوی سوارەی بە دووسەد فیشەكەوە هێنا و لە پێشی دانام. تەماشام كـرد لە رادە بەدەر جوان وتازە بوو. گوتم : " قیمەتی چـەندە ؟ "

ـ بابم هیچی نە گوتـوە .

چاوە روان بووم خان بێتەوە و بزانم دەبێ چەند پارە بدەم . خان وەژوور كەوت .

ـ چۆنە ؟ ئەو تفەنگەت بە كە یفی یە؟ .

ـ زۆر سوپاس . . . زۆر جوانە . . بەلام نازانم قیمەتی چـەند ە ؟ .

ـ قیمەتی نیە . تۆ لەم كاتەدا كە دەولەت هاتوتەوە و چەك قەدەغەیە لە خۆت را دیوە هاتویە مالی من ئەو تفەنگەت پێشكێش دەكەم . دنیا زۆری بە بەرەوەیە . بەلام ئاگاتان لە خۆ بـێ . لە جیگای تر باس مەكەن . لێرە بن تا ئیواری . تاریك داهات وەدەر كەون و كەس نەتان بینێ . دەستی لە دەستی نایین و رویشت . پاشان كورەكەی هات لە پەنام دانیشت . پەنجا تمەنم لە پێشدانا وەری نەدەگرت . بە زۆری خستمە نێو گیرفانـــی چوە دەری سەد فیشەكی دیكەشی بۆ هێنام . تاریك داهات وەدەر كەوتین و شەو لـە ( دێی وەیساغا ) چوینە مالی ( مینەی فەتاحـی ) . لەو سەفەری لە گەل مەلا عەولای ـ حاجی مەلا خالیدم كرد بوو لە گەل ( مینەی فەتاحی ) ببوومە ئاشنا . براكانی وەدەركەوتن و زوریان پـێ سەیر بوو. رۆژیك لە وێ بووم بە هۆی مینە فەتاحیەوە چوار تفەنگی دیكەم كرین . بە كورتی پینج تفەنگ و ٧٠٠ فیشەك بۆم كەوتبوونە ٢٩٠ تمەنی . دەبوایە كاك سولتانیش لە گەل خـۆم بەرم بۆ سندوس . شەویك لە گەل كاك سولتان قوبتار سوار بووین

شەو هاتینە کوسە کەریز و سبەی شەو سوار بووین چووینە گورتاوی مالە دەزگیرانەکەم . بەهانی تفەنگەکانمان بە جێ هێشت و دە هاتین بۆ نەغەدە لە سەر جوگەی چیانە تونی کاک ئەحمەدی کوری سەید رەسووی زیدان بووم . دوو کەسی عیراقی لە گەل بوون .
بە خیر هاتن و چاك و چۆنی و گوتی : " ئەوە دە هاتمە مالی ئێوە . دەمێ دەوەسی تفەنگانم بۆ پەیدا کەی " .
ــ وەختێکی باش هاتووی . پێنج تفەنگم هەن با بچین بیان بینە ئەگەر بە کەیفت بن هەلیان گرە . هەر لەوێ لە گەل کاك ئەحمەد گەراینەوە بۆ گورتاوی . لە سەر یەك هەموو تفەنگەکانی یەکی بە ۷۰۰ تمەن هەلگرت . پارەکەی دا و ئیتر نەهاتە نەغەدە و گەراوە .
زستانی یەك دوو سەفەری دیکەم کرد و پولێکی باشم قازانج کرد . دوو بارگینی دیکەم کرین و جار وبار ژن براکەشم لە گەل خو دەبرد . هەمو جار دەچوومە لای مەلا مستەفا و خەبەری لای میاندوا و لەشکری دەولەتی لێ دەپرسیم . هەموو جاریش سەریکی حاجی خوشم دەدا و لەو مالە باشە لە رادە بەدەر ریزیان لی دەگرتم . بەلام نەم گوت بوو دەزگیرانم هەیە و جار و بار لە گەل خات خەجیج و کالی بە لا تاو باسیکی وام دە هێنا گوێ کە کالیم خوش دەوێ . خات خەجیج زوری پێ خوش دەبوو قسەکانی بۆنی هیوادار یان لێ دەهات . لەلا یەکی دیکەش دەزگیرانم هەبوو هیچ نە دەکرا .
لە زستان دا ( سەفەر خانی قارەمانی و پولا و بلوت ) کە ئەفسەری فیرقە بیون و ئەم دوانەم پێشتر لە نامات دەناسی و بۆ ئازایەتی نێویان هەبوو هاتنە نەغەدە و میوانی من بوون . ئەو دەم سەرهەنگ غەفاری بۆ وتو ویژ لەگەل مەلا مستەفا جار وبار دەهاتە نەغەدە و میوانی قولیخان دەبوو . قولیخان کە کار بەدەستیکی بەرزی حکومەتی میللی ئازربایجان بوو ئیستا ببوە خزمەتکاری بروا پێ کراوی حکومەتی ئیران . خەبەریان زانیبو کە ئەم سێ ئەفسەری فیرقەی دیموکرات لە مالی من میوانن . روژیك قولیخان لە دوای ناردم و گوتی : " دەولەت دەزانێ ئەوانە لە مالی تون . سەرهەنگ غەفاری باسی کردوون . بۆ تو باش نیە . یان دەریان بکە یان دەنێرم دەیانگرم " .
گوتم : " تا لە مالی من بن کەس ناتوانێ بیانگرێ . هەتا خوشیان نەرون میوانن و من دەریان ناکەم . " ــ بەلام دوای چەند روژ خویان هەستیان بەوە کرد کە لێ یان دەخەفتین چوونە چیانە و لە مالی ( عەزیز بەرگەل ) بوون و تا لە گەل بارزانیەکان

وەدەرکەوتن و لەشەرەکانی شنۆ و دەشتەبیل دا بەشداریان کرد و پاشان چوونە عیراق و لە زێنوێ شێخ گیرسابوونەوە .

لە مانگی رەشەمەدا هێشتا بارزانیەکان لە نەغەدە مابوون و هیچ باسی ئەوە نەبوو کە بکشێنەوە بۆ شنۆ یا شەر دەست پێ بکا سەفەرێکی دیکەم کرد بۆ شاعات . نادرم لە میاندواو چوار فەردە شەکریان بۆ کریم و بە وشتران ناردمە حاجی خوش مالە قەیتەران . چوومە بازاری شەیتاناوا و کابرایەکمان دیتەوە گوتی : "تفەنگێکی سوارم هەیە . بە پێنج سەد تمەن سازاین و پارەکەم دایە و قەرارمان دانا سبەی ئەو بچم وەری بگرم . لە دێی وەیسلغا سوار بووم چوومە ( تویزئاوا) کابرا لە مال نەبوو خێزانی گوتی : "چوتە میاندواو" . رۆژێکی دیکە چووم کابرا گوتی : "پارەم داوە و قەرارە بۆم بێنن" . بە کورتی کابرای عەجەم حەوتویەکی تەواو دەستاودەستی پێ کردم .
رۆژی شەمو لە بازاری شەیتاناوا بە کابرام گوت : "من پێتر گیر نابم . دەچمەوە سندوس پاش پازدە رۆژ دێمەوە تفەنگەکەم بۆ حازر کە ."

هەر ئەو رۆژە لە بازار تفەنگێکم لە کابرایەکی خەلکی تالاو کری و قەولی دا نوێژی شێوان بۆم بێنێتە ( دێی وەیسلغا) مالە مینەی فەتاحی .

## شەرە کورد لە نێوە راستی بازار

لەگەل برادەران لە نێو بازار دەخولاینەوە دیتمان دوو کورد ملیان دەبەر ملی یەك ناوە و لیك دەدەن و بە کەس لیك نابنەوە . من لێیان چوومە پێش و بە توندی و بە شێوەیەکی ئامرانە دەنگم دان وگوتم : "سەگبابینە کورد لەو حالە دایە و ئێوە لە سەر چی بە شەر دێن . بکشێنەوە تولە باب" .
وەك سامێك بیان گرێ و پێیان وابوو داخوا من کێم ، کشانەوە و هەر یەکە روویان دەلا یەك کرد . خەلکەکە بلاوەی کرد و کاك سولتان و مینەی فەتاحی گوتیان : "باشە ئەوانە بۆ ئاوا بە قسەی تۆ لیك بوونەوە . بۆچی نەیانگوت تۆ چکارەی ؟" .

تازە تاریك دادەهات کابرای تالاوی تفەنگەکەی بۆ هێنام . پاش نان خواردن سوار بووم لە گەل برای مینەی فەتاحی چووینە ( تویزئاوا) . لە دەرکی کابرای عەجەم دابەزیم و بارکێشم دا بە دەست قالەکەم و بە لوولەی تفەنگ دەرگام کردەوە . کابرام دەنگ دا

وکوتم : " ئه بزووی ئه‌گرت تۆ بەر دەدەم." دایکی و ژنەکەی دەستیان کرد بە گریان و پارانەوە . گوتم : " لە جێی خۆت مەبزوو ژنەکەت پارەکەم بۆ بینێ و یا تفەنگ".
ژنەکەی هەستا لە یەخدانێک پارەی هێنا دەر و ئەم هێشتا بێتە پێش . پارەکەی دانا دەستم دایە و وەدەر کەوتم . لە دەرەوە دەرگام گاڵەدا و سوار بووین . ئەو لە ماڵە مینەی فەتاحبەگیر نەبووم و دوای ئیوە ئەوکە پێنتە حاجی خوێ و لە ماڵە کاڵی لیم وەدەرکەوتن و تفەنگەکەیان شاردەوە و جێیان بو داخستم و لێی نوستم .

وەک لە بیرم مابێ خوشکی خات خەجیج مێردی بە یەکێک لە ئاغاکانی حاجی خوێ کرد بوو . بەیانی بەرەوەرین لەماڵی ئاغا بانگێشتن کراین . پووری کاڵی گوتی پێمان خوشە ببیە زاوامان . کاڵی کچێکی باشە . بەداخێکەوە ناچار بووم کە راستی بلێم گوتم : "من دەزگیرانم هەیە و تازە مارەم کردوە". ئەم راستییە بە هیچ جور هەڵویستی ئینسانی و خوشەویستی خات خەجیج و کاڵی‌ی نەگوری . ئیستا کە ئەو بیرەوەریانە دەنووسمەوە ریز و حورمەت و پیاوەتی و جوامێری ئە و ماڵە باشە و ئەو ئینسانە پاکانەم هەر لە بیرە و لە یادم ناچن . ئەو داوام لێ کردن کە شەکرەکەم بە وشتری خویان بەرەو بەرنەوە نەغەدە . کاک عەزیز کە دەراستی ماڵێ بوو بە براکەی گوت : "ئەوەکی ئەم دوو بارە شەکرە بارکە و بیبە نەغەدە . قادریسی ماڵم دایە و ئێمە نوستین .

ئەوەکی ئەو برادەرە جوامێرە وشتران باردەکا و بو نەغەدە . لە قاوەخانەی کوسە کەریز تووشی حەسەناغای کوسەکەریز دەبێ . لێی دەپرسێ :

ـ ئەو بارانە چین و بۆ کوێ‌یان دەبەی ؟"

ـ شەکری میرزا کەریمی حیسامیە و دەیبەمەوە نەغەدە .

ـ بەیان بە کوسە کەریز و لە ماڵی خوشکی دایان بنێ . بارزانی لە نەغەدە وەدەر کەوتون و لەشکری ئیران چوتە نێو شار . بچیە سند ور وشترەکانت دەچن و شەکرەکەش دەروا".

ئیتر برای کاک عەزیز وشتران دەباتە کوسە کەریز و بارەکان لە ماڵی خوشکم دادەنێ . ئەو نانمان دەخوارد هاتەوە . حکایەتی بۆ گیراینەوە . من کیچم کەوتە کەوڵ و کوتم :

ئەسپم بو زین کەن دەروم". زوریان هەوڵدا کە گیر بم تا خەبەریکی راستمان بۆ دێت . ئەم دەتوانی . ئەم دەزانی دایک و بابم چی‌یان بە سەر هاتوە . پیاوەکان وەدەر کەوتن کە ئەسپم بۆ زین کەن من و خات خەجیج و کاڵێ مابووینەوە و فینەکدانم لە خو دەبەست کاڵی گوتی : "بو لای دەزگیرانی بە پەلەیە". خات خەجیج گوتی

"كوێت لە پلاری كاڵی هـەمیە".
ـ گوێم لێ یە. جاریكی تر بێنەوە جوابی دەدەمـەوە.
ـ ئێرە ماڵی خـوتە و پێمان لێ نە بری.
وەدەر كەوتم سوار دەبووم. ئیستاش ئەو دەعا یانەم هەر لە بیرە كە خات خەجیج بـوی دەكردم. بە سوپاس و مەمنونیەكی زورەوە لەگەڵ حەسرەتێكی دەرونی لەو پیاووژنە باش و بە شەرەفانە ماڵئاواییم خواست. بە داخەوە سەفەری دوایم بوو بو حاجی خوش.
شەو بە پێناری خـەلیفان و بالەخچی دا چـوەە گورناوی ماڵە دەزگیرانم. كە چومە حەسار و دەرگایان لێ كردەوە دیتم دایك و باب و خوشكم بە سەلەت و قولتی لـە نەغەدە ماڵیان بە جێ هێنتوە و لە وێن.

## وەفای بارزانیان

لە پیش دا گوتم ماڵەكەمان روبەروی ماڵە شێخ محمد سدیق و مزلی مەلا مستەفا بوو. دوو بارگینم لە ماڵی هـەبوون و بەو هیوایە ئەگەر بارزانی لە نەغەدە وەدەر كەون لە گەڵیان بروم. كاتێك بارزانی بریار دەدەن لەنەغەدە برون عایشوك دەچێ بەدایكم دەڵێ ئێمە دەروین. باوكم خەریك دەبێ خۆ كوێكاتەوە و بارگینەكان بار كا و بچێتـە گورناوی. دووبارزانی كە ناسیار بوون و هەمیشە هاتوو چویان دەكرد و لە ماڵە شـێخ محمد سدیق دا بوون) دەچنە ماڵێ و بارگینەكان لە بابم دەستێنن و دەیان بـەن. دایكم دەچێتە ماڵە شێخ محمد سدیق و بە عـەلی كوری محمد سدیق دەلـێ:
"ئێمەش دەمانەوی بروێن و ناتوانین لێرە بین. بارزانی هاتوون و بارگینەكانی ئێمەیان بـە توبزی بردوە." لە وەلام دا پێی دەڵێن لە شنویە ولاخەكانتان دەدەینەوە.
باوكم لە ترسی ئەوە كە من ناسراو بووم ئیتر لە گەل دایكم و خوشكم و ئاموزایەكی پچوكـم رادەكەن و دەچنە گورناوی. زور كەس تریش لە كوردەكانی نەغەدە لە ترسی عەجەمان هەلدەبن و ماڵ بە جـێ دێڵن. لەگەڵ هاتنەوەی لەشكر ئیتر عـەجەم پێ ومر دەبن و ماڵەكەمان تالان دەكەن. پاشبوو باوكم چـەند روژ پیش تیپینی كرد بوو یەك دوو دەست پـێ خەف و كامینەكان و هێندێ شتومەكی نارد بـوە گورناوی.

کاتێک گەیشتمەوە دایک و بابم گەلێک پەشێو بوون . مالیان تالان کرابوو یا شی‌ئەو هـەموو خزمەتەی کە بە بارزانیانیان کرد بوو، ولاخیان لێ ئەستاند بوون، لەسەر مالان بوون . بارزانی لە کاتی کشانەوەدا بۆ شنۆ لە هـەموو گوندەکان ولاخیان لە خەلك ئەـ ستاند بوو ئەوێنیە شی خۆیان ناهەقیان لە خەلك کرد بوو . لە گۆرناوی دوو بارگین و گوێ دریژیان برد بوو . رۆژێك لە مال حەسامەوە و خەبەرم زانی کە حـەمەد ئاغا ئامیرگەسوور لـە قەلاتانە . دوو کەسی خەلکی گۆرناویم لەگەل خۆ برد و چووەم لای حەمەد ئاغا . هاشمی سەعید، خەلکی سابلاخ وەك نووسەر لەلای بوو . حەمەد ئاغا دەیناسیم . پاش بە خیر هاتن گلەییم لێ کرد و گوتم : " مالە شیخ محمد سدیق بە راستی چاکەیان داوینەوە . دوو بارگینیان لە باوکم ئەستاندوە و بردوویانە . بارگین و گوێ دریژی ئەم دوو کەسەشیان لـە گۆرناوی بردوە . زۆری پێ ناخوش بوو پسولەیەکی نووسی : ولاخی هەلگری ئەم پسولەیە لای هـەر کەس بێ ئەشێ تەسلیمی بکرێنەوە ".

نامەکەم وەرگرت و گەرامەوە بە رێگای جاشیراندا بچم بو شنو. لە جاشیران بارزا ـ نیەکان گامیشێکی مالە ئاغایان کوشتبووە و لێی هالا بوون . ولاخەکانی گورناوی لە بـەر دەرگای مالێك بەسترا بوونەوە . چووەمە مالەکە یەك دوو بارزانی لێ بوون . گوتم :

" ئەم ولاخانە ئی مـەن و بمان دەنەوە ".

کابرا گوتـی : " ئەز بۆ خوەم هینناوین و نادەمەوە بە کەس ".

پاشان چـووم مەلا حـەسـەن ـ م دیتەوە مسئولیان بوو . نوسراوی حەمەد ئاغا م پێ نیشان دا و گوتم : " ولاخەکان لێبەن ". بۆ خۆ هات ولاخەکانی تەسلیم کردینەوە . ئەوانم ناردەوە بۆ گورناوی و بۆ خوم لەگەل مامی دەزگیرانم چـووەمە شنو. لە مالی شـیخ محمد سدیق دەگەرام بە هەلکەوت لە پیش حەساریك عایشوکم دیت . کە چاوی بە من کەت ماندوو نەبوونی لی کردم و گوتی : " ئیستا عەلی دەنیرم ". چووە ژوور و عەلی هاتە دەر.

ـ دە کەرەم کە وەرە ژوور

ـ نایەم . چۆن دەبوایە ئێوە بارگینی من لە باوکم بستێنن .

ـ خودێ ئەز تشتێك نازانم .

عایشوك گوتی : ئەز زانم کی بردوونی . ناوی دوو بارزانیانی گوت.

عەلی گوتی بلا بچین لای شیخ ئەحمەد . ولاخی تە ناچن . حەوشێکی گەورە نیزیکەی ـ هـەزار کەس لە دەور وبەری راوەستا بوو. زۆربەیان لە ناوچەی بوکان و محال و شارویرا ـ

ئەوە هاتبوون و وەدوای ولاخان کەوتبوون کە بارزانی کاتی گەڕانەوە لە جەبهە لێیان ئەستاند بوون . زۆری پێ نەچوو شێخ ئەحمەد هاتە دەر . عەلی چووە پێش و بە زمانی خۆیان گوتی : " کەریم لە نەغەدە دراوسێی ئێمە بوە . کەلێک بۆ ئێمە چاک بوونە . ناوی دوو کەسانی گوت کە ئەوانە ولاخیان لە بابی ئەستاندوە . شێخ ئەحمەد بە خێر هاتنی کردم و گوتی : " عەزو بیژن بلابیت " . بارزانیەکی درێژ هاتە پێش و شێخ فەرمووی " لەگەڵ کەریم هەرە . ولاخی ئەو لای هەر کەس بن لە هەر کوێ بن بیدەوە . مرۆڤێک لە گەل بنێرە تا دەگاتەوە ماڵی خۆ " .

عەزو ناوی بارزانیەکانی پرسی و گوتیان ئێستا لە ( پردئاوین ) . هاتینە گوندی پردئاوی و بارزانیمان دیتەوە . کابرا لە پێشڕا گوتی : " نایاندەمەوە " .

عەزو گوتی : " ئەمری خودانە " .

ـ ئەمری خودان لە سەر سەرا لە سەر چاوا " .

ولاخمان وەرگرتنەوە و هەر بە شەو هاتینەوە گورناوی . چەند رۆژێک لە گورناوی بووین شەری بارزانیان لە گەل لەشکری ئێران و دەرەبەگە خائینەکانی کورد کە چەکیان هەلگرتبوو هاتبوونە سەریان لە نەرزەمیز و قەلاتان و دەربەند دەست پێکرا .

ماڵە خەزوریشم چوو بوون لە گوندی ( قزلقوبی ) شار ویران جێگایان دیتبووە و باریان دەکرد . رۆژێک لە گەل ماڵە خەزوورم بارمان کرد بۆ شار ویران . لەنێزیک کوسە کەریز ئێمە لامان دا چووینە کوسەکەریز ماڵە خوشکم و دەزگیرانیشم لەگەل خۆمان برد . ماڵە خەزوریشم چوونە قزلقوبی و خوشکیان لە گەل خۆ برد . ئەوە بوو شایی و ژن گوێزتنەوەم .

## بەشی پێنجەم

### دیسان کۆچەرەوەری و درێژەی تێکۆشانی سیاسی

لە کۆسە کەریز ماوەیەک لەسەر ماڵە خوشکم وەزعێکی باشمان نەبوو. ڕوخانی کۆماری مەهاباد، لە داردانی پێشەوا، زوڵم و زۆری داگیرکەران، ترس لە گرتن پەرێشانی کرد بووم. نیزیکەی مانگێک لە ماڵ دەرنەدەکەوتم. بەڵام بێکار و کاسبی و لە سەر ماڵان ژینێکی خۆش نەبوو. تفەنگ و دووبارگینەکەم فرۆشت سوار بووم چوومە شامات. لەو ماوەیەدا لە شامات دۆست و برادەری باشم پەیدا کرد بوون. لە بازار تووشی (جەعفەر کرمانج) بووم. جەعفەر کرمانج پیاوێکی ناسراو و ئازا و کاتێک پیاوی مستەفا خان و پیاوی جەعفەری کەریماغا بوو. دەمناسی و بە پیاوێکی جوامێرم دەزانی. گوتی تفەنگێکی سوارەم هەیە لێم بکڕە. دوورۆژی تر وەرە لە (لەجێ) وەری بگرە. پارەم دایە و هاتمەوە کۆسە کەریز. دوای دوورۆژان چووم گوتی: "ببورە تفەنگەکەیان نەهێناوە".
بەکورتی یەک دوو جار چووم یا دەیانگوت لە ماڵ نییە و یا بیانوویەکی دەهێناوە. لەم بەینەدا نەخۆش کەوتم. مانگێکی ڕەبەق کەوتم. دایک و بابم شەو و ڕۆژ لە بن سەرم دەنزیا باوکم دوو جار چووبووە لای کاک جەعفەر، هەر جارە بە قسەیەک بەڕێی کرد بووە. ڕۆژێک تازە دەهات خۆم دەگرتەوە سوار بووم چوومە لەجێ. داوای پارەم کرد. جەعفەر کرمانج گوتی: "ئەوانەی تفەنگم لێ کڕیبوون پارەکەیان خواردوە و ئێستا کێشەمە لەگەڵیان. وەرە با لە جیاتی پارەکە گەنمت بدەمێ". یەک دوو برادەرم هەبوون گوتیان هەرچی پەیدا لێی وەرگرە. ناچار دەبار گەنمم لێ وەرگرت. بردمە ورمێ ٢٤٠ تمەنی زەرەر کرد و نەجاتیم بوو.

کێشەی دووسەیەی مووسوڵمان.

ڕوژێك لە كوسە كەریز لە مالەوە دانیشتبووم سەید ڕەحیمی كوڕی سەید عەولای قەلاتی موتاوی پەیدا بوو. بە خێر هاتن و پاش‌ئەوان وچا گوتی . «بێس‌پیوە بووم عیلاجیكم‌نەكەی تێدا چووم .»

ــ چیە ؟ . چت‌لی قەوماوە ؟ . هەرچی لە دەستم بێ بە چاوان .

ــ سەید گول خەلكی سستەكی پەنا تالاوی هەزار تمەنی لی وەرگرتووم كە دوو تفەنگانم بداتێ . ئەوە دەمروژە دەستاودەستم پێ دەكا و فریوم دەدا . هاتوومە لای تو یارمەتیەكم بدەی .

سەید گول لەو شێخانەی غەوساباد بوو. هاتبوو لە شامات ئەویش بەشی خوی ــ دەرویش‌گەری دیتبوونەوە و خوی بە خێو دەكرد . بابم فەرمووی سوار بە لە گەلی بچوو. سوار بووم لە گەل سەید ڕەحیم چوینە دەلكداری مالە كاك سولتان قویتاس . بەیانی بازاری شەپتاناوا بوو كاك سولتانیشمان برد وچوینە بازار. لەوێ چەند دوستو برادەرم دیتنەوە و مەسەلەكەم پێ گوتن . گوتیان ئێستا دەی بێنینەوە و پارەكەی لێ دەستێنینەوە . سەید گولمان دیتەوە و لە هەموو لایەكەوە بە سەری داهاتین وگوتی . بەدەستمەوە نە بوو. سبەینێ فەرموون وەرنە مالێ و پارەكە وەرگرنەوە . دەبێ بمبوورن .

شەو هاتینەوە دەلكدارێ و سبەی لەگەل سەید ڕەحیم سوار بووین چوینە سستەك لە مالی سەید گول دابەزین و گوتی یاخوا بە خێر بێن دەزانی ئەو شەو تفەنگەكانیان هێناون .»

ــ باشتر، كەوابوو تفەنگەكان دەبەین .

ــ باشە ئیستا ئیستراحەت بكەن و تاریك دابێ تفەنگەكان دێنم . نوێژی شێوان نانمان دەخوارد سەید گول وەدەر كەوت . زوری پێ نەچوو بە هەناسە بڕكە خوی كرد بە ژوورا وگوتی : «دەخیلتان بم ڕاكەن . ژاندارم گەیشتنە نێو گوندی . سەرومالمان تێدا ـ دەچێ . پاشان خوم ولاخەكانتان بو دێنم».

سەید ڕەحیم تەمای بوو دەر پەڕێ . گوتم دانیشە . ژاندارم هاتن جهەندەم . هەموو لەشكری ئێران بێنی نابزوم یا پارە و یا تفەنگەكان .»

هەر چەند شێر و ڕێوی هێناوە فایدەی نەبوو . ئاخری پارەكەمان لێ هەستاند و سوار بووین چووینەوە مالی كاك سولتان لە دەلكدارێ.

## بازاری محەمەد یار وعەجەمی بە شلتاخ

رۆژی هەینی بازاری محەمەد یار دەبوو بە ناوەندی کڕین و فرۆش و لە کوردستان و ئازربایجانەوە خەلك رووی تێ دەکرد . منیش بۆ ئەوە سامم بشکێ و بچمە نێو خەلك رۆژی بازار لە گەل سەید عەزیزی زاوام سوار بووم چوومە محەمەد یار . لە دوکانی برادەرێك دانیشتبووم چام دەخواردەوە کابرایەك هاتە پێش دوکان و بە ترکی گوتی :

ــ سەن میرزا کەریم دایل سەن ؟ ". واتە تو میرزا کەریم نی ؟ .

ــ بەلێ هەوم . کاریکت پێم بوو؟ .

ــ ئەوە لە تۆ دەگەرام . لە بیرتە لە باخی ئالی ملك سەرت شکاندم و ئەغەنگت دەست دا ــ بویە؟ ". کە لی ی وردبوومەوە عەجەمی ئالی ملك بوو کە پێش سێ سال باخەوانەکەم سەری شکاند بوو. گوتم : " کینەی پێش سێ سال زیندوو ەکەوە .

ــ چوم خوم نووسیوە بە ژاندارم تا تولەی خوم بکەمەوە .

ــ باشە ئەگەر بووی بە ژاندارم وەرە قسان دەکەین .

ــ نا . . دەست هەلناگرمەوە . ئەو زەمان رۆی .

ــ برۆ کاکە کینەم بێ مەفروشە .

ــ ها ئیستا ش زمانت دەگەرێتەوە . جنێوی دا .

ئیتر ئاگام لەخو نەما . تا هێزم تیدا بوو مستیکم لە دەمی دا و زاری پر بوو لە خوین . رای کرد کە شتیك بەدوزیتەوە و بە گژم دابێ . لەوکاتەدا قولیخانی برای پاشا خانی ئاختەولە چەند چەکداری بەدواوە بەوی دا هات . چوومە پێش و دوای سلاو گوتم : " خان ئەگەر ریگا بەدەن عەجەمەکان وەدوای وردە حیسابی کون بکەون لێرە شەری کورد وعەجەم ساز دەبێ .

ــ بوچی بووە ؟

مەسەلەکەم بۆ گیراوە . بەنوکەرانی گوت : " بچن بیهێنن ". سەیفەلی یان هینا . خوینی هەر بە لغاوانەوە بوو. نەی هێشت قسە بکا بریکی جنێو پیدا و گوتی: ئیستالە بازار وەدەری بنێن . نە هێلن لێرە بمێنی .

ئەم هەنگاوە تۆزێك غیرەتی وە بەر نام و نە چوومەوە كوسە كەریز و شەو چوومە نەغەدە
بە رێكەوت تووشی سەید رەحمانی كوڕی سەید عەولای قەلاتی بووم. شەو پێكەوە لە مزلسی
ئەو رامان بوارد. بەیانی چوومە نێو بازار و لە قاوەخانەیەك دانیشتبووم عەجەمێكی خەڵكی
نەغەدە لە گەڵ ژاندارمێك وەژوور كەوت و بە قامك منی نیشان دا وگوتی: "ئەوەیە".
ئیتر ژاندارم بێ پرس و را دامگرتایە. راست بوومەوە و شەقێكم لە ژاندارم دا. دووسێ ـ
عەجەمی دیكە راست بوونەوە لەگەڵ ژاندارم لە قاوەخانەیان بردمە دەر و بە هەموان
دەوریان دام. لەو كاتەدا ئاجودانی ژاندارمەری گەیشتە بەر دەرگی قاوەخانە و دەنگی
ژاندارم و عەجەمانی دا و گوتی: "بەری دەن". بانگی دووژاندارمەی گەشتی
نێو بازاری كرد وگوتی: "بیبەن بۆ ئیدارەی ژاندارمە". وەپێش خۆیان دام و خەڵكی
نێو بازار بە سەیرەوە چاویان لێ دەكردم و كەس نە بوو زمانی بگەڕێ. لە ئیدارەی لە
ژوورێكیان كردم و دەرگایان داخست.

زۆری پێ نەچوو ئاجودان هاتەوە. بانگی كردم وگوتی: "دەمێكە لێت دەگەڕێین
تۆ تفەنگچی بووی یارمەتی بارزانیانت داوە. ئەفسەری فیرقە لە ماڵت بوون. ئیستا
دەوسییەت بۆ ساز دەكەم و دەتنێرم بۆ ورمێ. لەو قسانە دابووین سەید رەحمان هات.
بە ئاجودانم گوت: "كاتێك دەوڵەت نەبوو هەموو كەس چەكدار بوو. ئیستا دەوڵەت هاتوو-
تەوە منیش دانیشتووم و كاسبی دەكەم."

سەید رەحمان بە ئاجودانی گوت من لە بەر میرزا كەریم هاتم. لەو پرسیارانە گەڕێ
پازدە تمەنی لە پێش دانا وگوتی ئەوەش شیرنی تۆ وئیمە كارمان هەیە. لە گەڵ سەیید
رەحمان هاتینە دەر و بەوەندە لێدان و كێشمە رێگای نەغەدەم بۆ كرایەوە. یەك دوو ڕۆژ
لە نەغەدە بووم و لەگەڵ دوست و برادەران كۆ دەبووینەوە و باسی دەست نەكردنەوەی
رێبەرانی حیزب و حكومەتی میللی كوردستانمان دەكرد و داخمان دەخوارد.

## بۆ گردە قیت

مانەوەمان لە كوسە كەریز دایك و بابی زۆر نارەحەت كرد بوو. هەوڵم دا بچمە
مەهاباد بەلام نە سەرمایەم هەبوو بۆ كاسبی و نە خانووم وەگیر كەوت. چەند دوست و
ئاشنا گوتیان ئەگەر لە گوندێكی قەوغا دوكان دانێی بۆ كاسبی باشە و لە بەر چاوانیش

ون دەبـی . گردە قیت‌گوندێکی گەورەیە و قاسمی پیروتاغا ش پیاوێکی بە زیکە و ژاندارم زۆر خۆ لەوی نادەن .

رۆژێک سوار بووم چــوومە (گردە قیت) و میوانی قاسمی پیروتاغا بــووم . پاش‌نان خواردە گوتم : " هاتووم دوکانی گوندم بە ئیجارە بدەنـێ و ماڵەکەم بێتە ئێرە و خەریکی کاسبی بم " .

ــ زۆر بە خێر بـێ ی . خانووی مەلا چوڵە . خانوێەکی باشە ماڵەکەت بێنە و دوکان دابێ و هەرچــی دەکەی بکە و هیچیشت‌لێ ناستێنم " .

ــ زۆر سوپاس . بەلام ئاوا نابێ . دوکان بە ئیجارە دەگرم و بێ منەت‌کاسبی دەکەم .

لەو کاتەدا کاک فەتاحــی برای هات . باسی ئیجارەمان کرد و کاک فەتاح گوتی

ــ ساڵی ٢٥٠ تمەنی بدە و کەسی تر لە گوند دوکان دانەنێ " .

بەو قەرارە رێک کەوتین . عارەبەیەکیان نارد ماڵەکەم بار کرد و چــوینە گردە قیت . چوم لە مــەهاباد هێندی شرە برەی دوکانم کری و باوکم خەریکی دوکان بوو بە ئینسافــی خــوی شتی دەفرۆشت . گردە قیت‌گوندێک سەر ڕیگای ماشینی مەهاباد و ورمــێ‌بوو هاتوو چو بو ئەم شارانە هاسان بوو . شمسیەکەم فرۆشت و کردم بە دەسمایە .

## کــومــەڵەی لاوانــی لادێ

لە مانگی جوزەردانی ١٣٢٦ رۆژێک چومــە نەغەدە و لەگەل چــەند برادەرێــک باسی تێچوونی کوماری مــەهاباد و زولم و زۆری حکومەت و خەیانەتــی دەرەبەگەکانــی ماسەن‌ودیموکریمان هێنا گوری و هاتینە سەر ئەو باوەرە کە بە نهێنی ڕێکخراوێکــی تازە ساز بکەین . لەوێوە من چومــە شنو و لە گوندی نەلوس‌تووشی یەکێک لە کوردەکانــی ئەودیو بووم بە ناوی ( عبدالقادر ) . لەسەردەمــی کومــەڵەوە هاتبوە کوردستان و لــە کومەڵەدا ئەندام بوو پیاوێکی دلسوز و بۆکورد سوتاو . پاشان لە گوندی نەلوس ژنی هێنا بــوو لەگەل بارزانیەکان نەگەرابووە عیراق . کە چاوم پێ‌کەوت لە داخــی کەم و کوری کوماری مــەهاباد و بێ سەرەو بەرەیــی و تێکچونی حکومــەتی میللی داخــی دەرنەت و دەــ ستی کرد بەگریان . بردمیە ماڵەکەی خوی لەتاقە ژوورێکی کاول بوو دا دەژیا . نانمان خوارد و بو نوێژ چوینە سەر چــومــی و پاشان بە چوم دا هەلکشاین و لە بن دارێک دا نیشتین . باســی وەزعمان هێنا گوری و گەیشتینە ئەو باوەرە کە پێویستە لە پێش‌دا دژی

ئاغاو دەرەبەگی کورد خەبات بکری . بۆ ئەم مەبەستە پێویستە کۆمەڵێك لە لاوانی گوند دابمەزرێنین و تۆیان بکەینین کە خەیانەتی دەرەبەگی کورد بۆتە هۆی روخانی کۆماری کوردستان . عەبدولقادر کە پاشان بوو بە میرزا قادر دژی ئەوە بوو کە بە نوسین بەیان و پروگرامێك بلاو کەینەوە . جاری تەنیا ناسیار و باوەر پێکراوەکان ببینین . هەرکەس بوو بە ئەندام مانگی تەمەنێك بدا . من لەناوچەدا هێند بۆ لاوی تێکۆشەر و خوێن گەرم دەناسین چاوم پێیان کەوت و میرزا قادرم بۆ ناساندن بو نەغەدە گەراەوە .

لە نەغەدە لەگەل چەند برادەر پێوەندیم گرت و لاوێکی تازە پێگەیشتووی گەنج ظاهر بە ناوی ( کەریم پارسا ) بە نوختەی پێوەند و نوسین و نامە گورینەوە دیاری کرد .

قاوەخانەی محەممەدی سوفی رەسوو وەك بنکەی رێکخراو دیاری کرا . لاوەکان لەوێ کۆ دەبوونەوە و بە لاتاو و بە پلار باسی ئاغاکانیان دەکرد . من حەوتووی رۆژێك دەهاتمە نەغەدە و نامەم بو میرزا قادر دەنووسی . نامەکان کەریم پارسا دەینووسین کە خەتی خوش و کوردی باش دەنووسی .

باوکم تا رادەیەك لە دوکان و کاسبی کردە قیت رازی بوو . رۆژەکانی هەینی دوکانی دەبردە بازار و منیش ئەگەر چوو بام لە مەهاباد شتێکم بۆ کرییایە دەمنا بیکار بووم . لە گوندی ( تازەقەلا ) ی سندوس کابرایەکی دەولەمەندی دوکانداری قورس هەبوو بەناوی ( حاجی سەید محەممەد ) . حاجی چەند جار چوبوە حەج و لە رێگای ساختەچیەتی و بە ناوی حەج پارەیەکی قورسی وەسەر یەك نابوو . هەموو سالی لە سندوس بە پیرەژن و پیرە پیاوان دا دەگەرا پارەی لێ وەردەگرتن کە گویا لە مەککە حەجیان بۆ دەکری . کە دەهاتەوە هەریەکە گەزە کەشیدەیەك و یەك دوو وێنەی مەککە و مەدینەی بو دەهینان و دەیکردن بە حاجی . لەم رێگایەوە ببوە سەرمایەداریکی گەورەو سەید مستەفای کوری لە تاران بە لۆری کوتالی دەهێنا و بە دوکاندارانی دەفروشت .

ئەوساڵەی ماڵمان لە شەریفەدین بوو هاتوو چوی دوکانی حاجی سەیدم دەکرد و لە گەل سەید مستەفای کوری ئاشنایەتیم هەبوو . رۆژێك لە بازاری محەممەدیار حاجی سەید بانگی کردم و ناردی چایەکیان بۆ هینام و گوتی : " وەك بزانم ئیستا بیکاری . من دەراوم هەیە با هێندی پارەت بدەمی قازانج بە نیوەیی سەودای پێ بکە .

ــ پێم خوشە بەلام سەودای چی بکەم . ئیستا کاسبی زور کەمە " .

ــ دەلێن لە عیراق تفەنگ چاك دەفروشرین ئەگەر یەك دوو سەفەرت کرد بان زور باش

دەبوو. لەو سەرپێن دەتوانی پارچە بۆ من بینی."

من کە بێکار بووم لە خوام دەویست کاسبیەك پەیدا بێ و هەر لەو کاتەشدا بە بیانووی کاسبی وگەران دوست و برادەران ببینم و کۆمەڵەی لاوانی لادێ پەرە پێ بدەم. لەگەل حاجی ریك کەوتم و ٧٥٠ تمەنم لێ وەلا کرت چوومەوە بۆ باوکم گێراوە. بابم گوتی پێم خوێن نیە قاچاخی بکەی دەست هەلگرە".

ــ لە بێکاری هەر باشترە و تازە پارەشم وەرگرتوە با سەفەرێك بکەم. سواری ماشین بووم چومە سابلاخ و لەویوە چومە شامات (دێی وەیسلغا) چومە مالە مینەی فەتاحی.

تازە گەیشتبوومە جێ مینە لە نێو گوندێ بوو، چوون بانگی کەنەوە لە پر ئەفسەرێك و پێنج سەربازی سوار هاتنە حەساری. مالە کابر بە جارێك وشك بوون. دوویرای لە مالێ بوون خۆیان شاردەوە. وەدەر کەوتم کابرای ئەفسەرم بە خێر هاتن کرد. ستوانێکی فارس بوو نەدەهاتە ژوور. گوتی. "من نایەمە ژوور. ئەمرم پێ کراوە هەر ئێستا مینەی فەتاح بەرم بۆ میاندواو. سوار بە با بڕۆین".

ــ من مینە نیم. ئامۆزای ئەوم و ئێستا لە سندوسەوە هاتووم سەریان بدەم. مینە لە نێو گوندە و دەمنێرم بیتەوە. فەرموو وەرە ژوور."

ئەفسەر پاش تۆزێ بیر کردنەوە هاتە ژوور. وەتاخێکی پر فەرش و خاوێن. چایان هێنا. پێم گوت با سەربازەکانیش دابەزن و بێنە ژوور. نان دەخوێن و پاشان مینەش دێم چونکە مینە فارسی نازانێ. لەوکاتەدا مینە هاتەوە. سەربازەکان هاتنە ژوور و نانێکی باشیان ساز کرد. ئەفسەر گوتی. "بە راستی مینیان خەراپ تێ گەیاندبوو. لام وابوو کورد لە مالی خۆیان سەری خەلك دەبڕن. ئێستا لە میواندار ئێوە سەرسوڕ ماوە. دەلێم خۆزیا نەهاتبام. لەوکاتەدا کە تۆ هاتووی سەریان بدەی من ناچارم مینە لە گەل خۆم بەرم." گوتم قەی ناکا. پێیان خۆشبوو کە تۆ شارەزای داب و رەسمی کورد مواری بووی. دایك و بابی مینە هاتن و دەستیان کرد بە پارانەوە. "بە قوربانت بین تۆ لەگەلی نەچی مینە پێوە دەبێ. ولاخیان بۆ منیش ساز کرد و سوار بووین چووینە میاندواو.

بردیانینە لەشکر و ئەفسەر چوە ژوور و پاش بیست دەقیقە ئێمەیان بانگ کرد. ئەفسەرێك لە پشت مێزێك خۆی هەلسانەد بوو پرسی. مینە کێیە؟.

مینە هەستا سەر پێ و گوتی منم.

ــ فارسی دەزانی؟

ــ نەخێر.

بە منی گوت بوی تەرجومە کە . دیار بوو ئەفسەری پێشوو باسی بۆکرد بوو،
رووی لە مینە کرد وگوتی : " وەك بە ئێمە گوتراوە تو تفەنگ و فیشەك دەکری و بوعیراقیان
دەنێری . ئەوە سزای ئێعدامە . ئێستا دەولەت هەمیە و چەك کرین و فروشتن بە جا
ری قەدەغەیە ".
مینە گوتی : " قوربان بە جوقەی ئەعلاحەزرەت درۆیە . من جوتبەندمیەکی ئامیام. چوار
جوتم دەکەرین . ٣٠٠ سەر مەرم هەیە . دەمیازدە گامێش و مانگام هەن . چەند ولاخی
سواریم هەیە . پێویستیم بە قاچاخی و کرین و فروشتن نیە ".
بوم تەرجومە کرد و گوتم " جەنابی سەروان ئاموزای من زور دەولەمەندە . پێم
خوشە روژێك تەشریف بێنی میوانی بی . راپورتی بە درۆیان لی داوە .
ـ باشە لە بەرتو ئیزنی دەدەم بێتەوە . بەلام دەبی شتێك ئیمزا بکا کە هەر کاتێك لە
دوامان نارد بێتەوە ."
من چەند دەبێرێکم نووسی . مینە قاپکی پێوە نا و دەستمان لە دەستی سەروان نا
و دەرکەوتین . ئێوارە درەنگ گەیشتینەوە . کە وەژوور کەوتین خەلکێکی زوری گوندی لە مالە
مینە بوون و نیگەرانی بوون . مینە زوری سوپاس کردم و گوتی : " میرزا کەریم لەگەلم نەبا
وا بە هاسانی دەرباز نەدەبووم . من پێشتریش هاتوو چۆی ئەم گوندەم کرد بوو دەیان
ناسیم . بەلام ئەو سەفەرە و چوونە میاندواوم لە گەل مینە لای خەلك خوشە ویستی کردم.
بەیانی چوومە بازاری شەیتانئاوا . مینە گوتی تفەنگێك لە ئالاو هەیە من بوت دەکرم
پولیش نەدەی گرنك نیە تا جارێکی تر دێیەوە . دەبوایە ئەسپێك بکرم . ولاخێکی زور
جوان یقەلەویان راگرتبوو دەیانفروشت . سواری بووم بە کەیفیم بوو . بە سی سەد تمەن
بە زینەوە کریم . دوو روژ گیر بووم تفەنگێکی دیکەشیان بۆ پەیدا کردم و شەوێك سوار
بووم هاتمە قزلقوپی مالە خەزورم . بەلام هەر شەوێ هەوال بارگین سەر سی دەدا و هەمو
جار کەم دەما وەمەرزی کەوێ . زانیم فریوم خواردوە . بەروژ ئەسپم تیر کرد و تارێك داهات
سوار بووم بەو هیوایە تا بەیانی بگەمە قەلاتی موتاوی مالە سەید رەحمانی .
لە هەورازی (چوغری) پشتی ( بەگم قەلا ) بارگین وەستا . هەرچی کردم نە
بزووت. بە هەزار حال تاولە سەرانی دەدا وە سەر کەوتم بۆ دیوی دەشتی قوری .
تەماشام کرد لە مەزرای (حاجی غەلدە) تاولێك هەلدراوە . سەرەو ژێر بارگینم راکێشاو
خوم گەیاندە نێزیك چادرەکە . مێرك دروا بوون و هێندێ کالیشە گیا کۆکرابوونەوە .
تفەنگو فیشەکاتم شاردەوە چەخماخی تفەنگەکانم هێنا دەر و زینم لە ئەسپە بور کردەوەو

ئەسپم بەرەلا کرد و رووم‌کردە چادرەکە . کە چووم تازە تاو هەلدەهات . ژنیک و کیژیکی تازە پیگەیشتوو مەشکەیان دەژاند . سلاوم کرد کورج لبادیکیان راخست و بە خیر هاتنیکی گەرم و چایان ساز کرد . لە مەشکە ژاندن بوونەوە نان و شیرێژو رون ماستیان هینا و ژنەکە هات دانیشت و چای بۆ تیکردم . نان و چام خوارد و ژن وەدەنگهات .

ــ ئەری برا گیان خو پرسیار عەیب نیە . بەو بەیانە لە کویوە دیی ؟ . هەر وەك شتیکت لی قەوما بی وایە . »

ــ هیچم لی نەقەوماوە . دەچووم بۆ بەری پیرانان . بارگینەکەم وەستاوە . وا لەو مەترایە بەرەلام کردوە و خۆشم هاتووم تا ئیواری فینك دەبی میوانی ئیوەم . ئیواریش دەروم .

ــ رەببی زور بە خیر بیی سەرچاوان مالە خوتە .

ــ چادری کیی یە؟

ــ چادری حاجی عەولایە .

ــ ئەگەر سەرینیکم دەنی دەمەوی هیندی بنووم . زور هیلاکم .

سەرینیکی بۆ هینام و راکشام . پوشمینیکی پی دادام . خەوم لی نەکەوتبوو بە کیژەکەی کوت بچووە گوند و فروجیك و هیندی نانی جوان بینە .

سەرم هەلینا کوتم . « ئەگەر هەر وایە زەحمەت نەبی هیندیکیش جو بۆ ئەسپەکەی من بینە دەنا دەمرناچی و ناچار هەر لیرە دەبم .

ــ بە قوربانت بم مالی خوتە . لە میوان ناترسین . کچی جوت لە بەر نەچی » .

راکشام و خەوم لی کەوت . نیوە رو بوو بە دەنگە دەنگی ژنان لە خەو رابووم . دیتم سی چوار گەورە کچ هاتوونە مەر دەوشین و لە چادر دەستیان کردوە بە گالتە .

ژنەکە چای بۆ هینام و کوتی . « ئەمرۆ بە خوای راستیت پی کوتوین . دیارە زور هیلاکی ئەگەر هیچت لی نەقەوماوە بەو بەیانە لە چی دەگەرێی ؟ .

ــ نا هیچم لیی نەقەوماوە . دوو تفەنگم پیبن بۆ عیراق دەچم . بارگینەکەم وەستاوە . تفەنگەکانیشم شاردوتەوە تا ئیواری . »

ــ ئەمرو جا ئەوە کارە؟ . ژاندارم و ئاغاکانی شاولەو پەسوی وەك سەگی هار بەو نیوەدا دەسوورینەوە . جا ئەوە کاسبی نەماوە . بە خولای ژنت نیە دەنا نەی دەهیشت ئەو کارە بکەی » .

کیژەکە هاتبووە . تورەکیك جوی هینا بوو . نان و چیشتیکی بە تامیان ساز کرد بو .

نانیان بۆ هێنام . خۆشیان لە دیوی چێشتی نانیان خوارد . هاتن پێکەوە چامان خوارد وە . نیزیك رۆژ ئاوا چووم بارگینم گرتەوە و زینم کرد و هەمگبەی فیشەکاتم هاویشتە سەر زین و تفەنگم دەست دانێ و چوومە وە چادر .

ژن کە چاویان بە تفەنگان کەوت حەپسان . تورەکە جۆم وەسەری بارگین خست و تفەنگ و فیشەکم لەوێ دانان و دانیشتم . چایان ساز کردەوە نانیان بۆ هێنام وە دوعایان بۆ دەکردم . دەوسێ نان و هێندێ شیرێژو رۆنیان پێچاوە و دەمەات رۆژ ئاوا بێ سوار بووم و لە نێو پەرژینی دوعایان دا مالاوایم لێ کردن و رۆیشتم . بەلام تا ئیستاش حیسانەتی و میواندراری ئەو مالەم لە بیر نەچوتەوە .

بە هێوا بووم شەو بچمە قەلاتی موتاوێ بەلام دەیسان بارگینە بۆر لە نیزیك شنۆ زەنگ وەستا . بە هەزار رکێف و قامچی تاو هەلدەهات کەمێنتە لاوین . لە سەر جۆگەی پێش مالان کابرایەك خەرمانی هەلداویشت . ناچار لامدا سەر خەرمان و دابەزیم . بەسە سوفیم گوت براکیان لیم قەوماوە . بارگینەکەم وەستاوە و دەرناچێ . با ئەو تفەنگ وفیشەکانە لێرە وەشێرم و بارگینەکەشم با لەسەر خەرمان بێ تا ئێواری دەڕۆم . کابرا وەك پەلەوان تەلیسێکی هێنا و تفەنگەکانی تێوەر پێچا و دە مالوسکی جودا دایپوشین و هەمگبەی فیشەکانیشی لە کادا شاردەوە و بارگینی رووت کرد و گوتی . " فەرموو هەر ئەم خانووەی پێشەوە مالە برای خوتە فەرموو با بچینەوە لە مال بحەسیوە و کەسیش شك ناکا . لە دوێنێوە هێندێ عەجەم لە زیدان لە مالە سەید شیخ محەممەد دابەزیون و کەس نازانێ لە چی دەگەرین . چوینەوە مالێ لە بەر هەیوان دانیشتین و چایان لێ نا و پاش چا خواردنە وە کابرا هەستا گوتی . " جا تۆ ئیستراحەت بکە . خولا بکا ئەو سەگبابانە بێ نەزانن" .

ــ سەگباب کێن ؟ " .

ــ کاك سلەمانی لاوین و هەتیوەکانی . شرە خورن زور بێ ناموسن هەر لە راو رووت ــ دەگەرین " .

ــ مە ترسێ ، دەیاننناسم و ئەگەر پێش بزانن کاریان بە من نیە یەکتر دەناسین .

ــ جنێی ئاغا بێ ناموسە و نابێ بروایان پێ بکری .

لەو قسانەدا بووین مندالێك هات و گوتی " . سوفی وەرە کاك سلەمان بانگت دەکا . " . سوفی چوو وهاتەوە گوتی . " کاك سلەمان دەلێ ئەو بارگینەی سەر خەرمان ئی کێ یە ؟ . " گوتوومە میوانە . ئیتر بێدەنگ بوو رۆیشت .

هەر بە دوای ئەودا کوریکی کاك سلەمان وەژوور کەوت . گوتی : بابم گوتویە

" بچو بزانە میوانی سوفی کێیە ؟ ". هەتیو ڕۆیشت و تەماشام کرد ژنێک بە پەلە خۆی کرد بە ماڵە سوفیدا . تەماشام کرد بوکی کاک سلەمانی لاوێن بوو. ئامین خوشکی هەمزە برای عەولای فەقێ وسێن و سەردەمێک جیران بووین و نێوانمان زۆر خۆشبوو. ئەوانیش خۆیان بە قولە ئاغا دەزانی و لە بەر جوانی کوری کاک سلەمان خواستبووی . لە سەر دەمی حکومەتی میللی دا کە ماڵم لە نەغەدە بوو یەک دوو جار هاتبووە لاوێن ماڵە پورم و لە گەڵ ئامین ڕاز ونیازی کۆنی سەر دەمی دراوسێیەتیمان زیند وو کرد بووە.

ئامین کە هاتە ژوور پێ ئەوە لە ژنی سوفی بسلەمێتەوە گوتی : " ئەمڕۆ ئەوە بۆ دانیشتووی؟ . ئێستا خەریکن بێن تفەنگ و فیشەکەکانت بەرن ". چاک و خۆشیم لە گەڵ کرد وگوتم : " تفەنگی چی ؟ ".

ــ چون سوفی ڕەدین کلکە سەگێک پێ گوتون . ئێستا لە ژوورەکەی من خەزوور ومێردە سەگبابە کەم باسیان دەکرد . دەیانگوت دوو تفەنگی پێیە ".

ژنی سوفی وەدەنگ هات وگوتی : " بە قوربانت بم بە خولای ئامینە خانم ڕاست دەکات. سەگبابی مێردم ڕاستی گوتوە . "

ــ وەرە جاری دانیشە هێندێ قسان بکەین پاشان بیری لێ دەکەینەوە .

ــ کورە قسەی چی ؟ . ئەو سەگبابانە ناناسی . دەزانن تۆی و ناسیویانی .

ــ کە وایە ئامین یەکێک پەیدا کە بە سواری کلفەزێک بۆ قەلات بەری و بیدا بە سەید ڕەحمان . نامەیەکم نووسی بۆ سەید ڕەحمان گوتم : " زۆر بە پەلە یەکێک لە کورەکان نە نێری لە لاوێن نووشی شەر و کێشە دەبم ". ئامین نامەکەی ئەرگرت و بە ژنی سوفی گوت :

ــ نەکەی دەنگ بکەی ". بۆم دەرکەوت ئامین و سوفی ژن شتێکیان لە نێوان دا هەیە . ئامین ڕۆیشت و چوومە سەر خەرمان . تفەنگەکانم هێنا دەر و گوتم : " مام سوفی ، زۆرت لێ مەمنونم . تکایە تۆ بچووە ماڵێ تا من دەڕۆم . با تووشی کێشە نەبی .

ــ بۆ چی ؟ چی بووە؟ . چون وا بە نوێژی نیوە ڕۆ دەڕوی؟ . زیدان عەجەمی تێدان .

ــ سوفی لە سەری مەڕۆ . تۆ چووی ڕاستیت گوتوە . ئێستاش بچوو بە کاک سلەمان بلێ ٦٠ فیشەکم پێیە کەسێک نیم ڕووت بکرێم . تا ئاخر فیشەک شەر دەکەم .

تفەنگ و فیشەکەکانم هەڵگرت و خەندەکێک لە پشت خەرمانەکە بوو ئەوێم ڕەچاو کرد و بارگینم زین کردەوە و چاوەڕوان دانیشتم . زۆری پێ نە چوو کورێکی کاک سلەمان لە گەڵ سوفی هاتن و گوتیان : " کاک سلەمان دەڵێ ماڵە سەید شێخ محەممەدی زیدان

عەجەمی تیدان باتووشی کینە نەبی . . . ٢ فیشەکەکان بەداتی و بـڕوا .

گوتم : " بە کاک سلەیمان بلی عـەیبە . یەک فیشەکیش نادەم هەر کەس لە جوگە ی بپەڕیتەوە تەقەی لی دەکەم . چاوەڕوانی کارەسات بووم و خۆم بۆ شەڕێکی قورس ئامادە کرد بـوو لە پڕ سەید مستەفای برای سەید رەحمان بە سواری پەیدا بوو . گەیشتە سەر خرمان و گوتی : " سوار بە بە چـوسی دا دەچینەخوار و بە خواجالی دا دەڕۆین . بە داخەوە نەمتوانی خوا حافیزی لە ئامینە خانم بکەم سوار بووم بە پشت مالان دا شۆڕ بووینەوە قەراغ چۆمی لاوین و چووینە قەلاتێ . ڕۆژێک لە وی حەساینەوە . ڕۆژی دوایی بارگینم لە وی بە جێ هێشت و سواری ولاخێکی ئەوان بووم و لە گـەل سەید مستەفا چووینە کوێستا نـی پیرانەکانی بیتوین بە دیوی عیراق دا و چووینە مالە ( ڕەسووڵی خالە ) . کوێخا ڕەسوو ڕیش‌سپی و کوێخای هۆزەی پیرانەکانی بیتوین بوو . لە کۆنەوە لەگەل مالە سەید عەولا ئاشنایەتی هـەبوو . گەیشتینە بەردەرگی ڕەشمال و لیمان وەدەر کەوتن . یەک دوو کەس ـ جلەوی بارگینی منیان گرت و کەس خۆی دەمە سەید مستەفا نەگەیاند . دیار بوو لە ڕانک و چۆغەی تازە و پۆشناخی من لایان وابوو سەید مستەفا پیاوی منە و دا خـوا من کێم؟ . کە کوێخا ڕەسوو هاتەوە سەید مستەفای ناسی و بە خێر هاتنێکی گەرمی کردین .

پاش نان وچا خواردن سەید مستەفا گوتی : " کاک ڕەحمانم ئەو دوو تفەنگەی نار ناردوتە لای تۆ بیانفرۆشی . کوێخا ڕەسوو تەماشای تفەنگەکانی کرد و بانگی کرد :

ـ " دا هێندێک پارە بێنن " . ژنێک کیفیلەی لەپیش دانا ، هەزار و پێنجسەد تمەنی هێنا دەر و لە پێش سەید مستەفای دانا . گوتی : " بەسە یا زیاتر دابنێم؟ " .

گوتم : " بەسە و قیمەتی خۆیانە . دوای نیوەڕۆ سوار بووین چـووینە زینوی شێخ .

من پێشتر چووبوومە زینوێ و خەلکم دەناسی . بە نێو دوکانەکان دا دەگەرام دیتم ( برایمی نادری وەزیری فەرهەنگی کۆماری مەهاباد لە دوکانێک دانیشتوە . ١ برایمی نادریم دەناسی و بە تایبەت پاش تێکچوونی کۆماری کوردستان کە هاتبوە نەغەدە زۆرم قەدر گرتبوو . کە چاوی بە من کەوت ئاسبازم بوو لە ئامێزی گرتم و ماچ کردن ولیسم پرسی : " چیت لێ هات و چون گەیشتوویە ئێرە ؟ " .

ـ " پاش ئەوە بارزانییەکان لە نەغەدە وەدەر کەوتن ماوەیەک لە شنۆ و لە نێو مامەشان خـۆم بوارد . پاشان زەلامێکم بەکری گرت کە بمگەیێنێتە زینوێ شێخ . لە سەرزای کـە لە کین

١ ـ ئیبراهیمی نادری کوردێکی کرماشانی و زۆر خوێندەوار و زانا بو . لە سالی ١٣٢٥ کرا بە وەزیری فەرهەنگی کۆماری کوردستان .

کابرای چاوساغ گوتی : "با تاویك له بن ئەو کالیشه گیایه بحەسێینەوه و توزی تاریك دا بێ و دەکەوینە ریگا".

راکشا م و خەوم لیٚ کەوت . به هەرای کابرایەك وەخەبەر هاتم کە جنێوی دەدان . هاته پێش و دەستی هەلندەگرت کە بۆچی ولاخمان وەسەر گیا کردوە . منیش بە توندی بەگژی داچووم . گوتی : "من رەسول ئاغای کەلەکین ـم . راوەسته ئیستا پێت دەلیم . رویشت و زوری پیٚ نەچوو ئەمجاره بە تفەنگەوه گەراوه . بە کابرام گوت کاکه لە زینوی یەکتر دەبینینەوه . سوار بووم بۆ دەربکە . رەسول ئاغا کەوتە سەرم و وەبەر تفەـ نگانی دام . رام کرد بۆ دەربکە . عارفاغای دەربکە کە دەمناسی و لایەنگری کوماری مەهاباد بوو بە پەنام زانی و رووم کرده بەر دەرگای دیوەخان کە لەویٚ راوەستا بوو . لە دووروه دەنگی دام و گوتی : " مەیه ئیره . بام داوه و بە چوسی دا گوتام . تاریك داده ـ هات و کابرا له دەربکە لە دوام گەراوه . چوومه گوندی ( گەپلەسەن ) . ئەو کابرایەکم بەکریٚ گرت و هاتمه زینوی . ئیستا ئەوه لیرەم . قازی لە ریگای ئەم میللەتەدا بە کوشت چو."

له زینوی شیخ لەگەل مستەفای کوری شیخ عوبید ولا بوومه ئاشنا . ئەو پتر باسی کومونیستی و یەکسانی دەکرد . فیکری لە من روونتر بوو . چاوم بە کاحەمەدی سەروکانی کەوت کە رای کرد بوو لەگەل کاك ئەحمەدی برای چووبوه خەلان و له مالە شیخ عەلائەدین بوون . پاش دوو روژ لەگەل سەید مستەفا هاتینەوه بو قەلات . سەید رەحمان چونیەتی سەفەرەکەی پرسی . سەید مستەفا گوتی : " جا سەفەری چی؟ . هەتا کاك کەریم ئەو رانك و چوغەی لە بەر دابیٚ تازه سەفەری لەگەل ناکەم".

کاتیك گەرامەوه چوومه لای حاجی سەید و هیندی پارچەم بۆ هینا بوو داسی و حیسابم لەگەل کرد و ویستم پوولەکەی بدەمەوه . حاجی پارەکەی وەرنەگرتەوه و گوتی بە بەلکو سەفەریکی دیکەش بکەی . مانگیك لە مالیٚ بووم سەفەریکی دیکەم بو عیراق کرد ئاشنایەتیم لەگەل کاك مستەفای شیخ عوبید ولا و چەند کەسی تر لە سەر تیکوشان سور تری کردم . لە گەرانەوەدا حیسابم لەگەل حاجی کرد و نیزیکه شەش سەد تمەن قازانج دا بویه . سەید بە هیوای قازانجی پتر پارەکەی وەرنەگرتەوه .

دوکانی گوندی بەشی زور لە هاوین ولە جەنگەی خرمانان دا کار دەکا . دەمویه پارەتی بدەم و میوەی سۆ بینم . لەبەر ئەوه باوکم ئیجازەی نەدا کە خەریکی هاتوو چۆی عیراق بم . دوکانەکەمان باشی کار دەکرد . عەیبیکی دیکەی ئەوەیه کە دەبیٚ هەمووی

بە قەرز بدەی . بو ئەو کارە دەسمایەی زوریٚ دەوی . ئیمەش هەرچی دەمانکری بە قەرز دەمروێ . لە جەنگەی خرمانان و کوکرد نەوەی قەرز وقولدا . روژیک قاسمی پیروتاغا لەدوای ناردم وگوتی : " دەبێ لەگەڵم بێیە نەغەدە . لەگەڵ ئاغاکانی مامەش کوبوونەوەمان ـ هەیە وکەس نیە لەگەڵم بێ " .

گوتم : " کاک قاسم من بویە دوکانم بە ئیجارە گرتوە کە بیگار نەکەم . ئیستا جەنگەی کاسبی ئیمەیە . ناتوانم بیم . "

ـ کەس نیە لەگەڵم بێ هیچ پیاوم نین تو لەگەڵم وەرە .

تەماشام کرد فایدەی نیە و لەگەڵ ئەو هیچ ناکری . چوومەوە بارگینم زین کرد و چوومە لای قاسماغاو گوتم ئامادەم . تا گەیشتینە نەغەدە قور وقەپ یەک قسەمان نەکرد .

گەیشتینە نیو شار وگوتم : " کاقاسم خوا حافیز " . بە سەر سور مانەوە :

ـ یانی چی ؟ بو کوێ دەچی ؟ .

ـ کاقاسم من نوکەری ناکەم . بونوکەری نابم . من بیم لە پاشخانە دابنیشم و بلێی نوکە رم لە گەڵە و گوشت بو دابنیم .؟ لەگەڵت نایەم و دەمچم باردەکەم و لەگردەقیتیش نابم " .

هەرچەند هەولی دا رکیفم لە بارگین دا و چووم لە کاروانسەرایەک دابەزیم .

سوفی رەحمانی بەزازدوکانداریکی نەغەدە بوو رای کرد بوو مالی چووبوە بوکان . خانویە کی بانی هەبوو کلیکی دابوو بە ئاشنایەکی خوی و دوستیکی من . چوومە لای وگوتم :

" دەمەوێ بیمەوە نەغەدە . خانووم وەگیر ناکەوێ . هاتووم خانوەکەی سوفی رەحمانم بدەیەی تا بو خوی دیتەوە . وەک پیلوان کلیلی خانوەکەی لە پیش دانام وگوتی :

" ئەوە کلیل و خوت زانی لەگەڵ سوفی رەحمان " .

کلیلم وەرگرت و چوومە رادانە . برادەریکی ئازربایجانیم هەبوو گەڵ وعارەبەم لێ وەرگرت و شەو چوومەوە گردەقیت . بە باوکم گوت . " لیرە نابم . دەیانەوی بمکەن بە نوکەری سواری و بیگارم پێ بکەن . خانووی سوفی رەحمانم وەرگرتوە و دەچینە نەغەدە .

بابم زور نارەحەت بوو . گوتی : " هەرچی هەمانە بوتە قەرز. مالی ویران دەبین . بومان کونابیتەوە . بەلام حاوانەوەش لەگەڵ ئەو ئاغایانە زەحمەتە .

بەهانی مالمان باردەکرد کاک فەتاحی برای قاسماغا هات . زوری هەول دا کە بار نەکەین . مالەکەمان لێنا و چوینە نەغەدە . خانوومان هەبوو بەلام بێ کار و کاسبی .

بارگینەکەم فروشت و حەوتوی جاریک دەچووومە گردەقیتی کە قەرزەکان کوبکەمەوە . ئاغاکانی گردەقیت هەر یەکەی دووسەد تمەن تا سەد و حەفتا تمەنم بێ قەرزدار بوون نەیاندەداوە .

ئەم کارەساتە بە جاریك لە سیستمی دەرەبەگی وجسنی ئاغا بزاری کردم ئەو جار ئیدی لە نەغەدە بووم و شیوەی تیکوشان و پیوەندیم لەگەل لاوان بە تین تر کرد .
بیکاری لە نەغەدە و دانیشتنم لە چایخانان ،لە کەل هێندی جوولانەوەم ژاندارمەری سڵ کرد بوو ئاگام لێ بوو چاوەدێریان دەکرد . قەرزە کانم بۆ کو نەدەبوونەوە و یا بەشــــی ئەوەندەم کو ّدەکردەوە کە بیخوین . هیوەرە گاسینیکمان هەبوو یەك دووجار ویستم کە بیفروشم و بیکەم بە دەسمایە و کاسبیەك بکەم . دایکم نەی هێشت و دەیگوت ئاوسە و لە زستان دا دەزێ و ماستمان نەبیێ .
لەم وەزع وهەل وسەرجەدا نەخوش کەوتم . پتر لە دوومانگ لە سەر جێ بووم .
کابرایەك بە ناوی ( دوکتور لوتفی ) کە لە عیراقەوە هاتبوە کوردستانی ئیران ولـــــە نەغەدە گیرسابووە و ژنــی هینابوو لە گوندەکان دەسووراوە و نەخوشی دەرمان دەکردن .
دەیارە تەماشاکردن و دەرمانکردنی بە قاچاخی بوو دەولەت نەنك هەر ئیجازەی نەدابــوو بەلکوو چونکە ئیرانی نەبوو پێناسی ساختەی پەیدا کرد بوو جار وبار بانگیش دەکــراو ئەزیەتیان دەدا . بەلام ژاندارمە بە پولیکی کەم وازی لێ دەهینا . پاشان کە باسی دەکەم بە قیمەتــی ئیجازەی مانەوە و دەرمانکردنی،بوو بە جاسوسی ئیران و خزمەتــــی دەکردن .
هەر چونیك بــێ دوکتور لوتفی دەفریام کەوت . نەخوشیەکەم زور توند دەبـێ و حەوت روژ بێ هوش و لە گیانەلا دادەبم . مەلا کانی خەلیفان و بالخچی و ئالیاوەو ـــ دزە و نەغەدە دێنە سەرم و ریگای چارە لەوەدا دەبینن کە سورەی ( رعد ) لە قورئانــی پیروز بخوێنن و زوو گیانم دەرچــێ و ئەوەندە بە گیانەلاوە نەبم . وەك دوایە بــــویان دەگیرامەوە ماوەی حەوتویەك خەلکی نەغەدە و گوندەکانی دەور وبەر لە هاتووچوێ مالی ئیمە دا بوون و روژی جومعە بۆ مانەوەم لە مزگەوت دوعای بە تیکرایــی کرا بووە .
لەم حالە دا دوکتور لوتفی لە دیهاتەوە دەگاتەوە نەغەدە و خەبەری نەخوشی مــن دەبیسی . ئیتر گیر نابێ و دێتە لام . راستم دەکاتەوە و ئامپولیکم لە باسکی دەدا .
من هوشی ئەوەم نەبوو چون راستیان کردمەوە . بەلام لەگەل ئامپولەکە چاوم هــە لێــنا خوێنیکی رەشم دیت لە باسکم دێ . ئیتر نازانم دەرمانی دیکەی داسێ یان نا بــەلام لەمردن و زەحمەتی گیان دەرچوون رزگار بووم .
راست لەوکاتە ناسك و دژوارەدا کە من وا شیرزە بووم و خەلك بە تیکرایی بــۆم

بە پەرۆشبوون و دوعایان بۆ دەکردم و هێندێ دۆست و دڵسۆزی کوردی نەغەدە شەو و رۆژ لە بن سەرم دەبوون. حاجی سەید محەممەدی تاژەقەڵا دێتە سەر بابم بۆ پولەکە . بابم وەزعەکەی پێ دەڵێ و داوای لێ دەکا کە راوەستێ تا من هەڵدەستمەوە . حاجی سەید و موسولمان پێ ی لێ دەکەونی دەکا و هیوەرە گامێشەکەی لە جیاتی ٢٥٠ تمەن لێ دەستێنێ و دەمیا . نەخۆشی من لە لایەک و کردەوەی سەیدی موسولمان لە لایەکی تر بە جارێک روحیەی دایک و بابی تێک شکاند بوو. کە هەستامەوە تەواو هەستم بە دەرد و داخی دایک و بابم دەکرد . نەدەهاتمەوە سەر حاڵ و خۆم لە راست دایک و بابم بە شەرمەزار و تاوانبار دەزانی . دۆست و برادەر دەهاتن بە تایبەت لاوەکان سەریان دەدام و جار و بار پولێکیشیان بۆ دەهێنام . هیچمان نەما بوو . هەرچی هەمانبوو خوارد ب بوومان و بە داو دەرمان و میوانان تەواو ببوو. تاقە شتێکی زیندووی راگرتبووم سەردان و هاتوو چۆی برادەران بوو. پاییزێکی سارد لە نەخۆشی هەستامەوە و توانیم هاتوو چۆی بازار بکەم . لەو کاتەدا سۆفی رەحمان پەیدا بووە و گوتی : " ماڵەکەم دێتەوە و خانووەکەم پێویستە ". هەقی خۆی بوو. تا ئێستا پیاوەتی کرد بوو. ناچار گەرام چاوە خانوێکم لە حەساری ماڵێکدا دیتەوە و بە پێنج سەرخێزانەوە لەو چاوە خانووەدا دەژیاین .

داخ و کەسەرێکی قورس و بە ژان گیانی رێک دەکێشیم . جوت بەندێکی تێر و تەسەڵ دەست رۆیشتوو ژیانی خۆش، بەلام ئێستا بێکار، موحتاج، بێ بژێو لە حاست دایک و بابم چاوم هەڵنەدەهات و من ببوومە هۆی پێک هاتنی وەزعی شپرزەی ئەوان و ژیانم لێ تێک دابوو.

کۆمەڵی لاوان دەهات پەرەی دەگرت و رۆژانە دەهاتنە لام و دەبوایە رێبازی خەبات دیاری بکەین . ئەوەش ببوە سەر بارێک . لە تێکۆشانی لاوان دەرچوو بوو هێندێ کەسی باوەڕ پێکراویشمان وریا کرد بوونەوە . یەک لە وانە ( مەلا مەعسوم) کوڕی خەلیفە مەلا حەسەنی قەڵا بوو. لە کۆمەڵەدا یەکێک لە تێکۆشەراتی ناوچە بوو . پاش کۆماری مەهاباد مەلا وەک کەوڵە رێوی قاچاخ بوون، ئەویش چوو بوو ببوە نوسەری حاجی مەلا عەولای سەلاح زادە . بەلام لەگەڵی رێک نەکەوتبوو، هاتبوو لە خەلیفان گوندی مارفاغای شاوەلە ببوە مەلا . جێژنی رەمەزان یا قوربان دەبێ مەلا لەگەڵ خەڵک دەچێتە لای مارفاغا بۆ جێژنە پیرۆزە . لە دانیشتن دا مارفاغا لە لای رەعیەت و میوانان روو دەکاتە مەلا مەعسوم و دەڵێ : " مەلا ئێستا مەلا سەگەکان چ دەکەن ؟ ".

مەلا مەعسوم لە وەلامدا دەڵێ : " مارفاغا تا ئێستا هەزار کتێبم خوێندوتەوە بە

قورئانی لیّم خوێندەوە یەك مەلای سەگم لە کتیب دا تەدیوە بەلام هەزار ئاغای سەگم چاو پیکەوتوە". ئیتر رادەمێ و دیتەوە خەلیفان. لەم حالە شپرزەی خۆم دا مەلا پەیدا بوو. "دەسمریان کردوم دەبێ بڕۆم. لە هیچ کوێشۆجێ نیە و هیچیشم نیە". یەکیك لە کورەکانی نەفەدەم ناردە قەرە قەساب یەك دوو کوری بەکار و پیاومان لەوێ هەبون هاتن وگوتم: "دەمێ مەلا مەعصومی بەرن دایەزرینن و بەراتی بۆ بستینن و بە خێوی کەن". مەلایان برد و تا مردن هەر لە قەرە قەساب بوو لە تێکوشانی سیاسیش قەت وازی نە هینا.

دیسان سەید حەمەدەمینی ئەند ازە

پاش هەستانەوەم جاریکی دیکەش چومەوە کردە قیت و هێندێ قەرزم کۆکردنەوە. بەلام ئاغاکان جوابیان نەدامەوە و ئیستاش کاك فەتاح حەفتا تمەنم هەر پێ قەرزدارە. سەرەتای زستان هێشتا بەفر نەباری بوو رۆژیك سەید حەمەدەمین پەیدا بوو. دانیشت وگوتی: "رۆلە تو کاسبی نازانی. ئەگەر کاتی خۆی بە قسەی منت کرد بایە ئیستا وا نەدەبووی. پیاویکی تر بووی. تازە رابرد. ئیستا گەنمە شامی چاك دەفروشری. پارەت دەدەمێ سواری ئەسپی من بە بچو لاجان. گەنمە شامی بکڕە و بینێرەوە. قازانجی باش دەکا".

لەخولام دەمویست کاریکم بۆ پەیدا بێ و لاتی کەم ماوەیەك لە مال دوور کەومەوە. هیندێکی پارە دامێ و ئەسپیکی باشی هەبوو بۆی زین کردم و سوار بووم بو بەری پیرانان. چوومە گوندی (یەمناباد) مالە پوورم. مالە رەسووی پورزام کە پیشتر باسم کرد وە. دوورۆژ ناردم لە گەنمە شامی بپرسی وەگیر نەکەوت. پاشان بە پورم گوت: "هەیچم نیە زستانیشە وکاسبی نیە وکەلیلێشپرزەم. پورم گوتی: رەسوو پولی هەیە لی ی بستینە". رۆژیك بەیانی گوتم: "کاکە رەسوو من دەچمەوە. زور دەست تەنگم و دەبێ هیندیکم پولی بدەیەی کاسبیەکی دەکەم و پاشان دەتدەمەوە"

ـ جا بەو زستانە پارە لە کوێ بوو. گامێشنافروشرێ دەنا دەم فروشت و دەم دایەی.

ـ تو قەت بێ پول نابی. خۆ ئیستا بە دەستی خالیم بەرێ ناکەیەوە.

ـ جا ئەگەر نەبێ چ دەکەم.

گوتم: "پورێ تو پارەت هەیە بمدەیە.

ـ رۆلە گیان من هیچ شك نابەم. هاتی کلیلی یەخدانت دەمێ بگەری ئەگەر هیچی

تیدا بوو بییه و جوابی کەر مەدەوە .

کا رەسوو وەدەنگ هات . "جا ئەوە قسەیە ؟ . چون کلیلی یەخدان دەدەی بە کەریم؟" .

ــ روله بۆ نەیدەمێ ؟ . ئەگەر هیچی تیدا نەبێ خۆ یەخدانەکە نایا .

ــ دایە ئەوە کار نیە . دزی من ریک کەوتوون .

پورم کلیلی بۆهاویشتم و گوتی برۆ بیکەوە . کاك رەسوو راست بووە و گوتی :

ــ وانابێ . نایێ یەخدان بکەیەوە . چەندەت دەوێ دەت دەمێ جا نازانم کەی دەم دەیەوە .

ــ تو جاری لە خەمی دانەوەدا مەبە . هەزار تمەنم بۆ بینە و بەسە .

ــ ئەوە دەلێی چی؟ . هەزار تمەن بە کێ پەیدا دەبێ ؟ . پاش چەقەیەکی زور لەگەل پورم چوار سەد تمەنمان لێ هەستاند و گەرامەوە بۆ نەغەدە .

بانبوو هەرچونیك بوو زستانمان پێ بردە سەر . بەلام بیکار و بێ کاسبی لە شار دا ژیان نەدەکرا . لە زستان دا کومەلەی لاوانمان توزیك ریك و پیك کرد . لە دیهات کاك سەید عەلی حاجی کاکە مین خەلکی ئالیاوی و حەمەدی خانی لە ئارنی و میرزا قادری نەلوس و لە شاریش من و محەممەدی سوفی رەسووی قاومچی وەك کومیتەیەك کوبو ینەوە و بریارماندا ١٥ روژ جاریك لە نەغەدە کوبینەوە . من بە شیلگیری لەگەل ناسیار و برادەرانی کونی کە لە کومەلەی ژ.ك.دا دەمناسین پیوەندیم دەگرت . نامەکان هەموو کەریم پارسا دەینووسین و بە تەواوی جیگای دلنیایی بوو .

لە سەرە بەهاردا دەبوایە بۆژیان هەول بدەم و کاسبیەك پەیدا بکەمەوە . لە شاردا کاسبی بێ پارە ناکرێ . جاریك قەرەنیاغای پیران لە دوای ناردم کە بچم ببم بە میرزای ئەو . بەلام من کە دزی ئەم چینە چەوسینەرە خەباتم دەست پیکرد بوو نەم دەتوانی بچمە لای ئەو. برادەریکمان هەبوو لە گوندی( مەمەلیان) ملکی هەمزەی کەریماغای قونقەلا . گوتی وەرە لە مەمەلیان دوکان دابنێ . گوندیکی ئاوەدان و نیزیك بازار و بۆ کاسبی باشە چومە مەمەلیان لەگەل کویخای هەمزئاغا قسەم کرد بە دوو تەنەکە رون سالی دوکانم لێ بە ئیجارە گرت . مالەکەمان بار کرد وچوینە مەمەلیان . پولیکی زور کەممان هەبوو . لاوایە تەنیا پەنجا تمەنمان مابوو. چووم لە سابلاغ هیندی قەند و چا و شرە وبرەی دوکانی گوندیم کری و باوکم بە دوکانەوە خەریك بوو لە بیکاری رزگا ببوو.

لە بەهار وهاوین دا لەگەل برادەرانی کومیتە بریارمان دا هەموو روژی هەینی یان لە بازاری محەمەدیار چاومان بە یەك بكەوی . لە سندوسی خواروو مەلا مەعسومی قەرە قەساب و قادری سوفی هەمزە و سەید عەولای مەمیند و میرزا برایمی دەرویش حەمەد وەك ئەفرادی تیکوشەر هاتبوونە مەیدان و هاوکاریان دەکرد .

بەهاری سالی ١٣٤٧ رووداویك سەیر و بێ وینە لە ناوچەی موکریان رووی دا .
مەلا ئەحمەد کوری خەلیفە مەلا حەسەنی قەلا و خەلکی گوندی قەلای رەسولسیت ناوچەی چومی مەجید خان، کە یەکیك لە ئەندامە ناسراوو تیکوشەرەکانی کومەلە و پاشان حیزبی دیمو کرات بوو زانایەکی بە نیو بانگ و خەت خوش و مۆر هەلکەن و هونەرمەند بوو، نووسراوەیەکی بە خەتیکی جوان دەستگوت بەناوی ژێر نووسراوە بلاو کرد بووە . لە نووسراوەکەدا کوترابوو :
" کوماری مەهاباد نەرووخاوە . حیزبی دیموکرات هەر ماوە . گەلی کورد خەباتی خۆی دریژە پێ دەدا . هەر کەس ئەم نووسراوە دەبینێ لە سەری فەرزوواجبە کە حەوت نوسخەی لە بەر بنووسیتەوە و بلاوی بکاتەوە و بۆحەوت کوردانی بخوێنیتەوە . وەزیفەی دینی هەموو کوردیکە "
ئەم نووسراوەیە بە شیوەیەکی نهینی بلاو دەکراوە و دەست بەدەست دەگەرا .
مەلا مەعسوم کە هاوکاری ئیمە بوو برای مەلا ئەحمەد پێش بوو روژیك لە بازاری محەمەد یار بە کابرایەکی دیتبوو. هینابە مەعلیان . بریارمان دا بو هەموو برادەریانی "کومەلەی لاوا نی لادیی" بنیرین . مەلا بایزی چەقەل مستەفا و میرزا برایمی دەرویش حەمەدم بانگ کرد و هەریەکە دە نوسخەم پێ نووسیەوە و بۆ برادەرانم نارد . هەلسوران و جموجولی ئیمە هیندیکیسی دیکەشی وریا کرد بووە و دەیانویست بزانن ئیمە چ دەکەین .

جیژنی قوربان بارەمەزان بوو هەمزەی کەریماغا لە تاران هاتبووە و جەعفەر ئاغای کەریمی کە ئەفسەریکی دیموکرات و سەروکی کومرگاتی کوردستان بوو بە ئیعدام مەحکوم کرابوو هەمزەئاغا وەدوای کەوتبوو ئازادی کرد بوو. رەعیەتی مەعلیان پێیەوە دەچوون و مێینی رەکەلیان کەوتم . هەمزەئاغا پرسیاری لە هەموان کرد و لە منیشی پرسی . پاشان بە کویخای گوت ئیجارە لە میرزا کەریم مەستینە . ئەو" پارەتیەکی زور بوو بە من و پتر لە تیکوشان دا دەستی ئاوالە دەکرد سەوە .

هاوینی ٢٧ ٣ ١٩٤٨ روژیك کاك ( سولتانی شیخ ئاغایی ) خەلکی تالاو لە دوای نارد بووم کە لەگەل مەلا مەعسوم بچمە شامات گوندی ( تازەکەند ) . سوار بووین و چووینە مالە مەلابابە وەیسی . کە جووین سولتانئاغا لەوی بوو. دوای فراوین چووینە مەزرا و لە بن کیشە گەنمیك دانیشتین و هاتینە سەرباسی روخانی کوماری مەهاباد و دریژە

پیدانی خەبات. زۆرمان باسکرد کاک سولتان گوتی : "پێویستە بە شێوەیەکی تازە خەبات بکەین. پێم خۆشە تولە سابلاغ بچی رەحیمی سولتانیان ببینی . ئیمە ئەوە لەم لایە خەریکین و شێوەی لە گەلو رەحیم قەرارو مەدار دابنێین .

گەڕامەوە بۆ سندوس و من چوومە مەهاباد و رەحیمی سولتانیانم دیتەوە . لەگەڵ کاک رەحیم چوینە مالی ئەوان و باسی زیندوو کردنەوەی خەباتمان دامەزراند . تەمانام کرد هەر ئەو رێبازەیە کە ئیمە لە "کومەلەی لاوانی لادی" دا گرتومانەتە پیش . واتــــە خەبات دژی دەرەبەگ و سیستمی دەرەبەگایەتی . رەحیم زور لە من توندتر بوو. دەیگوت دەبــی وەرزێر و فەقیر و هەژاری لادێ روون کەینەوە و وابکەین یەکتر بگرن وئەوجار دەربەر لە رابردوو وەربگرین . رەحیم کوریکی تیگەیشتوو قسە خوش و زوو ئینسانی بو لای خو رادە کیشا . قەرارمان دانا : راو حەوتویەک بچمەوە مەهاباد و بەرنامەی کار دیاری بکەین .
من گەرامەوە برادەرانی کومیتەی "کومەلەی لاوان" م کوکردەوە و مەلا مەعسوم و کەریم پارسا بە زیادی بە شداربوون و مەسەلەی مەهابادم بو باسکردن . بریارماندا لـــە گـــە ل مەهاباد هاوکاری بکەین .

لەکاتی دیاریکراو دا چوومەوە مەهاباد . کاک رەحیم نوسراوەیەکی بوهینام کە بـــە مـــۆرێکی سوور "ک.ک.ک." ( کومەلەی کومونیستی کوردستان) مۆرکرابوو. لەنوسراوە کەدا مەعموریەت درا بوو بە من کە بو زیندوو کردنەوەی خەبات و شانەکانی حیزبی لە شنو و سندوس و لاجان و شارویران کار بکەم و مەسئولیەتم هەبی . بوئامە نوسین رەمزیکــی ئەلف وبێ ماندانا و بریارماندا بە( رەمزە نامە و دەنگوباس بو مەهاباد بنیرم . بریار-ماندا تەنەر وئامە بنیرم بولای ( وەستا کاکلی پینەچـــی ) . کوردیکی کوردستانی گەرمین بوو لە مەهاباد گیرسابـــووە و ژنیکی سابلاخی هینا بوو . کوریکی خوین گەرم، دلسوز، ســـ سووتاوی کوردایەتی و تیکوشەری چینایەتی . ماوەیەکی زور پیوەندیم لە گەل وەستا "کاکل" هەبوو. ئیستا نرناتوانم ئینسانیەت وئازایەتی و جوامیری ئەم پیاوە لە بیر بکەم .

لە گەرانەوەدا سەفەریکم کرد بولای سندوسی سەری و شنو . بیجگە لە برادەرانــی پیشوو ئەمجار بە بەرینتر دەستم کرد بە پیوەندی گرتن و پەیدا کردنی ئەندام . هـــەر کەس مـــۆری سوورم نیشان دەدا دەگریا و ئامادەیــی خوی بو هاوکاری و یارمەتــی مالــی رادەگەیاند . ئەفرادی خویندەوار و روناک بیر هاتنە ریزی تیکوشان . وەک سادقی پیشنومازی، سەدیقی عەلائی، مستەفای سابجبلاغچی، لە شنویە عەبدوڵا سوار و هی تر .

سەلا معصومی قەرە قەساب وەك نووسەری کومیتە بە رەمز نامەکانی دەنووسی .
لە قەرە قەساب و چەقەل مستەفا و خەلیفەلیان هێندێ لاوی گورج وگول و سوارمان پەیدا
کردبوون ونامەمان بۆ شانەکانی تردا پێدا دەناردن . لە هەرگوندێك شانەیەکی سێ
کەسیمان دامەزراند بوو زور بە نهێنی کاریان دەکرد . خەباتەکەلە واقیعدا خەباتی چینا
یەتی و دژی دەرەبەگ و سەرمایەداران بوو .

## هەوەلین کتێبی سیاسی

سەفەرێك لە مەهاباد کاك رەحیمی سولتانیان کتێبێکی دامێ بە ناوی " ئوسولی
تەشکیلاتی حیزبی " نوسینی ( ئەردەشیر ئاوانسیان ) . خوێندنەوەی ئەو کتێبە جورێك
کاری تێکردم شێترلام وابوو دەبێ هەمیشە لە خزمەت حیزبدابی و لەم ڕێگایەدا هەموو
شت فیدا بکەی .

زستانی ١٣٢٧ گوواری ڕێگا لە مەهاباد بلاو کرایەوە . گوواری ڕێگا بەناوی —
( ئورگانی کومەلەی ژیانی کورد ) لە لایەن کاك حەسەنی قزلجی وغەنی بلوریانەوە
لە سولەیمانی بە رونیولەشەش لاپەرەدا بە کوردی و فارسی بلاو کرابووە . وگەیشتبووە
مەهاباد . ئەم دووردروشمە لە لاپەرەی هەوەلی ( ڕێگا) دا دەدرەوشان .
— " پێشکەش بە گیانی پاکی شەهیدەکانی ڕێگای ئازادی" . . . " بژی ئازادی و ئازاد-
یخوا ، بمری ئیستعمار و دیکتاتوری " .

بلاو بوونەوەی گوواری " ڕێگا " هاوکات بوو لەگەل تەقە لە حەمەرەزاشا لە زانستگای
تاران . بیانویەکی چاك بو پولیس هەلکەوت . لە مەهاباد دەستیان کرد بە گرتنی
خەلك . ئیمە لە نەغەدە جم و جولەکەمان تارادەیەك وەستاند .

لە سەرە بەهاری دا سەفەریکم کرد بو بەری پیرانان . لە لاجانی چاوم بە چەند
دوست وناسیاران کەوت و قەولی هاوکاریان دا . سەید حەمەدی زەرگەتەن و کاك ئە-
حمەدی زیدان و سەید مستەفای برای سەید حەمەد و کاك مامەندی زەرگەتەن و پیروت
ئاغای دریکە و چەند کەسی دیکە . ئەم چارە سەمەلیان ببوە ناوەندی کار وباری سیاسی
ناوچە . روژ نەبوو یەك دوو کەر نەیەن وخەبەر نە هێنن و داوای ڕێنوێنی نە کەن .
کەریماغای قونقەلا مەملیانی لە هەمزەئاغا هەستاندەوە و دای بە جەعفەرئاغا کە
تازە لەئێندان بەر ببوو . بەلام پاش بلاو بوونەوەی گوواری " ڕێگا " سەر لە نوێ لە —

جەعفەرئاغانی گیراوە . ماوەیەك لە مەهاباد یان راگرت و پاشان بردیان بــو تەوریز .
من جار وبار دەبوایە بچمە سابلاغ و شرەو برەدوکان بکرم و هەموو جارێ چاوم بە وەستا کاکل دەکەوت. پاشان رەحیمی سولتانیاتم دیت و عەبدوڵای شیحاقی کە قوتابیەکی سینفی نیوەنجــی بوو پێی ناساندم وگوتی :"پیوەند بێت لەگەڵ ئەو براد مرە دەبێ".
رۆژێك لە مـەهاباد تووشی قادرئاغای کەریمی بابی جەعفەرئاغا بووم گوتی : "کاریکم پێشە دەیانەوێ جەعفەر بۆ تەوریز بەرن . نامەیەك هەیە دەمێ بیبەی بۆ تەوریز بــو سەروکی شارەوانیەکانی ئازربایجان . من وەدوای کاری خۆم کەوتبــووم و دەیسان تووشی بێگاری ئاغا بوومــەوە . مەسەلەی گرتنی جەعفەرئاغا باریکی سیاسی هەبوو نەمتوانی بلیم ناچم . لەگەڵ خــۆی بردمیە ماڵە میرزا رەحمەتی شافیعی . ئاغا میرزا رەحمەت بەستەیەکی هێناو لەگەڵ نامەیەك. گوتی : "ئەوە دیاریەکە بۆ خانمی سەروکی شارەوانیەکانی ئازربایجان . بچۆتەوریز و بەم ئادریسە بچو ماڵیان و نامە و دیاریەکەی بدەیە .
سواری ماشین بووم و چومە تەوریز، دیاری و نامەکەم گەیاند ووەلامم وەر گرتەوە و هاتمەوە، بەلام هیچ فایدەی نەبوو جەعفەرئاغایان بردە تەوریز و من جاریکی دیکە تووشی بیگار بوومــەوە . کاسبیەکەمان تا رادەیەك باشبوو سەبارەت بە سەفەر وهاتووچو بارگینیکم کری .
ئەم جارە کە دەچوومە سـابلاغ رۆژنامەی نهینی حیزبی تودەیان دەدامێ و منیش بــو هێندێ برادەری خــوێندەوارم دەنارد . هاوینی سالی ١٣٢٨ رۆژێك لە قونقەلاوە پیاوێکی قادرئاغا پەیدا بوو گوتی : "ئاغا لە دوای توی ناردووم . عیلاج نەبوو چومە قونقەلا . کە چووم قادرئاغا گوتی : "دایکی جەعفەر لە دوای ناردووی بچو ژووری ".
کە چووم شەرافەت خانم دایکی جەعفەرئاغا زۆر بە گەرمــی بــە خیر هاتنی کردم و گوتــی بویەم ناردە بچیە تەوریز و هێندێ شت بو جەعفەر بەری ." نەدەکرا بلێم ناچم. چومــە تەوریز و پاش چــەند رۆژ گەرامــەوە . ئیتر لەو رۆژەوە من بوومــە تەتەری نیوان قونقەلا و تەوریز. وەکە لە دوایەش دا باسی تەنیجەی دەکەین .
ساردی پاییز لەگەڵ سەید محەممەدی بالاگیر کە یەکێك لە دوست وبرادەرە نیزیك و خوشەویستم بوو سەفەریکمان کرد بۆ دەشتەبیل و مـەرگەوەر . لە گوندی حەسەن نوران برادەریکمان لەگەڵ خۆ سوار کرد و رویشتین نیزیك نیوەرو گەیشتینە کانی سیی .
کەسمان نەدەناسی و لە ماڵە ( تەهای هەرکی ئاغای کانی سیی و هەموو دەشتەبیل ) لامان دا . تەهای هەرکی بیجگە لەوە کە سەروکی عەشیرەتی هەرکی دەشتەبیل بوو خۆشی مەرد ار

داریکی گەورە و دەولەمەندیکی قورس بوو لە بەر دەرگا نوکەر و دەست و پیوەند لیمان -
دەرکەوتن و ولاخیان لێ وەرگرتین و ئیمە چووینە ژور . برادەری لەگەلمان بوو لەگەل ولاخە
کان چوو تغاقیان بەداتێ . سەرمایەکی بێ رەزا و بەفریش دەباری . کە وەژور کەوتین -
ژووریکی گەرم و کورە دایسا . تەها بەخیر هاتنی کردین و چایان هینا . هەفالەکەمان یانی
تاقەت کردنی ولاخەکان هاتبۆوە لە پاشخانە دانیشتبوو. من گوتم ئەری ئەو هافالەی ئیمە
چی لێ هات با بێتە ژوور بیگومان تەها بەگ وەك ئاغاکانی لای ئیمە نیە رعیەت نە نوانی
لە لای دابنیشێ .

تەها گوتی : " با بێتە ژوور. لە نیو ئیمەدا ئاغایەتی نیە . ریش سپیەتی هەیە .
هەربویەن ئەگەر ئیستا من لیرە بار بکەم گشت عەشیرەتەکە لەگەلم بار دەکەن. بەلام ئاغایە
کی دیبوکری یان مامەش ئەگەر بار بکا ، رعیەتەکان کوزەی رەشی لەدوا دەشکینن . "

کاتی فراوین تەمانشام کرد هەر زەلامە دێتە ژوور و دەچێ لە لای سەروو دادەنیشی
دیوەخان پر بوو. چوار پینج کوری تەها هاتنە ژوور لە لای خوارەوە دانیشتن . نانیان
هێنا ، هەر بە دوو کسان مجمعەیەکیان لە پیش دانان . تەها بانگی کرد کە لەگەل
ئەو نان بخوم . لە سەرنان خواردن پیم گوت : " ئاغا وادیارە بێ و قەدەمی ئیمە خیر
بوە ئەوهەموو میوانە لە کوێ پەیدا بوون؟ .
گوتی : " میوان نین . خەلکی گوندین . دابی ئیمە وایە خودانی مال دەبێ بیت لە
گەل ئیمە و لە دیوەخانی ئیمە نان بخوا " .

دوای نانخواردن رادیویان هێنا و گویمان لە دەنگوو باس گرت . رادیوتاران باسی
شەری نێو خوی یونانی دەکرد . موهەندیسیکی یونانی بەناوی ( مسیو ) کارناسی توتن بوو
لە دوخانیەی ورمی . مسیو کە ناوەکەی نەزانم کابرایەکی سمیل زلی قەلەوی کەلەگەت
هەمیشە پیپیکی بە لا لغاوەوە . مسیوش بو مسەلەی توتن هاتبوە کانی سی . فیری فارسی
ببوو سەر و کوێی دەشکاند . لە سەر وەزعی یونان لە گەل کورەکانی تەها لێ ی بوو بە
قرە و دەم بە دەمە . مسیو دیفاعی لە کومونیستەکانی یونان دەکرد . کورەکانی تەهاش
لەژیر تەئسیری رادیو تاران و خویندنی قوتابخانە لە ورمی دیفاعیان لە بورژوازی یونان
دەکرد . باسەکەیان خوشبوو. تەها گوتی : " لەم کیشەیەدا تونەزەرت چیە؟ " .
- من میوانم و ئیستا دەروم . وادیارە مسیووکورەکان کیشەکەیان تازە نیە .
- هەتا مسیونیتە ئیرە ئەوکینە هەیە .
- من لایەنگری بیرو رای مسیو دەکرم . خەلکی یونان و پیشمەوان حیزبی کومونیست دژی

فاشیزم شەڕی کرد . ئێستا لەشکری ئینگیزو ئەمریکا هاتوون و دەیانەوێ بورژوازی سەر بە خۆیان بەسەر خەلك دا زال بکەن . کە قسەکانم تەواوبوون تەها گوتی :
ـ لە نێو ئێمەدا باوە لە میوان بپرسن لە کوێوە هاتوە و لە چی دەگەڕێ؟ ". بەلام من ئیستا ناچار دەپرسم لەکوێوە هاتوون و دەچنە کوێ و لە چی دەگەڕین؟ ".
ـ خەلکی سنەوسین . هێندێ خزم مان لە مەرگەوەر هەن دەچین سەریان دەدەین . ئەگەر ئیجازەن بدەی با ولاخمان بۆ بینن و مەرخەسمان دەبین .
پاشان بە سیوم گوت پێم خۆشە ئادرسی خۆتم بدەیەی رەنگە منیش تۆتن بێنمە دوخانیە .
ـ من هەمیشە لە دوخانیە دەبم . ئەگەر هاتی بم بینەوە بە چاوان ئەگەر تۆتنت هەبی .
تەها گوتی زۆر ساردە . ئەو شەو لێرە بن . بەلکوو بتوانم لیتان حالی بم .
ئیجازە بفەرمووی دەڕوین . سیو لەگەل کورەکانی تەها وەدەر کەوت و دیوەخان چۆل بوو .
بە تەهام گوت : " لاموایە تۆ بۆیە نایی مسەلەی نەتەوایەتی ونیشتمانیت لێ بشارینەوە . من مەسئولێکی سیاسی حیزبی دیموکراتم . ئێمە خەریکین ریکخراوەکانی حیزب زیندوو کەینەوە . تونێوبانگێکی باشت هەیە . لەگەل عەجەمان نەبووی . دژی بارزانیەکان شەڕت نەکردوە . جا بۆیە داوات لێ دەکەم کە خۆت لە ریزی نیشتمان پەروەرانی کوردستان هەلنەوێری و خۆت جیا نەکەیەوە .
تەها گوتی : " دەزانی ئیستا عەجەم زالن . جاسوسی وان پڕن . مروف نەکاری تشتیك ببیژی ".
گوتم : " هاوکاری تۆ لە گەل ئێمە جورێکی تایبەتی دەبێ . هەر کەس جورێك دەتوانێ یارمەتی بدا و خزمەت بکا . هەموو کەرنایە لە گەل تۆ پیوەندی بگری ".
ـ من بۆ هەموو هەوکاریەك بۆ کورد ئامادەم . بەو شەرتە تۆ بمناسی . رەمزونیشانەیەکمان دانا و سوار بووین چووینە مەرگەوەر مالە خەلیفە سەید وەهاب . ئامۆزنی سەید محەممەد لەوێ بوو دەیوایە لە گەل خۆمان بیهێنینەوە بۆ کونە قەلا . چەند ڕۆژ لە مەرگەوەر بووین . چووینە دزە و لە گەل سەید عەبدولقادری کوری حاجی سەید عەبدولا ئەفەندی قسەم کرد . لەگەل سەید موسی و کوری خەلیفە سەید وەهاب قسەم کرد و قەولی هاوکاریان دا . نیشانەورەمزی پیوەندیم لەگەل دانان . پاشان جەوتوییەك بۆ سنە وسرکەراینەوە . لە گەرانەوەدا زانیم کە قازی شنو مالی لە(کانی سپیە). قازی شنویەم دەناسی . دادستانی گشتی کوماری دیموکراتی مەهاباد بوو . یەك لەو کەسانە بوو کە لە گەل ئاغا و سەروك عەشیرەتەکانی

کورد چوبوه باکو و له گەرانەوەدا شیعریکی دانابوو له یەکیك له چاپەمەنیەکانی ئەودەمی کوردستاندا بلاوکرا بـووه . چەند شیعرەم هەر له بیر ماون ئەمانە بوون :

" گەلی کورد ئیتفاقو گەر نەدیوه ـــ بچن بوخاکـی پاکی شوورەویــوه "

" تەوارین ئیستلاحیکه عروسی ـــ له باتی ئوخوەتی ئیسلام خصوسی "

" ستالین ئەو رەئیسی وا به هیممەت ـــ تەواریشه له گەل ئەفرادی میللەت "

" وەکوو میر جەعفەری سەرداری پاکی ـــ دەلێ یولداش به حەمال و به خاکی "

ئەم زانه پاش روخانی کوماری مەهاباد رای کرد بوو .چوبوه دەشتە بیل و له کانـی سی له قسـەی راگرتبوون و پێشرەویژی دەکرد . به هەلبژانی سەریکی لێ بدەم و لەگەلی باس بکەم . ماله قازی ـ مان دیتەوه و چووین له دەرگا دابەزین . پیاوەمق بلێ به خیر هاتنیکی کوردانەی کردین . یەك دوومیوانی دیکەشی هەبوون . سەر ویێ یەکی زور به تام و خوشیان لـێ نابوو . به لاتاوهیندی پلارم هاویشت وباسی نەخشی مـەلاکانم کرد لـه وریا کردنەوەی خەلك و رێنوێنی و دریژەیخەبات . قازی زور ترسا و گوتـی :

" لاهوایه جاری پیاو واز لەم قسانه بینی . وەزع موساعید نـیه " .

دیتم کابرا زور ترساوه و بۆ دواندن نابـێ . پاش نان خواردن سوار بووین و کەوتینه رێ وشەو هاتینەوه کونەقەلا .

له هاتوو چۆی تەوریز و قونقەلا بولای جەعفەرئاغا له گەل عوسـمری برای جەعفەرئاغا که ئاغای گوندەکان و به سەر قونقەلا وەمەلیان رادەکیشت دۆستایەتیمان خوشببوو ئیتر پیوەندی ئاغاو رەعیەتی نەبوو. وای لی هات پێم راگەیاند که من خەریکی تیکوشانی سیاسیم و پیویسته تونی یارمەتیم بدەی . له لایەکی دیکەشەوه شـه رافەت خانمـی دایکی جەعـ عفەرئاغا رای ئەسپارد که دوو تەنەکه رونـی ئیجارەم لێ نەستینن . بیجگه لەوانه هەمـوو جار که له تەوریز دەهاتمەوه کەریماغای قونقەلا لەدوای دەنارد م و ماوەیەکی زور قسەمان دەکرد . لەم جەرەیانه کەلکم وەر گرت و له نیو پیاوەکانی مالی کەریماغا و له قونقەلا ش دەستم کرد به تیکوشان . میرزاعەلی مرادی خەلکی ئیندرقاش که پیاوی سمایلاغای کەریمی بوو هاته ریزی تیکوشان و میرزا محی الدینی قونقەلا که کویخا سجیل و یەکیك له پیاوه تیگەیشتو بـاـ شەکانی شارویران بوو بوو به ئەندام و له ریگای ئەوانەوه له راوتەکبیر وکوبوونەوەی ئاغاکان ئاگادار دەبووین .

جاریك له سەفەری تەوریز پارچەیەکی ئەفسەر یـم کریبو و کردبووم به چاکەت و پانتول

ئەم پارچەیەش یەك یەك لە ئاغاكان لەبەریان دەكرد . رۆژێك بەسواری لە شارویران دە هاتمەوە لەنێوخەلیفەلیان هەمزەئاغای خەلیفەلیان راوەستا بوو سلاوم كرد وێ ئەوەكە ـ وەلامی سلاو وەكەم بداتەوەگوتی : ئەوەبۆ ئەوپارچەت كرد وتەلیباس؟ ئەوە بوكرمانج نابـی ."
گوتم : "هەمز ئاغامن رەعیەتی تونیم. پاشان خوم لەهیچ ئاغایەك بە كەمترنازانم".

زستانی ئەو ساڵە بەفرێكی زۆر سەرمایەكی توونش بوو . مزگەوتی مەمەلیان ئاوەدان بـوو . دەچومە مزگەوت و خەلكی گوندی بە گشتی شەوانە لە مزگەوت كودەبوونەوە هیندی باسی وەزعی سیاسیم بۆدەكردن . پاشان لە سەر داد پەروەری عومەری كوری خەتاب ـ خەلیفەی چوارەم قسەم دەكرد و دەم هیناوە سەر زولم وزوری ئاغاكان و بێ غیرەتی خەلك و یەك نەبوون . دەمگوت ئیسلامـی بە راستی ئەمنێ بە غیرەت بـێ، وزولم قبول نەكا .
مەلایەكمان هەبوو ( مەلا قادر) پیاوێكی فەقیر و هاوینان دەبوە سەركاری ئاغا وخرمانی هەلدەگرتن و پێشنوێژی زستانانیشی دەكرد . لە مزگەوت خەلك رووی تێ دەكرد دە ماموستا فەرموو باسی شتێكمان بۆ بكە .
ـ ئە وەنـیە میرزا كەریم لیرە یە . دە فەرموو وەلا حەوسەلەم نیە . ".
پاش قسەكانم دەمگوت : " ماموستا ئەگەر هیچی بێ شەرعـی دەلێم بفەرموو".
ـ نە خیر ناولا هەموو موتابیقی ئایەت و حەدیسە".
برادەر و دوست و جیرانێكی لە رادە بەدەر پیاو وجوامێر و باش تێگەیشتووم هەبوو بـــە ناوی ( مینەی عەلیاغا ) كاكە مینە واد یار بوو لە پێشێ لە مەمەلیان ملكیان هەبوە و پاشان وردە وردە زوردارانلێ یان كەم كردوونەوە یەك دوو پارچە زەوی مابوون دەیكیلان و لە نیو ئاغاكانیشدا ریز وئیحترامێكی هەبوو . زور جار ئاغاكانی خەلیفەلیان لە دوویان دە نارد و دەهاتنە مالی . كاكە مینە كوردێكی دلسوز و بیزار لە دەرەبەگ وسیستمی دەرە بەگی . دوستایەتیەكمان گەیشتبوە برایەتی . رۆژێك گوتی : " ئاگات لە خوتبـێ . بابم لە مەجلیسی ئەو ئاغایانە هەر باسی تویە . دەلێن لە مزگەوت رۆژنامە بو خەلك دەخوینیتەوە . دژی ئیمە تەبلیغات دەكا . و زور قسەی دیكەش".
دوستایەتی كاك عومـەر و هاتووچوی مالی قادرئاغا وپشتیوانی دایكی جەعفەرئاغا

تا رادیەك بێ منەتی كرد بووم . كابرایەكی فەقیر وباش بە ناوی ( سەعید قەلغان) لــە مەمەلیان دەژیا . هەشت سەر خیزان بوو . لای خوی جوتبەندە بوو بەلام قەت لە بەر سەلەم خور و سوت خور و قەرزو قول ئەوەندەی بۆ تەدەما كە بەشی ژیانی سالی بكا . رۆژێكـــی

ساردی زستان هاتە لام و گوتی : " تەگبیریکم بۆ بکە . زەواتم لە مال دا نیە . دوو ڕۆژە ئارد لە مالان قەرز دەکەین . چوومە مالە ( ڕەحمان کشپەلی ) بەلکوو هیندی دەخلی لێ قەرز کەم . دەلێ بارە هەرزنیکت دەدەمێ بەوەعدەی سەر خەرمانان بە چوار بار گەنم . لە سەر خەرمان دەبێ چوار بار گەنم بدەیەوە . جا تەماشای ئەو بێ ئینسافە کە؟ ".

ڕەحمان کشپەل دەولەمەندیك قورسی مەهلیان بوو . نیزیکەی ٣٠٠ سەری هەبوو . وشتر و گاران و جوت و عارەبە . مزلی ئاغاکان بوو بە تایبەت قادری کەریماغا دەهات بە ڕۆژ خۆی دەمالە کشپەل دەمخزاند . لەم ڕیگایەو لە ڕیگای سوت وسەلەم ئەم سەروەتەی وسەر یەك نابوو . بە سەعید قەلغانم گوت : " بچوو لێی وەرگرە . تا سەر خەرمانان خوا کەریمە .

سەعید چوو بوو بارە هەرزنیکی لێ وەرگرتبوو و لە کن مەلا قەبزی لێ هەستاند بوو . پولدارەکانی کورد ئاوا خوینی هەژارانیان دەمژی کە حاجی سەید محەممەدی تازە قەلاش نموونەیەکی تر بوو کە باسم کردوە .

ڕۆژیك چوومە مەهاباد . برادەران گوتیان خەلیفە مەلا عەلی خەلیفەی سەیدی زەمبیل بەولات دا دەگەرێ و لە هەموو شوێنی دژی حیزبایەتی و دژی کومونیزم تەبلیغات دەکا . بچوو بێ ی ڕابگەیەنە کە دەست لەو کەرانە و خلك فریو دانە هەلبگری . سوار بووم چوومە ئیندرقاش و میوانی میرزا عەلی مرادی ئەندامی حیزب بووم . کە چووم گوتی : " ڕەببی بە خیر بێی ئەو شەو خەلیفەش میوانی ئیمەیە ".

ـ خەلیفەی چی ؟ . شەرم ناکەی؟ ".

ـ چبکەم چەند برای کەرم هەن دەرویشن و بانگیان کردوە . عیلاجم نیە .

گوتم : " سێ چوار کەر لە برادەرانی حیزبی با شەو بێنە ئیرە . هەر ئیستا خەبەریان بۆ بنیرە ".

ئیواری دوای نوێژی شیوان خەلیفە لەگەل گارانیك سوفی و دەرویش و کەیخودای گوندی هاتنە مالە میرزا عەلی . عەلی بایزاغاش کە پارچە ملکیکی لە ئیندرقاش هەبوو خزمی کاکە مینەی مەهلیان و دۆستیکی خوشەویستی ئیمە و پیاویکی ئاقل و بەشەخسیەت بوو ئەویش لەگەل خەلیفە بانگیشتن کرا بوو . لە گەل عەلی بایزئاغا چاك و خوشیمان کرد و گوتی : " ڕەببی بەخیر هاتی . بەلام بە خوا هاتنت بێ قسە نیە ".

نانیان هینا و پاش نان وچا کەوتنە سرت و خورت و دەرویش خەریك بوون جەزم بن بە ئیستلاحی خۆیان کوری زیکر بگرن . من پیشتر خەلیفە مەلا عەلیم دەناسی و لەگەل

باوکیشم ئاشنایەتی کۆنی هەبوو. پێش ئەوە بەزم سازیی رووم کردە خەلیفە و گوتم:
"قوربان دیارە پرسیاری شەرعی ئیجازەیە".
ــ بەلێ فەرموو میرزا کەریم.
ــ من زۆر لە خزمەت مەلایان بووم و بیستوومە جەماعەتێك چونە خزمەت شیخی ئیبنول حەجەر لێ یان پرسی (جەماعەتێك پەیدا بوون پرچ دەهێلنەوە و سەر هەلدەسوڕێنن جەزم دەبن و حالەت دەیانگری. شووشە دەخۆن و خەنجەر لە خۆ دەدەن ئەو کارە بە شەرع چۆنە ؟".
فەرمووی: "ئەگەر لە دەست پیاوی بەدین واقیع بێ و بە شەرع بجوڵێنەوە کەرامەتە ئەگەر لە دەست پیاوی بێ دین واقیع بێ ئەگەر سیحر نەبێ لە سیحر خەراپترە".
نەزەری جەنابت لەو بارەوە چی یە؟.
مەلا حەمەدەمینی ئیبن و شەیتان کە تازە هاتبوە ئیندرقاش و خۆی کرد بوە خەلیفە و دەستی بە راووروت کرد بوو نەیهێشت خەلیفە مەلا عەلی وەلام بداتەوە هەلیدایە وگوتی:
ــ نەتی وانیە". گوتم: باشە تۆ مەلای بنێرە کتێبی ئیبنو حەجەر بێنن و تەماشای بکە روون دەبێتەوە وایە یان وا نیە.
گوتی: "ناوەلا دەنێرم (عەبدولا یەزدی) بێنن".
ــ لە شەرعدا ئیبنو حەجەر لە هەموان موکتەبەر ترە. منیش باسی ئیبنو حەجەرم کردوە.
گوتی: "تۆ کافری. هەقی ئەو پرسیارەت نیە".
گوتم: "تۆ کافریشی وکەریشی. بە عەبایەك و ریشێکی حیز خەلك فریو دەدەی و چاوی خەلك دەبەستی. سەگبابی گەر من پرسیارێکی شەرعیم لە خەلیفە کردوە تۆ بۆ دەم تێوەردەدەی ؟".
گوتی: "کوا دەرویش لە کوێن؟ بۆ ئەو کافرە وەدەر نانێن؟".
دۆستی سۆفی و دەرویشکەر لە دێوێکی دیکەوە ویستیان بینە ژوور. برادەرانی حیزب راست بوونە و عەلی بایزئاغا لە دەرویشان هەستاو ڕەنگی دان: "وەدەرکەون دەمید باب بە شەقانوو دەکوژم. رووی کردە ئیبنو شەیتان و گوتی: "مەلا میرزا ــ کەریم پرسیاری لە جەنابی خەلیفە کردوە تو بۆ هەلدەدەیەی؟".
ــ نا ئەوە کافرە کومونیستە".
گوتم: "سەگباب لە بەر خاتری خەلیفە مەلا عەلی نەبێ ئیستا بەولاوانە دەڵێم پەتکت بکەنە ئەستووبۆ هەموو شیخ و خەلیفەی دیتا ئاقلت بکەن".

خەلیفە مەلا عەلی وەدەنگ هات گوتی : "کاك کەریم نارەحەت مەبە . پیاو دەبێ لە سەر خۆ بێ".

ـ قوربان من هیچم نەگوتوە . بەلام تاوانی گەورە لە ئەستوی ئێوەیە . هەر کەرێکی سەری ـ سێی بوو دەیکەنە خەلیفە و بە گژ خەلکی دادەکەن . زەمانی راوروت بە ناوی شێخایەتی بە سەر چوە . خەلك وریا بوتەوە . ئیستا خەلك بوئازادی هەول دەدا و سەر بەستیەکەی بێ لە بە هەشتی خەلیفە باشترە . کێشەی ئەو شەوە لە ناوچەدەنگی داوە . ئاغاکانی شار ویران چونکە بۆ خۆیان مریدی شێخی بورهان بوون ئەمەیان بە کەیفی بوو . کەریماغا گوتی دەستت خوش بێ دەبوایە هەر بەوشەوە مری کەی".

لەم ناوەدا رەحیمی سولتانیان و رەحیمی خەرازی دەچنە تاران و لە گەل صارم ـ الدینی صادق وەزیری پیوەندی دەگرن و پاش باس و تەگبیر لە گەل دوست و برادەران بریار دەدەن کە تیکوشان هەر بەناوی حیزبی دیموکراتی کوردستان بێ و (ك.ك.ك.؟) هەلوەشێنەوە . حیزبی تودەی ئیران وەعدە و بەلیتی دەدا کە یارمەتی بە زیندوو کردنەوەی ریکخراوەکانی حیزبی دیموکرات بدا . بەرلە هەمووشت لەبارەی کادرو رێنوێنی تەشکیلاتیەوە یارمەتی بدا . ئیمە بەناوی حیزبی دیموکرات کار وتەبلیغاتمان دەکرد . بەلام لە واقیعدا وەك بەشێك لە ریکخراوی حیزبی تودەی ئیران بووین . بە تایبەت کادری بە رێوە بەری خۆیان بە تودەیی دەزانی . برادەرانمان بە تاوانی تودەیی دەگیران . ریژیم بە ئانقەست دەیویست ناوی حیزبی دیموکرات نەمینی و کەم بەوتاوانە پرسیاری لی نە دەکرا لە دادگا و لیّ پرسین دا . خەباتی نەتەوایەتی ، تەبلیغات بومەسەلەی کورد یا وەدەست هینانی مافی نەتەوایەتی ، هەر باس نەدەکرا . ئەساس وبناخەی تیکوشانمان لە سەر خەباتی چینایەتی دامەزرا بوو . بە هیچ جور سەرەرای ئەوهەموو ئیمکاناتە بیریك لە دەر کردنی روژنامەیەك بە زمانی کوردی نەدەکراوە . ریبەرایەتی حیزبی تودە باسی مەسەلەی نەتەوایەتیان جاریکیش نە هێنا گوری . ئەوکەسانەی ئەودەم باسی کوردایەتیان نە دەکرد و بە ناوی کومیتەی بەریوە بەری کاریان دەکرد و خۆیان بە تودەیی دەزانی لە پاشان بوون بە ناسیونالیستی بەرچاوتەنگو ئەمجارە خەباتی دژی تودەیان بە ئەساس دا دەزانی .

حیزبی تودەی ئیرانیش تووشی ئەم هەلەیە بوو کە ریکخراوی خۆی بە ناوی حیزبی تودە لە کوردستان دانەدەمەزراند . ریکخراوی خۆی لە ریکخراوی حیزبی دیموکرات جیا نە

دەكردەوە . لەوماوەیەدا بیرمان لە بەرنامە وئەساسنامەیەك بۆ تیكۆشانی خۆمان نەكردەوە . ناوی حیزبی دیموكراتمان پاراستبوو بەلام لە راستی دا تابیعی ریكخراوود ستوراتـــــی حیزبـی تودەی ئیران بووین . روژنامەی بەسوی ئاینده ئه هیاز چەلەنگەر كە سەر بە حیزبی تودەی وئورگانی ئاشكرای ئەوحیزبە بوون، ئەساسی ماتریال و نوسراوە وخویند نەوی ئیمە بوو . ریكخراوەكانی حیزبـی بەرەیان دەگرت و خەباتی چینایەتـی تا دەهات تونـد تر دەبوو . حیزبی تودە كریكاریكی كارخانەی چیت سازی تارانی نارد بـوە مەهاباد كە لە باری تەشكیلاتـیەوە یارمەتی برادەران بدا . ئەوەی برادەرانی مەهاباد وەریان دەگرت بوكومیتە وریكخراوەكانی دیكەیان دەنارد تا ئەنجامـی بدەن .

لەپایزی سالی ١٣٢٨ ( ١٩٤٩ ) نامەیەكی رەمزم بو هات نوسرابوو حكومەتی ئیران داوای لە حكومەتی عیراق كردوە كە ( حەسەنی قزلجی عبدالرحمانی زەبیحی هەژار و سەمەدی ) كە لە سولەیمانی لەمالی شیخ لەتیفی كوری شیخ مەحمودن بیانگری و تەحویلـــی ئیرانیان بداتەوە . داوایان كرد بوو كە بەگورجی خەبەریان بدەمـی . هەرئەو روژە قادری سوفی هەمزەی خەلكی قەرە قەسابم سوار كرد ناردم بۆ زینوی شیخ . نامەیەكم بـو برادەرانی حیزبی كومونیستی عیراق نوو سـی كە خەبەریان بدەنی جیگای خویان بگورن زوو خەبەریان پیگەیشتبوو روژیك پیش ئەوە كە بچنە سەریان شیخ لەتیف ناردبوونیە گوندی ( سیتەك ) وئەم جارە نەجاتیان ببوو .

سەرە بە هاری سالی ١٣٢٩ ( ١٩٥٠ ) روژیك مەلا قاسمی زەنو لە مالمان پەیدا بوو . گوتی باریكم توتن هیناوە لە گەل یوەرە بچین لە شار ویران بیفروشین و لەویش یەك دوو تفەنگ دەكرین و دەیانبەین بو عیراق . لە مال من هەربیكار بووم . لە گەل مەلا قاسم چوومە شارویران . توتنمان فروشت و دوو تفەنگمان كری و چوینە كویستانەكانی دیوی عیراق مالە ( رەسوی حاجی شیخە ) . تفەنگەكانمان فروشت وكویخا رەسوو پەنجا هەزار تەمەنی دایمـی كە حەیوانی بوّ بكرین حەیوانی پینج تمەن بدا بە ئیمە . لەگەل مەلا قاسم گەراینەوە چوینـە كانی زمرد ودیلكە و هەوشینان و ١٢٤ سەرمان شەك كری و بە دوّلی لكیندا هاتینە خوار ولەنیزیك گوندی ( كەپلەسەن ) مەلا قاسم گوتی من دەچمەوە كورەكەم دەنیرم لە گەل شوانەكە ئاگای لە حەیوانان بێ، توش وەرەوە مالی . كوری مەلا قاسم هات ولەوێ مەدا مام رەسووی ئاغای گوندی ( خەرابە ) كە تفەنگی لە دەولەت وەرگرتبوو راوی بوّ عەجەمان دەكرد پەیدا بوو گوتی ئەوحەیوانانە بوكوێ دەچن؟ . گوتم :- چیودارین ویوّبازاری سنە وسیان دەبەم .

گوتی . "نا وانیه. ئه و جه‌لبه بۆعیراق ده‌چێ . من مه‌عموری ده‌وله‌تم ده‌یگرم."
ده‌نگی نۆکه‌ره‌کانی دا وگوتی . "بیبان به‌ن بۆگونده‌ی خه‌رابه من ده‌چمه خانێ و عه‌جه‌مان ده‌بینم".
وه‌پێش خۆیان داین وله ڕێگا پیاوه‌کانی جنیویان پێده‌دا و ده‌یانگوت بۆته نۆکه‌ری عه‌جه‌مان و ڕاو ورووت ده‌کا. "ئه‌وه‌نده‌ی بۆم کرا قسه‌م بۆکردن و وریام کردنه‌وه. شه‌و له گونده‌ی خه‌رابه خه‌لکمان لێکۆبووه. ده‌ستم کرد به قسان وگوتم : "خۆتان ده‌بینن چۆن ئاغاکان شه‌ره‌فی خۆیان فرۆشتوه و ڕاووروت بۆعه‌جه‌مان ده‌که‌ن. ئه‌وه ته‌نیا له گه‌ل من نیه . ئێوه‌ش هه‌ر ئاوا ده‌چه‌وسێننه‌وه. پێویسته بو ڕزگاری یه‌ك بگرن. ئه‌گه‌ر هه‌مووتان یه‌ك بن ئاغا ناتوانی زوڵمتان لێ بکا. داوام لێکردن که ببنه ئه‌نداممی حیزبی دیموکرات و به یه‌کیتی و تێکۆشان له چنگ ده‌ره‌به‌گان خۆ ڕزگار بکه‌ن.
شه‌و له وێ بووین، به‌یانی یازده سه‌ربازله خانێ وه هاتن. حه‌یوانه‌کانم له‌وێ به‌جێ هیشت وکوڕی مه‌لا قاسم له لایان به جێ ما وه‌نیان برد بو خانێ. له‌ڕێگا له گه‌ل سه‌ربازان به قسه کردن ده‌هاتین تا نیزیك خانێ . له وێ ده‌ستیان به‌ستم و بردیانم بۆ لای سه‌روان گیله‌کی فه‌رمانده‌ی پادگانی خانێ و حاکم و هه‌مه کاره‌ی ناوچه. که چوومه ژوور، سه‌روان ڕاست بووه وده‌ستی پیکرد. گوتم : "تا ده‌ستم نه‌که‌نه‌وه وه‌لام ناده‌مه‌وه. ده‌ستیان کرده‌وه گوتی : "تۆ قاچاخچی ده‌که‌ی. حه‌یوان بوعیراق ده‌کری".
ــ نه خیر دره‌وه . من چیوه‌دارم و له ئیران دا کاسبی ده‌که‌م. من له سنوور دوور بووم و ته‌نانه‌ت له چۆمی لاوێنیش نه په‌ڕیومه‌وه."
ــ گوتی مام ره‌سوو ده‌لێ قاچاخن. بۆ وره‌یێت ده‌نیرم
ــ که‌یفی خۆته بۆکوێم ده‌نیری بنیره . به‌لام مام ره‌سوو به کابرایه‌کی دز و ڕیگر ناسراوه . ئه‌م تفه‌نگه‌ی هه‌ر بۆ ڕاو ورووت له ده‌وله‌ت وه‌رگرتوه. ئیستاش ئه‌گه‌ر ره‌سیده‌ی لێ وه‌ر نه‌گری حه‌یوانه‌کان ده‌خوا و حاشایان لێ ده‌کا."
مام ره‌سوو که له‌وێ دانیشتبوو گوتی : "ئه‌وقسانه بکه وه‌به‌ر ده‌ستم ده‌که‌وی".
به سه‌روانم گوت : "ئیستا له لای تۆ هه‌ره‌شه‌م لێ ده‌کا. بیێته‌وه حه‌یوانه‌کان ده‌خوا .
سه‌روان ره‌سیدیکی له مام ره‌سوو وه‌ر گرت و له‌گه‌ل نامه‌یه‌ك خستیه نیو پاکه‌تیك و له گه‌ل سه‌ربازیك سواری ماشینیکی کردم و بۆ ورمێ . شه‌وله ورمێ له میوانخانه‌یه‌ك ماینه‌وه و به‌یانی چووینه بو ستادی له‌شکر. پاش ماوه‌یه‌ك له ژوورێکی ٢ بانگیان کردم و سه‌روانیك لێی پرسیم : "حه‌یوانت له‌کوێ کڕیون و بۆکوێت ده‌بردن و چه‌نده له سنوور دوور بووی؟"

پاش‌وەلام دانەوە ،کابرا نووسی کە ئەو حەیوانانە قاچاخ نین و دەمێ بدرێنەوە بە خاوە
نەکەیان . نامەیەکی نووسی و دایە دەستم وگوتی بڕۆ حەیوانەکانت وەرگرەوە .

نامەم وەرگرت و چوومەوە خانێ . تا من چووبووەمەوە حەیوانەکانیان برد بوە گوندی
پەسوێ و ئەم جارە عەلی قەرەنیاغا خۆی لێ کرد بوونە خاوەن و حەیوانەکانی راگرتبوون
عەلی قەرەنیاغا لەگەل دێموکریان نێوانی ناخوش‌بوو . منیش‌رەعیەتی دێموکریان بووم
رەعیەت و هەژاری کورد هەر ئاوا ببوونە قوربانـی خۆپەرستی و قۆڕدەماخی و ناکوکـی
نێوان دەرەبەگە بێگانە پەرستانی کورد .

لە خانێ نامەکەم دا بە سەروان گیلەکی . گوتی : "حەیوانەکان چوونە پەسوێ .
سەربازێکت لەگەل دەنێرم بچوو وەریان‌گرەوە . لەگەل دوو سەرباز چووینە پەسوێ . لـــە
مەزرای پەسوێ‌لە سەر خەرمانێک لامان دا . ساحێب‌خەرمان چایان بۆ لێ نابین و بە خێر
هاتنیان کردین . من باسی حەیوانەکان و شکایەتم بو گیرانەوە . زوریان جنێو بە عەلیا
غا دا و لە دەست زولم و زۆری ئەو زالمیان دەهات. دەیانگوت هەموو جوتبەندەکانـــی
بە زوری کردونە نیوە کار . نیوە تۆومان دەداتێ و دەمێ بە نیوە تۆوی‌خۆمان و بە جوت
وگای خۆمان ببینە نیوە کار و نیوەی بەر و بووی کاسبی و زەحمەتی سالانەمان بدەین بە
ئاغا . بریکم قسە بو کردن . گوتیان : "ئەگەر تۆ ئەو حەیوانانە بستێنیەوە بە جارێک دە-
شکێ و سەر کەوتنی هەموو زەحمەتکێشانە".

کە چووینە پەسوێ نامەی سەروانمان دا بە عەلیاغا و گوتی : " دەمولەتیش‌بیاندا-
تەوە من ئەو حەیوانانە نادەمەوە".

گوتم : "عەلیاغا خۆت مـەشکێنە . ئەو حەیوانانە دەستێنمەوە". لەگەل سەربازان بــو
خانێ گەراینەوە . سوار بووم چوومەوە ورمێ . بەیانی کە دەچوومە ستادی لەشکر سـەر
لەشکر زەنگەنە فەرماندەی لەشکری چوار لەگەل عەلی قەرەنیاغا و پیروتی مارفاغای شاوەلە
لە پێش‌ستاد راوەستا بوو. چوومە پێش‌و نامەکەم دا بە سەر لەشکر. کە خوێندیەوە رووی
کردە عەلیاغاو گوتی : "ئەوحەیوانانە بۆ نادەیەوە؟ . مەگەر بۆت نە نووسراوە ؟".

- قوربان ئەوحەیوانانە قاچاخن. بۆعێراق دەچوون . نابێ بدرێنەوە".

گوتم : "ئیسپار زەمانی دێموکرات مام‌عەزیزی برای عەلیاغا چوو بوە عێراق و لاجا
نی بە عەرەبان دەفروشت . ئیستا ن‌عەلیاغا ئەم ناوچەیە بە خاکی ئێران نازانێ . ئەو
حەیوانانە ٣ کیلو میتر لە سنور دوور بوون . من ئێرانیم و لە ئێرانیش‌دا کاسبی تـا
ئیستا ئازاد بوە".

زەنگەنە رووی کردە عەلیاغا و گوتی : "گوێت لێ بوو؟" پاشان بانگی سەرۆکی رۆکتی ٢ی کرد وگوتی : "نامەی بۆ بنووسە بچی حەیوانەکان وەرگرێتەوە".

نامەیەکیان نووسی بۆ خانێ کە حەیوانەکانی بۆ دەستێننەوە و دەینێرنەوە بۆ سندوس. نامەم وەرگرت و گەڕامەوە بۆ خانێ . بە سەروان گیلەکیم گوت : "دووسەت تمەنت دەدەمێ بۆخوت و چەند سەرباز لەگەڵم وەرە بۆ پەسوێ . حەیوانەکانم بۆ وەرگرەوە . ولاخیکیش بۆ من پەیدا کە سواری بم . سەروان کە دوو تمەنیش وەردەگرت لەگەڵ دووسەت تمەن کەشکە بوو. بانگی سەرگروهبانیکی کرد وگوتی : "لەگەڵ دە سەرباز فەوری بۆ پەسوێ حەرەکەت بکە . پاشان ولاخیکی بۆ من پەیدا کرد و ناردی رەسولاغای کەلەکینی هینا و سوار بووین بۆ پەسوێ . لە گوندی شنو زەنگ لامان دا. کاک مامەندی شنو زەنگ کە ئامۆزای عەلیاغا بوو زۆری تکا کرد کە سەرباز نەبەمە پەسوێ . دەیگوت عەلیاغا ئابرووی دەچێ . جوابم نەداوە گەیشتینە پەسوێ . وسەر قەلاتی پەسوێ کەوتین کابرای فارس بە قەد نێرە کەرێک زەلام لە دوورەوە نەڕاندی :

ــ کو ئەمیر عەشایری ؟ .

عەلیاغا هاتە دەر و گوتی : "جەنابی سەروان فەرموو دابەزە".

ــ بۆ یاغی بووی؟ . نامە دەنووسم حەیوانان نادەیەوە . بە تەمای چی ؟ ".

ــ فەرموو دابەزە . ئەو لەشکر کیشییە ناوی . حەیوان نەخوراون .

دابەزین چوینە ژوور ونانمان خوارد و سەروان گوتی : "بنێرە حەیوانان تەحویلی حسامی بدەنەوە". چووم حەیوانەکانم وەرگرتەوە و هەر لە وێ شوانیکم گرت و لەگەڵ کوری مەلا قاسم بەرێم کردن بۆ بازاری محەمەد یار. نامەیەکیان لێ ئەستاندم کە دەمێ لە بازار بیانفرۆشم و نەمراویک بەرمە ورمێ کە لە بازار فرۆشتوومن . لە بازاری محەمەد یار یەك دوو برادەری قەرە قسابم دیتنەوە و نامەیەکمان نووسی کە ئەوان حەیوانەکانیان کریوون . مەلا قاسمیش پەیدا بوو ئیتر هەر ئەو شەوە مەلا قاسم لەگەڵ دوو شوانان جەلەبیان وەپێش خودا بۆ زینوێ شیخ و دابوویانەوە بە خاوەن پارە .

پاش ئەوە کە نامەکەم بردە ورمێ و لە کیشەی دەرەبەگ وعەجەمان نەجاتیم بوو چوومەوە مال . کاتی خەرمانان بوو دوکانی گوندی دەمێ هەمیشە میوەی هەبێ . ئامۆزاکەم لە لامان مابوو میوەی دەهینا و دوکان وەگەر کەوتبوو.

رۆژیك بەیانی زوو کە هاتمە دەر دیتم دوو تەلەبەر پڕ لە توتن لە حەساردا کەوتوون

توتنم برده ژوور و ئەو ساڵەش توتن وەگیر نەدەکەوت و زور گران بوو. بابم توتنەکەی کێشا دوو پوت بوو. گوتی: بیفروشە و ئەگەر خاوەنی پەیدا بوو پولەکەی بدەوە. نمونەی توتنم بردە رادانە و پوتی بە ١٢٠ تمەن فروشتم وعەجەم هاتن بردیان. حەوتویەك پێ چو بو روژێك لە بازاری محەمەدیار دەگەرامەوە لە ریگا دوو سوار بوشناخ گەیشتنێ و سلاویان کرد و پرسیان خەڵکی کوێی؟

ـ خەلکی مەمەلیانم

ـ ئەری خو پرسیار عەیب نیە. پێش حەوتویەك هێندێ توتنمان دەبرد بیفروشین. لە مەحەمەدشە توشی ژاندارم بووین. هەلاتین و لە ترسان لە مەملیان توتنمان هاویشتە حەساریك و روێشتووین. ئیستا لە حەسارەکە دەناسینەوە نەدەوێرین پرسیار بکەین.

ـ باجارێ لادەین لە ماڵە من نان و چایەك بخون و پاشان دەپرسین. لامان دا و بە باوکم گوت ئەو خزمانە توتنیان لێ ون بوە. بابم پرسی: "توتنەکە چەند بوە و بایی چەندی بوە؟".

ـ دوو پوت بوە و پوتی بە ٦٠ تمەنمان کڕیوە.

ـ بە تەما بوون بە چەند بیفروشن؟.

ـ خومان لە پوتی سەت تمەن خوش کرد بوو بەلام ئەوە جارێ ون بوە.

بابم گوتی: "توتن لە حەساری ئیمەدا بوە. فروشتومانە پوتی بە ١٢٠ تمەن. ئەوەش پولەکەی. لە پێشدا حەبەسان. بابم پولەکەی لە پێشدانان. زور سوپاسیان کرد و چل تمەنیان دا بە بابم. پاشان گوتیان دەمێ لە سیلەکە میوانمان بی. ئێمە کورو خزمی (مام وەتمان) ـ ین.

## مام وەتمان کێ بوو؟

وەتمانە سوور خەلکی گوندی دێبوکر بوە. وەختی خوی گەورە نوکەری بایز پاشای مەنگور بوە. لای کاخدری دێبوکری وەك ریش سپی و کەیخودا رێز و حورمەتی هەبوە. نازانم لە سەر چی لە گەل عەولای کاخدری دێبوکری تێکچوە. تورابوو لە گەل چەند ماڵە خزم و دەور و بەری هاتبوە لای قادر شای ماسوی و لە سیلەکە دایمەزراند بوو.

ماڵیکی گەورە ماڵ، خاوەن تاول و رەشماڵ و مەردار، خاوەنی چەند جوت دوو کوری بە ژن وماڵ وزور پیاو و جوامیر.

بیجگە لە وانە چوار نەوەی هەبوون کە دایك و بابیان نەما بوون . ئایشەگول لە نیو مال و لە نیو نەوەکاندا وەك ئەستیرەیەك دەدرەوشا . ئایشی کیژیکی ٢٠سالەی بێ دایك و باب. کیژە مەنگوریکی گوندی، لە ئاقل و جوانی و کەمال دا وێنەی کەم هەبوو . قەلەمی من ناتوانی باسی جوانی ئایشی مام وەتمانی بکا . هەر ئەوەندە دەتوانم بلیێم لەو کاتەوە ئەگەر ژنیکی جوانم بە چاو کەوتبێ، ئایشی مام وەتمانم وەبیر هاتوتەوە .

یەکی دیکەی لەو مالانە کە لە گەل مام وەتمان هاتبوونە سیلەکە مالە ( عەولای رەسو سوارە) بوو . کاك عەولا پیاویکی تیکەیشتوو بنە مال/سی چوار برا بوون حەمەد یەکیك لەو برایانە بوو کە قسە خوشی و پیاوەتی و خزم دوستی باسی ناکری .

## خـرمانـی سـەعید قەلغانـی

روژیك لە مال دانیشتبووم سەعید قەلغان هات .

ــ کاکە هاتووم چارەم بکەی .

ــ چیە کاك سەعید ؟ چ قەوماوە ؟ .

هیچ نە قەوماوە . خرمانەکەم سوورە . رەحمان کتیهل جەوال وعارەبەی هیناوە و لـــە جیاتی بارە هەرزنی زستان ئیستا چوار بارگەنمی دەوێ . ئەوگەنمەم لێ بستینی هیچم بۆ نامینیتەوە .

ــ مـە یەدە یە . هەرزن زستان بە چەندی بوە بابی ئەوەندە گەنمی بدەیە .

ــ کاکە دەرە قەتی نایەم . ئاغاکان بە قسەی دەکەن .

ــ کەنگێ خرمان هەلدەگری ؟ .

ــ شـەورو. ئەوە هاتم بانگت کەم بۆ نانخواردن بێ یە مالی ئیمە . جیرانەکان لە سەر ــ جیخونن .

ــ تو برۆ . ئیستا منیش دێم ئابرووی دەبەم باسی گەنم بکا .

لە کوردەواری باو بوە روژی خرمان هەلگرتن کەیخودا و جیرانی گوندی بۆ میوە خواردنــی سەر خرمان و نانخواردن بانگ دەکرین . کە چووم سەر خرمان ریش سپی گوندی لــە وینە مری بوون . مـەلا قادر و عـەولا گوجـی کویخاتی سەر کار بوون و هاتبوون خـرمان هەلبگرن . دەستە پیاو وجواميرەکەی منیش کاکە مینەی عەلیاغا لە وێ بوو .

خرمان پیورا . ملکانەی ئاغا و کزیرانە و سەر کارانە و جوەالانە و هەمرو سوور ساتی

لیٚ جیا کراوه . بەشی سەعید قەلغانیش لەو لا ڕۆکرا . کاڵوك و شوتیمان خوارد وە‌ـ
ڕەحمان کشیەل گوتی . " سەعید با گەنمەکەی من دە جەوالان کەین ".
گوتـم گەنمی چی؟ . بۆ مام ڕەحمان توش‌ملکانەی لیٚ دەستێنی؟ .
ـ ئاوەلا ملکانە نـیە . پێم‌قەرز داره . لێم سەلەم کردوه .
ـ ئەوە شتێکی دیکە یـە . حیسابی خۆتانە .
سەعید قەلغان وەدەنگ هات . " کاك کەریم زستان هیچم نەبوو. مام ڕەحمان ماڵی ئاوا
بـێ بارە هەرزنێکی داـیٚ . بەڵام قەبزیچوار بارە گەنمی لیٚ ئەستاندووم ئێستا ئەو
گەنمەی دەوێ .
گوتم . " جا ڕەنگە ماموستای‌ئەو قەبزەی نووسیبێت . " مەلا وەدەنگ هات .
ـ جا من بلێم چـی . هاتن گوتیان قەبزمان بـۆ بنووسـە .
ـ باشە ماموستا وەلاهی ڕۆژی قیامەت‌هەر بە تاوانی نووسینی ئەو قەبزە دەت‌سوتێنن .
جا ئەوەش‌ئیسلامەتیه؟ . ئینساڤه؟ جیرانەتیه؟ ئەریٚ خزمینە بۆ دەنگ ناکەن ؟ . کابرا
برسی بـوە هیچ عیلاجـی نەماوە. نالێن برسیەتی حەرامـی حەلال دەکا؟ . کابرا کـە
برسی بوو گۆشتی سەک دەخـوا . چون مام ڕەحمان بەڕاستیەتە چوار بار گەنم لە سەعیدی
قور بە سەر دەستێنی ؟ . ئەوەی بکەی تف و لەعنەتت دەکەن ".
ـ بۆ تف و لەعنەتم دەکەن؟ . خۆ زیم نەکردوه . سەودایە و لێم سەلەم کردوه".
ـ دزی زور باشترە . سەودای چی؟ . عەیبە . بارە هەرزنێك چەندی دەبێ گەنمـی
لـیٚ وەرگرە و برایەوە .
ـ دەنکێك کەم بـێ وەری ناگرم. هەقـی خـومـە .
ـ ئەگەر دەنکێکت بەداتیٚ پیاونیە . شەرم بکە .
کاکە مینە وکەریم عەجەم وەدەنگ هاتن .
ـ زور بیٚ ئینساڤە . بە شتێك بیبڕن و با تەواو بیٚ . سەعید فەقیرە . منداڵی زورن . "
ـ دەنکێك کەمی لیٚ وەر ناگرم . هەموو کەس‌وا پیاوی‌چاك نیە .
گوتم . " سەعید دەنکێکی‌ـە دەمیە . بزانین چ دەکا . من نازانم کابرای دەوڵەمەند
چون دەهـ بـێ بتوانیٚ ئاوا دەستی خەلك ببڕی ؟ . فەقیرەکان تاکەی وا خوێڕی دەبن .
بۆیە دەمیٚ گینەی لیٚ‌بسووتێنن، وشتری لیٚ بکوژن، هەزار خەرایەی لە گەل بکەن .
لەو کینە و هەرایە دا بووین کاك عوسمری برای‌جەعفەرئاغا گەیشتیٚ . دابەزی و

گوتی : " میوەت خواردوە ؟ . لەدوای تۆ هاتووم .

رەحمان کشپەل چوە پێش و گوتی : " کاک عومەر ئەوە دەهاتمە قونقەلا .

ــ خێرە شوکر مام رەحمان . پێکەوە دەچین .

ــ نا زستانی گەنمم لە سەعید قەلغان سەلەم کردوە و ئیستا کاک کەریم ناهێڵێ بم داتی .

مەلا قادر چوە پێش و حکایەتەکەی بۆ گێڕاوە .

عومەر گوتی : " منیش ئەو سەودایەم کرد با نەدەبوو بەدەنی . من بە کاک کەریم ناوەستم . هەر بانە بابی هەرزنەکەشت دەدەمێ . وەری گرە و بڕۆ " .

ئیتر رەحمان کشپەل مرتەقی نەکرد و سەعید قەلغان نەجاتی بوو . ئەو پشتیوانیە لە نێوگوند و لە گوندەکانی دەور و بەریش دەنگی دایەوە . خەلك بۆ گیر وگرفتیك دەهاتن و یارمەتیان دەخواست .

کاک عومەر لەگەل خۆی بردم بۆ قونقەلا و جارێکی دیکەش بوو تەوریز .

## خەلیفە و مولاقاتی زیندان

لە تەوریز لە موسافیرخانەی ( گیلان ) میوان دەبووم . ئەم سەفەرە خەلیفەیەکی زەمبیل لەگەل چەند دەرویش و سوفی لەو موسافیر خانەیە میوان بوون . من ئیتر لە فرو فیلی شیخ و خەلیفە و کیژ کردنی خەلك بێزار بووم و ئەوانیش وەك ئاغاکان دەکەوتنە بەر هێرشی تەبلیغاتی . بەیانی کە چومە سالونی دانیشتن خەلیفە تەشریفی لە وێ بوو . سلاوم کرد و بە خێر هاتن و پرسیم چونە تەشریف هاتوە ؟ .

ــ شیخ عەلی گیراوە و هاتووین سەری بدەین . جا نازانم مولاقات هەیە یان نا ؟ "

ــ بەلێ مولاقات هەیە . بە تایبەت بۆ جەنابت پێشترگیرانەوە نیە . منیش دەچمە لای جەعفەرئاغا " . خەلیفە هەستاو رویشت . منیش دوای نیو سەعات سواری تاکسی بووم و چوومە زیندان . کە چووم خەلیفە لەگەل دەرویش و سوفی لە پشت دەرگا راوەستا بوو .

ــ قوربان ئەدی ئەوە بو راوەستاوی ؟ .

ــ کورە ئەو سەلعوناتە دەرگا ناکەنەوە . دەلێن روژی مولاقات نیە .

من بە پولیسی بەر دەرگام گوت ئەفسەری کێشك بانگ کە . زوری پێ نە چوو

ئەفسەری کیشک هات . دەیناسیم. بولای جەعفەرئاغا هەیشە مولاقات ئازاد بسوو.
دەرگای کردەوە و چووە ژوور . چاوم بە جەعفەرئاغا کەوت وگەرامەوە . خەلیفە هەر لەوێ
راوەستا بوو. بە هەلم زانی گوتم . " تەشریفت نەچوە ژوور. بێگومان بەم عەبا و مەندیلە
و ریشە هەزار کەست وەدەوای خو داوە کە بو بە هەشتیان دەبەی . لە کاتێکا سەعاتێکە
عەجەم دەرگات لێ ناکەنەوە تو بلێی دەرگەوانی بە هەشت لە دەرگەوانی زیندان خوێری
تر بێ و وا بە ها سانی دەرگات لێ بکەنەوە؟. باشتر نییە بو ئازادی میللەتەکەتان تێ
بکوشن و ئەم بازارە کو بکەنەوە . خەلیفە چاوی بەرد انەوە و منیش رویشتم .

## نا فـە قـێ ی سەر خـوێن

پاش گەرانەوە لە تەوریز سەفەریکی ورمێ و مەرگەوەرم کرد . ئێوارەیەک لە گەل چەند
کوردی ناوچەی موکریان لە موسافیر خانەی ( ژالە) دانیشتبووین دوو پاسەوان کابرا-
یەکی دریژی موو زەردیان گرتبوو هێنایان . کابرا مەندیلێکی لە سەر و سەلتەوکەوای-
دریژ لە بەردا وگویا ( موستەعیدە) . لە موسافیر خانە گوتیان ئەوە مەلای کوردانە
لە خیابان مەست وکەلەلا بوە و رەت دەبا وقسەی بێجێ دەکا . ئەوە ئابروی کوردان
دەچێ . بو خوتان بزانن چی لێ دەکەن . لە فەقێی ـ م پرسی ." خەلکی کوێیـی؟ "
ــ خەلکی لای بانەم . ناوم مەلا سمایلە. لە نێو شکاکان مەلا یەتیم کردوە".
ــ شەرم ناکەی ئارەق دەخویەوە و لە شەقام بە مەستی دەگەریـی؟ .
ــ بە توچـی ، پولی خوم خەرج دەکەم".
هەتا هێزم تێدا بوو زللەیەکم لێدا . تو ئابروی مەلا و فەقێ ی کوردان دەبـە ی
ئێستا بە گرتنت دەدەم . دەستی کرد بە گریان . چم لێ دەکەن بەلام با نەم گرن .
جلەکانم دەگورم و دەروم . لەم ناوچەیە نامێنم ."
بە جەلیل ئاغای خاوەن موسافیر خانەم گوت . "بیبەن دە ژووریکی کەن و مەهێلن
ئەم شەو بێتە دەر. فەقێ یان بردە سەر و بە دوای ئەودا پاسەوانێک پیاوێکی پیرو کو
ریکی گەنجی وە پێش خودا بوو هاتە ژوور وگوتی . " ئەوانە لە زیندان بوون. سـی
مانگ بوە گیراوە. ئێستا ئازاد کراون بەلام دەمێ یەکێک بێتە دەستە بەر هەر کاتێک
داوا کران بیان هێنیتەوە . لێرەش کەس ناناسن .

لیم پرسین خەڵکی کوێن؟ .

ـ خەڵکی گوندی ( جاشمیرانین) نۆکەرێکی عەجەمان هەبوو بە شلتاخ شکایەتی لێ کردم ژاندارمەی شنۆیە رەمیچەکی داوین و ئەوە سێ مانگە لە زیندان داین. عەجەمیش کەس نازانێ لە کوێیە . فەقیریش نیم . جوتبەندەم . بەلام ئەوەندەمیان مۆڵەت نەدام کە دراوێك لە گەڵ خۆم بێنم. ئێستا قرانێکمان بۆ نیە هەر بۆی بچینەوە . جا نازانم دەبێ چ بکەین ."

پەرە کاغەزێکم وەرگرت و ئیلتزامێکم نووسی و پاسەوانم بەرێ کرد . گوتم دانیشن چایەك بخۆنەوە . ئەو شەو لێرە بن و سبەینێ پێکەوە دەچینەوە نەغەدە . بە جەلیل ئاغام گوت لە سەر حیسابی من ژووریان بدەیە . کشتەفیکم وەرگرت . دوو ئەفسەر لە سەری لە ژوورێك بوون چوومە لایان و گوتم : "دوو کەسی لیقەوماوی دەستی ژاندارم لە زیندان ـ ئازاد کراون و هیچیان نیە . دەمانەوێ یارمەتیان بۆ بکەین ."

ئەفسەرەکان پێنج تمەنیان دا. هاتمەوە خوار بە خەڵکەکەم گوت یارمەتی بکەن ئەوانە دە دەبێ بچنەوە . سی تمەنی دیکەش کۆ بووە. پولەکەم دانێ و گوتم پولی موسافیرخانەش هە دەمن . بەیانی سواری ئوتوبوس بووین بو نەغەدە . لە قاوەخانەی دەزە دابەزین . نان و چام بۆ کرین و هاتینە دەر . چاوەڕوانی سوار بوون (بحووین) کابرا هات و گوتی :

ـ ئەری قوربان پرسیار عەیب نیە تو ئاغای کوێی با بتناسین ؟"

ـ ئاغای چی؟ من لە جنسی ئاغا بێزارم. زەحمەتکێشێکم وەك ئەوە . وەك تۆش جوتبە-ندە بووم . لە بەر زوڵمی ئاغایان ئێستا هیچم نیە . چاولە جل و بەرگم مەکە . تا کەی هێندە فەقیر و بەد بەخت دەبن پێتان وایە ئاغا پیاوەتی دەکا. لە کاتێکدا لە خەرابە بەدەر هیچیان لە دەست نایە . ئەگەر ئاغا پیاو بان بۆچی تۆ وا لە بەر دەستی عەجەم رەزیل دەبوی ". من بە دەنگ قسەکانم دەکرد و خەڵك گوێیان دا بوویە . کە تەواو بووم کورە جحێلێکی کوك و پوشتە هاتە پێش و گوتی : " کاکە من لە دوێنی وە لە موسافیر خانە ئاگام لە تۆیە . با بزانم خەڵکی کوێی ؟ . من خۆم ئاغام. زۆریش دەولەمەندم . بەلام هەزار ئاغا بە قوربانی پیاوەتی تۆ بن . پێم خۆشە بتناسم ".

ـ خەڵکی مەهابادم و دوکاندارم .

ـ منیش خەڵکی ماسوێ ـــ م هەباسی کوڕی کاکە رەزا ـــ م. لە گەڵ کاك هەباس بووین بە ئاشنا دوایە بووین بە دۆست و برادەر، دوایە بووین بە هاوڕێ و هاوکاری حیزبی .

## جوانەگای شێخی

تێکۆشانی سیاسی تا دەهات ئاشکراتر دەبوو. ڕۆژنامەکانی حیزبی تودە بە نیوە ئاشکرا بڵاو دەکرانەوە. لە مەهابادەوە نامەیەکیان بۆ نووسیم کە سەفەرێکی مەحاڵی شازادە بکەم و بنکەیەکی حیزبی لەو ناوچەیە دابمەزرێنم. من ئیتر هەر بە ناو کوڕی ماڵی خۆمان بووم. ژیانم پتر بۆ تێکۆشانی سیاسی تەرخان کرد بوو.

بازارەکانی کوردستان کە ڕۆژی جیاواز لە ناوچەجیاوازەکانی کوردستان پێک دەهاتن جێگای هەرە باشی یەکتر دیتن و کۆبوونەوە و دۆزینەوەی خەڵک بوون. لە سەرانسەری کوردستانەوە دەهاتن بۆ بازاڕ و دەکرا بە ئاسانایی دڵخوازی خۆت وەدۆزی.

ڕۆژێک سوار بووم بۆ مەحاڵی شازادە بەو هیوایە کە بچمە بازاڕی شیمیتاناوا و لەوێ دەستو ناسیاوان وەبینم و قسەیان لەگەڵ بکەم. ئێوارە درەنگ گەیشتمە گوندی (قوڵەسەن). کەسم نەدەناسی. ڕووم کردە حەسارێکی گەورە یەک دوو کچ و ژن لە حەسار بوون، بانگیان کرد: میوانمان هات وەرە ولاخی لێ وەرگرە. کوڕە جحێڵێک وەدەرکەوت ئەسپی لێ وەرگرتم. ژنەکە گوتی: "فەرموو بچۆ ژووری. ئەسپەکەت تاقەت دەکا.

وەژوور کەوتم، ماڵێکی گەورە، چەند حەسیر ڕاخرا بوون. گوڕج بەڕەیەکی جوانیان هێنا ڕایانخست. ژنەکە بە گەرمی بە خێرهاتنی کردم. زۆری پێ نەچوو سۆفیەکی ڕدێن جوان هاتە ژوور بە خێرهاتنی کردم و گوتی: "کوا سەماوەر؟ میوان لە مێژە هاتووە؟".

— تازە دابەزیوە. ئێستا نان و چا حازر دەبێ. ژنەکە گوتی.

کیژێکی جوانکیلە خەریکی سەماوەر بوو جار و بار لە سیلەیەک خۆی دەردەخست. وا دیار بوو جلی جوانی لە بەردا نەبوو. چایان هێنا. ژنەکە گوتی: "ئەمڕۆ خەجالەت خۆین قەند پێمان نیە هەر شیرنیاتمان هەیە چای پێ بخۆینەوە. دا کچێ بزانە لەو ماڵە جیرانە هێندێ قەند ناهێنی".

گوتم بۆ هیچ کوێ مەچوو. منیش وەک ئێوە چا بە شیرنیات دەخۆمەوە.

پاشان نانیان هێنا. دیار بوو فڕوجیان کوشتبووە. سفرەیان دانا نانی جۆیان هەبوو. دیسان ژن وەدەنگ هات: "دا بزانە دوو سێ نانی گەنم پەیدا ناکەی. بە زیاد بێ

نانی جۆ بۆ شوربا و نابــی .

گوتم . " هیچ فەرقی نیە و نانی بچنە هیچ کوێ ، منیترومك ئیوه .

سوفی دوای ناتخواردن هیندی پرسیاری لی کردم . خەلکی کوێی ؟ دەچیە کــوێ ؟

گوتم . " دەچمە بازاری شەمیتانا وا . تەقویمیکم پێ بوو هینامە دەر و هیندی شتم لێ نوسی

لەو کاتە دا ژنەکە بە سوفی گوت . " جوانەگای شیخی قەلەو بوە . حەوتوی دا هاتوو بــوێ

دەمیم . میردەکەی دەنگی نەکرد . من پرسیم . " شیخ کوێیە ؟ . جوانەگای شیخ بــو

لێرە یە ؟ .

سوفی گوتی . " ئەوە دوو ساڵە جوانەگایەکی بۆ شیخ حەسەنی غەوساباد دیاری کــردوە

بوی دەبا . دەنگم نەکرد و لە تەقویمەکەم دەروانی . سوفی ژن گوتی . " ئەری بە قوربانت

بم دەلێی تۆ خوێندەواری ئەدی بۆ قسیکی خۆشمان بۆ ناکەی ؟

ــ قسەی چستان بۆ بکەم . پێنەوانیە لە قسەی من حالی بن .

بو بە قوربانت بم ئیمە چین ؟ .

ــ ئیوە زۆر ئینسانی باشن مالیکی چاکن بەلام زۆر دواکەوتوون . میوانتان هاتوە خەریکی

کچەکەت بنیری لە مالان قەند بینی . نانی جۆتان هەیە دەینیری نانی گەنم پەیدا بکا .

وا دیارە کچەکەت لیباسی جوانیشی نیە بۆیەعەیبە بیتە بەر چاوان . لە سەر ئەو حالــە

جوانەگای بۆ شیخ دەبەی . نازانم ئەم میللەتە کەنگی دێنە وە سەر خۆ ئاقل دەبن ؟ .

شیخ لە دینا چی بو کردوون تا لە قیامەت بتوانی هیچ بکا ؟ . بۆ جوانەگای خوت نافروشی

و لە دەرد و مەرگی خوتی خەرج کەی و بوەندالانی بەشت بەدەی . "

کورەکە بۆ هەوەل جار وەدەنگ هات وگوتی . " دایکم بۆتە دەرویش . ئەو زەمانە شیخ

هەر لە جوانەگایان دەگەرین " . سوفـی گوتی . " بابم قسەکانت زۆر هەقن . بەیانــی

جوانەگا وەپیش خۆ دەدەم بۆ بازار و بۆ مندالانی خەرج دەکەم .

ــ کاری باشت ئەوەندە یە . دەست لەو شیخ و خەلیفانە هەلبگرن . ئەورو گەلی کورد پەیوە

بەستە یەك بگری و بۆ رزگاری لە دەست ئاغا و دەرەبەگ وعەجەم و دەسبەرەکان تێ بکوشی .

زورمان قسە کرد و سوفی ژن دلی نەرم بوو . بە یانی سوفی لەگەل من جوانەگای هینا بازار

و لە دوا روژ دا بوو بە ئەندامیکی حیزبی و تیکوشەر .

## ساڵە مام وەتمانی

نوتن لە گەل برایەی مام وەتمان و حەمەدی پرسووی سوارەی کرد بوو سیە ئاشنا .
رۆژێك لە دوام هاتن و بانگیشتنیان کردم بۆ سێلە کە . سوار بووم چوومە ماڵە مام وەتمان .
لە نیزیك گوندی ئاوڵیان هەڵدا بوو خانوویان دروست دەکرد . پێشوازیەکی گەرمیان ــ
لێکردم . مام وەتمان مەنگوریکی قسە خوش و دنیا دیتوو . ماڵێکی خوش و سەر ئاواڵە .
سێ رۆژان گێریان کردم . چەندی ئەوان رایان دەگرتم، بۆ خوشم لاقی رویشتنم نە بوو .
جوانی و ئاقل و کەماڵی ئایشێ ریگای گەرانەوەی لێ بریبووم . وەزعی ئایشێ ــ م
لە ماڵە عەولای پرسووی سوار پرسیار کرد . گوتیان "زۆر کەسی هاتوونە سەر و خواز بێنی
زۆر بوون بەلام مام وەتمان بە میردی نادا ."
لەوماڵە گەورەیە ئایشێ کابان و دەستەڵاتدار و گەورەی ماڵی بوو . دەبوایە ئەو
بلێ نان وشێو حازر کەن و با چ لێ دەنێن . بە ماڵەکانی دەگوت بەرخ یا کارێلە یا مریشك
بکوژنەوە . کەس نەبوو دەستی وەبەر بێنێ . من ئەو دەم خیزانم نە مابوو. بریارم دا بەمە
ئایشێ بلێم میردم پێ بکا . رۆژێك بە تەنیا لە ئاول دریژ ببووم. بەرماڵیکیان پیەدابووم
ئایشێ هات . پێمگوت ئەگەر شووم پێ بکەی دەنێرمە سەرت .
ــ قسەکەت وە عەرزی دەکەوی . من بە میرد نادەن ".
من لە سێلە کە بووم کاك‌هەمباسێرهات ومیوانی ماڵە مام وەتمان بوو. ئاشنایەتیەکمان تازە
کردەوە . باسی ورمێ و ریگای بۆ مام وەتمان گێراوە . ئەوەندی دیکەش لە ماڵە مام وەتمان
بە ریز بووم . برایم و حەمەد بوون بە ئەندامی حیزب و لە دوا روژ دا هاوکاری باشیان
کرد . لە گەل ماڵە مام وەتمان پیوەندیمان روژ بە روژ زیتر دەبوو . هاتوچۆیان دەکرد .
رۆژێك کاك هەمباس لە سێلەکەوە لە دوای ناردم و چوومە ماڵە مام وەتمانی .
کاك‌هەمباس چاڵی دەردەهێنا و منیش لە ماڵە مام وەتمان راکشا بووم گوێم لێ بوو
یە کیك وەژوور کەوت. سلاویکی کرد و ماڵە مام وەتمانی بە ژن و پیاوە وە بە گەرمی بە خێر
هاتنیان کرد . "مەلا بەخێر بێی . دەمێکە دیار نی . نوشتووی‌گوێلکەکە کاری نە کرد .
ــ ئەم جارە نوشتەی‌چاکترتان بۆ دەنووسم . کوا دا ئایشە خانم جووتە گورەیەکی جوانم

بۆ بینە . بە خوا دەنا دەستەوانەشم نیە و لە توم دەوێ .
ـ بە خوا مەلا کوریە و دەستەوانەم نیە .
ـ چون ، من راتبەی خوم بە زور دەستینم .
لە بن پۆ پەشمینەوە چاوم لیکرد ، فەقیێ ورمێ بوو . ئەوکابرایە بوو پاسەوان بە مەستی هینا بوویانە موسافیر خانە . هەستام و باوێشکم هینا خوّ و چاویکم لە فەقی کرد . فەقی کە چاوی بە من کەوت سی هەلگرا و تیك چوو . مام وەتمان تێ گەیشت و گوتی :
ـ مەلا ئەوە لە بۆت وا لێ هات .؟
ـ هیچ چورە ئاویکم بۆ بینن .
گوتم فەقی لە کوێ دەخوێنی ؟
ـ لە قونقە لا دەخوێنم
ـ ناوت چیە ؟ لە وێنەم دەبوی . من زور دەچمە لای فەقیکانی قونقەلا .
ـ ناوم حەمەد مینە . تازە هاتوومەوە وێ
ـ کورە تۆ شەرمێ ناکەی؟ . توقەولت نەدا کە جلی مەلایان لە بەر نەکەی و دەست لەم هوقە بازیە هەلگری ؟ "
ـ کابرا تولە گەل کێیە؟ . کەی من توّم دیوە؟ . بۆ بێ حورمەتی بە مەلایان دەکەی؟ ".
ـ چون ئەوە زمانیشت دەگەری؟ . تومەلا سمایل نی ؟ . لە ورمی مەست و سەر خوش نە بووی؟ پاسەوان نەیانهینایە موسافیر خانە؟ زللەیەکم لێ نەدای؟ ئەپارایە وە و سوێندت نە خوارد کە جلی مەلایان نەکەیە بەر؟ ئیستا ناوی خوت گوریوە و دەستی ونان دەبری .
ـ قوربان بێ ئیلتیفاتی من هەمونیم .
مام وەتمان گوتی : " کورە رەبب ، بە خیرمێ . ئەو زنانەی ئیمەی رووت کردوتەوە . بە نوشتە گوریە و دەستەوانەی بێ نە هیشتوون ." لەو قسانە دابووین کاك هەمباس هاتەوە . کە چاوی بە مەلا کەوت هەر واقی ورما و گوتی : " حەی خوّ ئەوە مەلاکەی ورمیە ".
گوتم کاك هەمباس تو شاهیدی لە ورمی چون بوو . ئیستا سەگبابجاشا دەکا .
ـ ئەو جارێ بە بەخشن . تازە لەم ولاتە ناهینم . توبە دەکەم .
ـ هەستە برو شەرم بکە . لەم ناوچەیە نەمینی . مەلا روێ . بەلام ئاپشە گولیشیان نەدا بە من .

## دیسان تەوریز

لە پایزدا عومەری کەریماغا داوای لی کردم کە بچم لە تەوریز ماشینی بۆ تعمیر بکەم. لە بەر هوی زوری سیاسی وغەیرە سیاسی و دوستایەتی لە گەل عومەرئاغا، کاریکی بە منیان هەبا دەمکرد. چووم تەوریز و ماشینم دا بە سەرویس و خوم لە موسافیرخانەی کەهلان بوم. لەوکاتە دا قادرئاغای بابی جەعفەرئاغا هاتبوە تەوریز و ئەویش لە هەمان موسافیرخانە دەژیا. یەك دوو جار کاری پێ ئەسپاردم دەنگم نە کرد. روژیك بەیانی وەدەر دەکەوتم شوفیرەکەی هات گوتی قادرئاغا بانگت دەکا. کە چووم گوتی: " ئەو بخچەم بۆ هەلگرە دەچمە حەمام. ئیتر چاوم عەمرزی نە دیت. گوتم: " قادرئاغا بو پیت وایە من قادر سەر روتم خەلات و بەرات وەرگرم؟، ( قادر سەر روت نوکەریکی مالە کەریماغا بوو) من بو چی تا بم بوخچە بو کەس هەلگرم. لەمڕۆوە هەقت نیە هیچ کاریك بەمن بکەی". وەدەرکەوتم لوریەکە چا کراوە و چووسەوە قونقەلا. بە عومەرم گوت: " لە مەودوا لە دوای من مەنیرە من بۆ نوکەری نایم. ئیجارەی خوم دەدەم و بیگار ناکەم".

پایز و زستانی ١٣٢٩ (١٩٥٠) لە مالی بووم و لە گوندەکانی دەوروبەر زوربەی لاوەکان و ئیفسانە باشەکانم بۆ نیو حیزب راکیشابوون. لە گەل فەقیکانی خەلیفەلیان و قونقەلا نیکەلاویم زور بوو زوریان ببوونە حیزبی. لە عیراقەوە جار وبار وردە کتیبی کوردیان بو دەنارد م. جاریك (قصیدەی مەولا یە صەلی) یان بو نارد بووم کە کرا بو بە کوردی. دابووم بە فەقیکانی قونقەلا. روژیك مالە دوستیکی من لە قونقەلا مەولودیان دەکرد. منیش بانگ کرا بووم. فەقیکانم فیر کرد کە لە جیاتی ( مەولا یە صلی وسلیم) تیکرا کوردیەکە ( بریژە رەحمەت خودا بە دایمی تا ئە بەد ـــ بو سەر خوشە ویستە کەت چاترینی خەلقە بە جەم ) بخوێننەوە. مەولود نامە دەست پیکرا و کە یشتە ئەم شیعرە و فەقی تیکرا بە کوردی دەستیان پێ کرد. مەلاسادقی رەحمەتی قوت بوو گوتی:

" میرزا کەریم ئەوە شت سازکرد؟".

ـ ماموستا بو من سازم کردوە. شتیکی زور جوانە و خو پێ شەرعی نیە".

ـ نا هەر دە لیم ئەوەست سازکرد؟.

## وه دەر نان لـــه گـونـد ى

ئەو سێ ساله له مه هلیان هەر چەند به ئێود وكاندار بووم به لام له راستی دا بیگارچی قادرئاغا بابی جەعفەر ئاغا بووم . پایزێ كه جەعفەرئاغا ئازاد كرا ژنیان بـو عومەری برای دەگوێزتەوە له كەل كاكه سواری جەلەیان ژن به ژنەیان كرد بـوو. بـۆ سەر داوەت له زوربەی خەلكی مەمەلیانیان گێرا بـوو به لام تازە كاریان پێم نه ما بـوو منیان وه پاشگوێ خستبوو. دیارە هیندێ هوێ دیكەش هەبوون كه منیان بانگ نەكرد بـو.

بیستروژی مابوو بۆ نەوروز كوێخا هات و گوتی : " قادرئاغا گوتوویه دەبـێ ما لـی بروا و راپێناگرم " .

گوتم هەتا نەوروز ئیجارەم داوه و نەوروزیش دەروم . چوومه مەهاباد و لەگەل برادەران باسم كرد . هاتینه سەر ئەوباوەرە كه مالم بچێته شار . بەلام چونی شار دژاو ودەسەلاتەی دەویست . له مەهاباد چوومە لای قادرئاغا له مالی حاجی بایز بوو. گوتم : " كوێخا ت راسپاردوه كه بار بكەم و بروم . پاداشی ئەو هەموو خزمەت و هاتوو چوی نەوریز دەبوایه هەر وابێ . هەتا نەوروز له وێ دەبم و نەوروزیش دەروم . گوتی : " من نەم ناردوه . جەعفەر ناردوویه . تۆ ناوی كومونیستیت له سەره .جەعفەریش تازە بەر بـوه .دەترسی تووشی بكەنەوه . " .

گەرامەوه به بابم گوت له شار خانوییك پەیدا دەكەم و دەمچینه شار . دایك و بابم زور نارەحەت بوون . گوتیان هیچمان نیه و له شار ناحاوێنەوه . بەلكوو له گوند یكی تـر جێگا بەدوزینەوه و هەر چونێك بێ له گوندی ژیان هاسانتره . سوار بووم نێزیكەی دەرۆژ له شار وێران و سندوس و لاجان گەرام له هیچ كوێرایان نەگرتم .

كاك سەید عەلی حاجی كاكه مین كه هەوەلین كەس بوو له سندوس بو زیندوو كردنەوەی رێكخراوەكانی حیزبی و دامەزرانی كومەلی لاوانی لادێ هاتبوه سەیدان و بـه گەرمی تێدەكوشا ، دانگ و نیوێكی گوندی ( ئالیاوێ) سندوسی به ئیجارە گـرتـبوو.

گوتی : " مالەكەت بار كه وەرە ئێره . وەتاغێكم هەیه ئێوه لەوێ دابن و ئێمەش له نێو مال

دادەزێن. هەرچی هەمانە پێکەوە دەیخۆین. کەس لە برسان نەمردووە. خانوویەکی چوولیش هەیە ئەگەر پێتان باشبوو خاوێنی دەکەینەوە و بچنە ناوی."

چاری دیکەم نەبوو. گەڕامەوە لە گوندی نیزامابات؛ سێ وشترم بە کرێ گرتن و چوومەوە مەملیان. گەیشتمە نێوگوندی، کاکە مینەی عەلیئاغا بانگی کردم گوتی: "لادە بۆ ئێرە". کە دابەزیم دایک و بابم لەوێ بوون. پاش ڕۆیشتنی من پازدە ڕۆژێ ما بوو بۆ نەورۆز جە عەمرئاغا پیاوی ناردبوون و سیپال وشرە و برەیان لە خانوو وەدەر نابوو. کاکە مینە شتەکانی بردبووە ماڵی خۆیان و دایک و بابو خوشکیشم هەر لە ماڵی ئەوان ژیابوون. دایک و بابم زۆر نارەحەت بوون. دڵخۆشیم دانەوە و گوتم: "تازە چارە نییە لەوە باشتر نابێ. ئەو تاوان و جنایەتە پتر لەم ڕێگایە دا سوورترم دەکا. شەرت بێ تا مردن دژی ئەم نیزامە و سیستمی دەرەبەگایەتی دەست لە خەبات هەڵنەگرم.

وشترەکان گەیشتنێ. خەڵکی مەملیان کۆ ببوونەوە. زۆریان دەگریان. برادەرانی حیزبی پارەیان کۆ کردبووەوە و کرێی وشترەکانیان دابوو. یەک دوو برادەری خەلیفەلیان و قەرەقەساب هاتبوون و هاودەردی خۆیان نیشان دەدا. دوو وڵاخیان هێنا بۆ دایک و بابم سوار بوون. بڕێکم قسە بۆ خەڵک کرد و گوتم: "کارێکی واتان کرد، تازە قەت دەست لە خەباتی دژی دەرەبەگایەتی و ڕژیمی دیکتاتۆری هەڵنەگرم. ماڵاوایی مان لە خەڵک کرد بەڵام بارکردنەکەم وەک خۆپیشاندانێ دژی ئاغای لێ هاتبوو.

ئێوارەیەکی درەنگ گەیشتینە مەملیان. لە ماڵە کاک سەید عەلی بارگە و بنەمان بە عەرزی دادا. سبەی برادەران هاتن خانووە چوولەکەیان خاوێن کردەوە و چووینە خانوو. وەزعێکی ناخۆش دیسان لە بەر نارەحەتی دایک و بابم سەرم هەڵنە دەهات.

لەم حاڵە دا عەلی قەرەنیاغا پیاوی ناردە کن سەید عەلی کە نابێ کەریمی حسامی ڕابگری. سەید عەلی بە کابرای گوت: "ساڵ و نیوێک ئیجارەم ماوە. هەتا ئیجارە تەواو دەبێ، ملکی خۆمە و خانووی خۆم داوەتێ. پاش تەواو بوونی ئیجارە پێکەوە دەڕۆین.

ڕۆژێک چوومە نەغەدە بزانم خانوویەک کارێک پەیدا بکەم. گەیشتمە نێو شار و ژاندارم بردیانم بۆ ئیدارە. سەرگورد ئەحراری فەرماندەی ژاندارمەی نەغەدە بانگی کردم و گوتی: "حسامی ڕاپۆرتی زۆر لە تۆ دراون. لە چی دەگەڕێی؟."

— ئێستا ئاغا لە گوند دەریان کردووم. ئێوەش ناهێڵن لە ئێران دا بگەڕێم. قانوونی داد پەروەری ڕژیم ئەوەیە. هاتووم خانوویەک پەیدا بکەم و بێمە ئێرە. لێتان نێزیک

دەبم . ". گوتی : " بۆ خۆت کاسبی بکەی باشترە . ئێمە ئاگامان لە هەموو شت هەیە . "

هاتمە دەر و چوومە دوکانی کاک سەعیدی قەصاب . کاک سەعید یەکێک لە تێکۆشەرانی کۆمەڵەی ژ.ک . بوو . هاتبوو لە نەغەدە دوکانی دانا بوو . پاش بەخێر هاتن و باسی خەبات و تێکۆشان بۆم گێڕاوە کە دەریان کردووم و ماڵەکەم هێناوەتە ئالیاوی . بەڵام لە وێ ناحاویمەوە . کاک سەعید گوتی : " ٣٠ بارم جۆ کڕیوە لە گوندی دەورگە لە چال-دایە . ماشێنێک بگرە بچۆ باری بکە و لە تەورێز بیفرۆشە و بیکە دەسمایە و وەرە خانوێک پەیدا دەکەین و لێی دائەنیشە " .

ــ زۆر سوپاست دەکەم . یارمەتیەکی گەورەیە . دەچمەوە هەر دوو ڕۆژی تر دێم و دەچم باری دەکەم . "

ــ ئەو شەو ناچیەوە . لێرە دادەنیشین و بریک قسە دەکەین . برادەری دیکەش دێن . پاشان ئەحمەد حەلەب و یەک دوو برادەری دیکە هاتن وگوتیان با بچین بۆ قەراخ چۆم . دوکانیان داخست و بە قسە کردن بۆ سەر ... دەرویشتین کە پشتینە پێش گاراژ فەرماندەی ژاندارمە و بەخشدار و سەرۆکی ئیدارەی سەحیەت و ئیدارەی دارایی . راوەستا بوون قسەیان دەکرد . گەیشتینە حاستی ئەوان و تووشی سەید مستەفای کوڕی حاجی سەیدی تازە قەلا بووین کە کامیشێکی لە جیاتی ٢٥٠ تمەن لە بابم ئەستاند بوو . بە حیسابی خۆی ٢٥٠ تمەنی پێ قەرزدار مابووم . سەید مستەفا پێ ئەوە کە ماندوو نە بوونیم لێ بکا و یا سلاو بکا بە توندی رووی لە من کرد وگوتی :

ــ ئەری ئەو قەرزەمان بۆ نادەیەوە . بە تەمای چی ؟

ــ بە تەمای هیچ نیم . ئەوە کاک سەعید ماشێنێکی جۆ داوی دەیبەم لە تەورێز دەیفرۆشم و ئەو دەم حیسابی دەکەین .

بە دەنگێکی بەرز نەراندی بۆ ئەوە فەرماندەی ژاندارمە گوێی لێ بێ گوتی :

ــ نا وەڵا وانیە . کۆموونیستی کۆمونیست بویە نایدەیەوە " . کە وای گوت ئاگرم گرت ، غارم دایە شەقیکم لە گوندێنی دا وگوتم : " قاحبە باب ئەگەر من کۆمونیست بم سەگبابی وەک تو چۆن دەتوانی داوای قەرزم لێ بکا . ؟

هاواری کرد چۆن لێشم دەدەی ؟

ــ بەڵێ لێشت دەدەم و داوای پۆلیس بکەی خەرابت پێ دەکەم . ئەحمەد حەلەب و کاک سەعید توند بە سەر سەید دا هاتن وگوتیان .

ـ شەرمی ناکەی؟ . قەرزچی بە سەر سیاسەتەوە . نازانی ئەوەتامە رگوردو بەخشدار لێرە راوەستاون؟ .

من بیدەنگ ئەبووم جنێوم پێ دا و سەرکورد ئەحراری هاتە پیش و گوتی : "ئەوە چیە ؟ . بۆ ئیوە عەیبە شەر دەکەن".

سەید گوتی : "جەنابی سەرکورد کومونیستە قەرزم نادا تەوە".

سەرکورد توڕە بوو . گوتی : "برۆ نا سەید . تۆ داوای قەرزدەکەی یا دەولەتی حیسابی کومونیستی لێ دەکیشی ؟ . برو بێ شەرەف شەرم بکە".

سەید سەری شوڕ کرد و رویشت. ئیستاش داوای قەرزی نەکردەوە .

چەند روژیك لە ئالیاوی بووین بابم زور نارەحەت بوو . بە تایبەت لەوەدە ترسا کە شەو بێنە سەرم و بمکوژن . روژێك خالم هات و گوتی مالم لە گوندی ( قەزەناوی ) یە . مەلای نیە . گوندیکی خوشە . با باوکت بێتە وێ و بیێتە مەلا . من گوتم تازە ناچمەوە دێهات . بابم پێ ی خوش بوو . لە گەل خالم چوە قەزەناوی . پاش دوو روژ چەند ولاخیکیان هینا و دایك و بابم چونە قەزەناوی و زولم و ستەمی دەرەبەگان لیکی جیا کردینەوە .

لە نەغەدە لە حەساری وەستا رەحمانی داتاش . چاوە خانوییکم بە ١٣ تمەن بە ئیجارە گرت و لە گەل خوشکم و ئاموزایەکی دەوازدە سالم چومە نەغەدە . بارگینەکەم فروشت و بیکار مامەوە . لە نەغەدە هەوەلین کار کومیتەی ناوچەی حیزبمان لە حەوت ئەندام دامەزراند . لە لاجان و شنو مەسئولەکانی حیزبم دیاری کرد و کاری حیزب وتیکوشان کەوتە سەر بار و بە ریك و پیکی دەچوە پیش .

بەهاری سالی ١٣٣٠ ( ١٩٥١ ) بیجگە لە ژاندارم پولە سەربازیکیش بە ناوی ـ ئینتیزامات بە سەروکایەتی سەرهەنگ شکوهی هاتە نەغەدە . سەرهەنگی شاهەنشاهی ئەرکی خەباتی دژی کومونیستی پێ ئەسپیرا بوو . بەرتیل خوّر ریك بوو تەمەنیکیشی وەر دەگرت . ئاگام لێ بوو چەند سەرباز هەمیشە لە دەور وبەری خانوەکەم بە دەوام دا دەگەران . هێندی کتیبی سیاسی سیان بونارد بووین . لە شانەکان دەبوایە باسی سیاسی بکری و ( ئوسولی تەشکیلاتی ) بە دەرس بگوترێتەوە . من کتیبی ( پولا چون ئاوە سوو بوو) لە گەل ( ئیتاعەتی کویر کویرانە ) نوسینی خوسرەوی روزبە م بوهاتبوون دەم خویندنەوە . نەم دەوێرا لە ژوورەکەی خوم بخوێنمەوە . جاری وابوو لە پر ژاندارمیك وە ژوور دەکەوت . پیّم دەگوت لە چی دەگەرێی ؟ . ببەخشە . نەم زانی .

وەستا رەحمان کادێنیکی هەبوو روناك بوو. ئیوە رویان دەچووە کادێنەکە و تەیر کتێیم دەخویندەوە . جاری وابوو سەربازی سەرهەنگ شکوهی دە هاتە مالێ . بە خوشکم گوتبوو ئەگەر هاتن بلێ شەویش نەهاتوتەوە . سەربازگیژ دەبوون . دە سورانەوە . بێیان وابوو خەریکی چیم و بۆ بزر بووم . بو ئەوە لە بیکاری و ژێر چاوەدیری ژاندرم و سەرباز رزگار بم چوم لە کاراژی ( هەمزەلی ) قەرە پەپاخ بووم بە نوسەری کاراژ مانگـــی بە سەت تمـەن . لە کاراژ هەم یاریدەی خەلکم دەدا و هەم کاری سیاسیم باشتر بـــو بە رێوە دەچوو. زور جار بێ پول برادەرانم بو ئەم لاو لا دە نارد . پاش مانگیك دیتم ناتوانم لە و مەکوی زولم وزوردا اری دا کار بکەم . هە مزەلی کابرایەکی بێ حەیاو دڕ و ساختەچی بوو. دار و دەستەکەی لەو بێ حەیا تر بوون . پولی زیادیان دەستاند قسە یان بە خەلك دەگوت . جنێویان پێ دەدان . زور جار وەدەنگ دەهاتم . روژیك کوردیکی فەقیر دەچوە ورمێ . جیگای گرتبوو دانیشتبوو. عەجەمیك هات ناوی نوسی و بە هەمزەلی گوت لە کوێ دانیشم ؟ . ئەویش چوو کوردەکەی هەستاند وجیگاکەی دا بە کابرای عەجەم . کوردەکە هەلنەدەستا . دەیگوت دانیشتووم و جیگای خـۆمە . ئیتر هەمزەلی دایگرایە . خوم بێ رانەگیرا . چووم گوتم بۆ لە و کابرایە دەدەی ؟ . شەرمی بکە . من جیگام داوەتێ . لیمان بوو بە کیشە و ئیتر کاراژم بە جێ هێشت .

## هـەوالدەری روژنامە و شەلگیری تێکوشان

مانگی جوزەردان بۆ کوبوونەوەیەکی حیزبی چووە مەهاباد . پاش لێك دانەوە لـە گەل برادەران/ هاتینە سەر ئەو باوەرە بو ئەوە کە ژاندارم و سەرباز تۆزی لێم بپرینگینەوە کارتێکی هەوالدەری روژنامە پەیدا بکەم . ئەودەم روژنامـەیەك بە ناوی ( کارزار ) لـە تاران دەر دەچوو. مودیرەکەی وادیار بوو پشتی بە دەربار و پولیس قایم بوو . کابرا یەکی دڕ و بێ حەیا و شەرلاتان . دژی مەئمورەکان دەینووسی و بە گژ هەموو کەرەدا دەهات عەزیزی لوتفی لە مەهاباد بە پیاوی حکومەت ناسرا بوو نوینەی روژنامە و گوارەکانی تاران بـــوو. گوتیان بچو لای عەزیزی لوتفی و بلێ لە نەغەدە دەبمە نوینەری روژنامە و لە گەلــی رێك کەوە . چووە کن ئاغای لوتفی و پاش سلاو گوتم روژنامەی کارزارم بۆ بنێرە دەیفروشم

ئەگەر بە ڕۆژنامەکەم بناسێنێ خەبەری ناوچەشی بۆ دەنێرم . زۆری پێ خۆشبوو. داوای ئادرەسی کرد . گوتم : " نەغەدە شارێکی پچووکە ناوی من بنووسی پێم دەگات .

عەزیزی لوتفی چەند حەوتوو ڕۆژنامەی بۆ ناردم. پاشان ڕاستەوخۆ نامەم نووسی بۆ مودیری ڕۆژنامە. زۆری پێ نەچوو کارتی هەواڵدەری ڕۆژنامەی بۆ ناردم. لە ڕۆژنامە نیزا نووسی کە فلانکەس لە سنەو ورمێ و شنۆ هەواڵدەری ئێمە یە .

هەر چەند ئەوکارە زیان و بە ڕێچوونی تێدا نەبوو بەڵام ژاندارم و سەربازم لێ دەپرینگانەوە . لەو کاتەدا نەغەوشێکیان لە لاجانەوە هێنا بوە شێرو خورشید . لە وێ ڕاپان نەگرتبوو کابرا مرد بوو. بۆ ڕۆژنامەم نووسی . کارزار خەبەرەکەی بڵاوکرد بووەو داوای کرد بوو کە سەروکی شێرو خورشید ئەشی دادا اگاپی بکرێ. پاش بڵاو بوونەوەی خەبەر سەروکی شێر و خورشید پان بردە ورمێ . ئەویش دەستی فەرماندەی ژاندارمە بوو. سەرگورد ئەحراری لە داوای ناردم و گوتی : " تو هەقت نیە ئەوخەبەرانە بنووسی . ئەگەر وەدڕۆی نە خەیەوە زیندانیت دەکەم. هاتمە دەر و بە تێلگراف شکایەتم لە ژاندارمە کرد . بۆ ڕۆژنامەم نووسی . پاش دوو ڕۆژ مودیری کارزار تێلگرافی بۆ فەرماندەی ژاندا رمە کرد بوو ڕوونووسیشی بۆ من نارد بوو. لە ڕۆژنامە دا نووسیبوی سەرگورد ئەحراری لە نەغەدە ئیجازە نادا دەنگو باسی ناوچە بۆ ڕۆژنامە بنووسری. هەرشەی لە هەواڵێری ئێمە کردوە . داوای کرد بوو کە لە نەغەدە لابیری و سزای بدری .

پاش نووسینی کارزار فەرماندەی ژاندارمەیان هەڵپێچا . دەهاتە لای من و دەپارا وە کە لێی خۆشبم . ئاخرەکەی چل تمەنی داسێ تا نوسیم کە چاو پۆشیم لێ کرد .

ئەم شکایەت و ڕوودا وە بوو بە هۆی ئەوە کە ئیدارەکان کلکە سووتەم لە بەر بکەن . ڕۆژنامەم بۆ ئیدارەکان دەنارد و سەری مانگ پولەکەیان بە زیادی دە هێنا . پاشان گۆواری ئومێدی ئیران، کاویان ، تەرەقی ، ئیتلاعاتی حەفتەیسەم بۆ دەهات . گۆواری کاویان و ئومێدی ئیرانیش کارتی هەواڵدەری یان بۆ ناردم. لە پەنا ئەوان دا ڕۆژنامەکانی حیزبی تودە ( بە سوی ئاینده، شەهباز ،چەلەنگەر) م بۆ دەهات و بڵاوم دە کردنەوە .

دووەند الی هەشت نو سالە ( محە ممەدی مجرومی و سەعید پێشنوماز) ڕۆژنامەیان لە بازار دە گێرا و دەیانفرۆشت . ئەم جار مەسەلەی جێگا بیوە کوسپ . دوکان نەبوو کە بیگرم . ئاشناپەکی بابم هەبوو بەناوی مەحموود خالە. دوکانێکی هەبوو وینجەی لێ دەفرۆشت . پێیش دوکانەکەی هەمیوان بوو . گوتی وەرە میز و کورسی لێ دابنێ و کاری

خوتی لێ بکە . ڕۆژنامەکانم لەوێ دادەنا . برادەران دەهاتن لەوێ کۆدەبوونەوە . پەیوەندیی گوندەکان . پەیوەندیی لە گەڵ کومیتەکانی حیزبی لە دەوری ئەو میزە جێ بە جێ دەکران . ئاغاکانی ناوچە تێکڕا بیبوونە ئابونە و ڕۆژنامەم بۆ دەناردن . بە تایبەت گشت ڕۆژنامەکانی چەپم بۆ ئاغاکانی ناوچە دەنارد و پولەکەم لێ دەستاندن . گوندییەکان شکایەت و سکاڵای خۆیان دەهێنا لای من و ڕێنوێنیم دەکردن .

ڕێکخراوی حیزب لە نەغەدە یەکێك لە ڕێکخراوە هەرە چالاکەکانی کوردستان بوو . کەم گوندی سندوس و شنۆ هەبوو کە شانەو ئەفرادی حیزبی تێدا نەبن . ڕاستە لە نێو خەڵك تێکۆشان بە ناوی حیزبی دیموکرات بوو . بەڵام هیچ بەرنامە و سیاسەتێکی نەتەوایە تی و کوردستانیمان نەبوو . دەستورات و ئەوامری حیزبی تودە دەهاتن و بە گوێرەی ئەوان تێکۆشان بەڕێوە دەچوو . دیارە ئەودەم بۆ زەحمەتکێشانی کوردستان مەسەلەی خەباتی دژی دەرەبەگایەتی و زوڵم و زۆری ئاغاکان لە هەموو شت گرنگتر بوو . هێندی مامو ستای ئازربایجانی خەڵکی ورمێ لە نەغەدە دەرسیان دەگوت . ئەوان لە کۆبوونەوە و شانەکانی ئێمەدا بەشدار دەبوون .

پوشپەڕی ئەم ساڵە بۆ هەوەڵ جار ناردیانم بۆ تاران . لە تاران لە گەڵ هاوڕێی سادق وەزیری کە ئەودەم لە گەڵ کومیتەی مەهاباد پەیوەندیی هەبوو بوومە ئاشنا . سادق وەزیری لە ڕۆژنامەی شاباز کاری دەکرد و یەکێك لە بەڕێوەبەرانی «کۆمەڵی میللی خەبات دژی ئیستیعمار» بوو . چەند ڕۆژ هاتوو چووی ڕۆژنامەکانی بەسوی ئایندە و شاباز و چەلە نگەرم دەکرد . چوومە لای مودیری کارزار و مودیری گۆواری ئومێدی ئێران و کاویان و هەتە ڕۆژێك بۆنان خواردن چووینەوە ماڵە ئاغای سادق وەزیری . یەکێك لە بەرپرسەکانی حیزبی تودە هات کە پاشان بۆم دەرکەوت ( هوشمەندی ڕاد ) بوو . لە سەر وەزعی کورد-ستان و شێوەی خەبات و چۆنیەتی تێکۆشان گەلێکمان قسە کرد . پاش هەشت ڕۆژ- سارم خان پێی گوتم بۆیە هاتبووی کە چەند مانگ لێرە بمێنیەوە و لە کلاسی کادری سیاسی دا بەشدار بی . بەڵام ئێستا بوونت لە کوردستان پێویستترە . ناچار گەڕامەوە بۆ وڵات .

هاتنە سەر کاری حکومەتی دوکتور مصدق تا ڕادەیەکی زۆر دەرەتانی بوتێکۆشانی سیاسی پێك هێنا . کاتێك قونسولخانەی ئینگلیز لە خوزستان بەسترا و ئاڵای ئێران لە ساختومانی شیرکەتی نەوت هەڵکرا لە سەرانسەری ئێران تێلگرافی پشتیوانی بۆ مصدق لێ دەدرا . منیش لە نەغەدە تێلگرافێکی پشتیوانی و پیرۆزبایی م بۆ دوکتور مصدق نارد

رادیو تاران تیلگرافەکەی خوێندەوە و دوکتور مصدقیش بە تیلگراف جوابی دابـووەوە و
سوپاسی کرد بوو . پارچەوەیەك لە مەهاباد نامەیەکم بۆ هات نووسرا بوو برادەرانی سەرو
( دەبارە مەبەست حیزبی تودە بوو) لە تیلگرافی پیروز بایی تۆ رەخنەیان گرتوە . ئەوان ــ
دەلێن :حساسی کەسێکی ناسراوە . تیلگرافی پشتیوانی ئەو دەبێتە هوی ئەوە کە خەلك
حکومەتی مصدقیان پێ باش بێ . هەر ئەم بیرورایە و گەلێك نمونەی دیکەش سیاسەتی
چەپرەوی حیزبی تودەی لە حاست مصدق نیشان دەدا . کە پاشان دەرنگ خۆشیان لــە و
بارەوە رەخنەیان لە خۆ گرت . بەلام رەخنەی هیندێ حیزبی سیاسی وەك نوشدارووی پاش
مەرگی زووابە .

## جنایـەتـی دەرەبـەگـی ماسـەتی

روژێك کابرایەکی فەقیری خەلکی ( کێلی بەلەبان) هات و دەپاراوە .
ــ چی بە چیبیت لێ قەوماوە ؟ .
ــ جا چیم لێ بقەوڵمێ ؟، کاك سمایلی ئاغای کێلی بە زوری دەست دەریژی بو کچەکەم کردوە
لە خانی شکایەتمان کردوە . کاك سمایلیان بردە خانی بەلام هەر ئەوی روژی هاتــەوە .
پەنام بۆ تۆ هیناوە . بۆ روژنامەم نووسی کە سەرگورد هاشمی مەرزەبانی خانی ئاغای تا
تاوانباری بەرەلا کردوە کەس نیە بە دەرد و سکالای گوندیەکان رابگا .
روژنامە خەبەرەکەی نووسی . مەسەلە بڵاو بووە . کاك سمایلیان راکێشا بو نەغەدە و بــو
ورمــێ . سەرگورد هاشمی دەهات و دەپاراوە . دەیگوت چەندی بلێی دەت دەمــێ
شتێك بنووسە و ئەم خەبەرە وەدرۆخەوە . گوتم . " تا خوێنی کچەکە نەستێنی و بابــی
رازی نەکەن دەست هەلناگرم . هاتوو چوەکی زوریان بە کاك سمایل و سەرگورد هاشمی
کرد . ئاخرەکەی پولێکی چاکیان دا بە کابرا و رازی یان کرد و نەجاتیان بوو .
دەرەبەگەکانی ماسەتی لەو مەسەلەیە زور تورە بوون . روژێك لە مەهاباد لە حوجرەی میرزا
حوسێنی داوودی دانیشتبووم عەلی قەرەنیاغا و چەند ئاغای دیکەی ماسەتی وەژوور کەوتن .
عەلیاغا رووی لە من کرد و گوتی . " تۆ بۆ دەمو ئاغایانەت هەلپێچاوە ؟ . تۆئەگەر وابکەی
ناتوانی لە نەغەدە دابنیشی ".
ــ ئەگەر ئاغا دەست لە زولم و جنایەت هەلبگرن کەس کاری بەوان نەداوە . منیش بویە لــە
نەغەدە دانیشتووم کەس بە ئاغا نازانم .

ئەم رووداوانە دەبوونە هوی ئەوە کە خەلك پتر روو لە حیزبیکەن و بە پشتیوانی خۆ یانی بزانن . روژیك لە نەغدە لە دوکانی کاك سەعدە دانیشتبووم . کابرایەکی گوندی کورد بە بازاردا دەهات . عەجەمیکی دوکاندار پێشی بە کابرا گرت و داوای قەرزی لێ کرد . کابرا گوتی ئیستا نیمە . بازاریکی دیکە بوّت دیّنم . کابرا دەستی لی هەلنەدەگرت. لەو کاتەدا ئاجودانی ژاندارمەری نەغدە بەویّدا دەهات . دوکاندار بە ئاجودانی گوت:
ئەوکوردە قەرزم ناداتەوە . ئاجودان بە کابرای گوت بۆ پولەکەی نادەیەوە؟ .
ـ ئیستا نیمە . پێی دێنم خۆحاشای لی ناکەم . ئاجودان تا هیزی تیدا بوو زللەیەکی لە کابرا دا . من وەدەرکەوتم و بە گژیدا چووم . گوتم : " بێ شەرەف بۆ لەو فەقیرە دەدەی چی کردوە؟. ویستی چەقە بکا زللەیەکم لێ دا و گوتم ئیستا بو روژنامەکان دەنووسم . رویشتم بوتیلگرافخانە . ئاجودان یەقەی کاك سەعدەی گرت و وەداوم کەوت و دەپارایەوە . بە تکای برادەران ئاجودان نەجاتی بوو .

## سەید عەولای کەمالی و دوکانداری

کابرایەکی خەلکی کوردستانی عیراق بە ناوی سەید عەولای کەمالی لە سەردەمی کوماری مەهاباددا هاتبوە نەغدە . لە عیراق جولەکەیەکی کوشتبوو ، داویکی زوری جولەکەی هینا بوو، عەمرێکی زوری کریبوو، خانوو دوکانی لێ دروست کرد بوون و کچیکی کاخدری سەروکانی خواستبوو، دوکانیکی بەزازی دانابوو دەستی کرد بوو بە گوێ بری و سوت وسەلەم . پارچە و قوماشی بە قەرزدەدا بە خەلك قەرزەکەی لێ دەکردنە سەلەمی گەنم بە وەعدەی سەر خەرمانان . باری گەنمی لە ئاغایەکی بەرد کەمران بە چوار تمەن سەلەم کرد بوو لەسەر خەرمان باری گەنم ببوە چل تمەن . ئەوەندەی خوێنی خەلك مژتبوو، زور لە ئاغاکانی پیران وماملەمیش قەرزەکەیان نەدەداوە .
روژیك ناردبووی کە بۆ فراوین بچمە مالی ئەو . پێم سەیر بوو . چووم . پاش نان و چا گوتی : " پێم خوشە تۆبیکار بی . داویکی زورم هەیە دوکانیکی گەورە و پری عەتتاری و بەقالیت بۆ دادەنیم . دەزانم پاشکار دەکا و کریارت زور دەبن . سەرمایەی من و قازانجیش بە شەریکی . خۆت هاتووچۆی تەوریز بکە و سەودا و مامڵەی خۆت بە ریوە بەرە .
دیارە سەید ئەوەندە پیاو نەبوو کە بو من دلسوز بی . بەلام ویستبووی قەرزەکان

بـه من كو بكاتەوە . چونكە نەياندەداوە .

من بۆ ئەوە كە بيكار نەبم، لە خولام دەويست كاريكى وام بۆ هەلكەوى . گوتم زور باشە ئامادەم. گوتى : "جا كەوايە با سەفەريكى لاجان بكەين هيندەى قەرزكوكەينەوە و پاشان دەچينەتەوريز و ئەشياى دوكان بكرە . چونە لاجان وبەرىپيرانان . هەرجىيەك دەچووين دەيانگوت : "تۆى لە گەڵ نەمى، هيچى نادەينى . نازانى چون دەستى بريوين و مال ويرانى كردووين ".

هەر چونيك بوو نيزيكەى چل بار گەنمى كۆ كردەوە و بارمان كرد بۆ تەوريز و لەوێ بايى چوار هەزار تمەن ئەشياى دوكانمان كرى. لە نەغەدە دوكانيكى باشم كردەوە. كريار زور بوون و سەروكى ئيدارەكان بەگشتى بوونە كرياری دوكان. بيجگە لەوە دوكان بوو بە جيگاى روژنامە فروشى و كوبوونەوەى حيزبى قەلەمندارەى برادەران و شوينى پيوەندييەكانى حيزبى .

لەم ماوەيەدا دايك و بابم لە ئيمە دوور بوون و جيژنى قوربان ولاخيكى سواريم لە ئاغا مەجيد وەرگرت و چووم سەرەدان و هيندەى شتومەكى پيويستم بو بردن .

## هەلبژاردنى پارلمان

سەرماوەزى ١٣٣٠ (١٩٥١) مەسەلەى هەلبژاردنى پارلمان هاتە گورى . هاورێ صارم الدين صادق وەزيرى بو نوينەرى مەهاباد دەستنيشان كرا . بيجگە لە صادق وەزيرى دوكتور محمد صمدى موكرى وجەعفر خانى حەمەد مرىو پاشاخانى ئاختەمولەى لە مەهاباد خويان دەستنيشان كرد بوو. حكومەتى موصەدق رايگەياند بوو كە هەلبژاردن ئازادە . كوميتەى چاوەديرى بە سەر هەلبژاردندا لە تاران و لە شارەكا ييك هاتبوو.

تيكوشانيكى توند بۆ بەشدارى لە هەلبژاردندا و دەنگ دان بۆ صادق وەزيرى لە لايەن ريكخراوەكانى حيزبيەوە دەست پيكرا . چەند روژ پيش هەلبژاردن هاورى صادق وەزيرى هاتە مەهاباد . دژيانى لە شكرى مەهاباد لە دەروازەى شار صادق وەزيرى دابەزاند كە چەمەدانەكانى بپشكنى . صادق وەزيرى زور پەهلەوانە و ئازايانە لـــە

بەرامبەر ئەفسەری دژیان راوەستا وگوتی . " تۆناتوانی چەمەدانی مـن بپشکنی . من قازی عـەدلیەم و لیّرە داد سەرا و داد ستانی هـەیە و تا نوێنەری دادستان نەیە ناتوانی چاو لە چەمەدانی من بکەی . تائەم رۆژە لە مەهاباد کەس بەم جۆرە لە بەرامبەر دژبانـی لەشکر رانەوەستا بوو . کوردستان بە تەواوی لە ژێر دەستی لەشکر دابوو. ئەرتەش دەستەلاتـی هەمووشتێکی هـەبوو . وەك ولاتـی داگیر کراو چاویان لە کوردستان دەکرد . راوەستانی صادق وەزیری لە بەرامبەر دژبان دا خەلکی وریا کردەوە .نوێنەری دادستان هاتە دەروازە وصادق وەزیری بە سەر کوتنەوە لە نێو پێشوازی گەرمـی خەلك دا هاتە نێو شار و لە مالە حاجی سالحی خەرازی میوان بوو.

پاش هاتنی صادق وەزیری لە مـەهاباد کومیتەی چاوەدێری بە سەر ئازادی هەلبژاردن دا بە سەرۆکایەتی ئاغای تابانی وەکیلی عـەدلیەی دامەزراند . هەر چەند من لە تعقیدە بووم بەلام پاشطە منیان وەك جێگری سەرۆکی کومیتە دیاری کرد بوو.
مەسئولیەتی بە رێوە بردنی کار وباری هەلبژاردن لە سندوس و لاجان بە من ئەسپێردرا من دەبوایە بو بەشداری لە کاری کومیتەی چاوەدێری بیمە مەهاباد . لە سندوس بـە شەو سوار دەبووم لە گەل دوو برادەر دەچووم بـە گوندەکانی سندوس و لە باری ئەنگ دان بۆ صادق وەزیری قسەم دەکرد . ئەندامانی کومیتەی ناوچە هەریەك بە مسئولـی چەند گوند بو هەلبژاردن دیاری کران .

سـەفـەری خانـی

دەبـوایـە سەرێکی خانی و لاجان بدەم . رۆژێك سوار بووم لە گەل دوو هاورێ چوومـە سەرۆکانی . کاحەمەدی سەرۆکانیمان هەلگرت و سواری ماشینێك بووین بۆخانی . لە ماشین دابەزین و سەربازهاتن وگوتیان دەبێ بینە سـەرزەبانی . ئێوارە درەنگ بوو. کە چووینە سـەرزەبانی سەرگورد هاشمی گوتی ئێرە سنوورە هاتنی ئێوە بۆ ئێرە باش نیە ئەمـرم پێکراوە کە دەبێ بگەرێنەوە ."
گوتم ئێرە ئێرانە . منیش هەوالدەری رۆژنامـەم و بو زانینی وەزعـی هەلبژاردن هاتووم. پاش چەقچەقـەکی زور گوتی ." تو دەتوانی بمێنیەوە بەلام هاورێکانت دەبێ ئێستا برون". ماشین نەبوو . لورێك زوخالی لێ دایوو بۆ ورمـی . پێمان گوت سوارمان کا . گوتی لەسەر بار ئەگەر دەتوانن سوار بن . چارە نەبوو ئێمە سێ کەس سوار بووین و کاحەمەد

بەجێ ما و گوتی : "ئێوە بڕۆن لە سەر پردی دەربکە دابەزن و بە پێ بچنە دەربکە ماڵی مارفاغا منیش دێم ."

ئێمە لە سەر پرەوە دابەزین و چووینە گوندی دەربکە . کە چووینە ماڵە مارفاغا کاک حەمەد لە دیوەخان دانیشتبوو. واقمان وڕما . چۆن وا زوو گەیشتوویە ئێرە ؟ .

ـ کە ئێوە ڕۆیشتن چوومە چایخانەیکی عەجەمان تریاکیان دەکیشا . وەرمگرت دوو سێ مژی توندم لە تریاك دا و هاتمە دەر، ئائێرە رام کردوە وماندوش نە بووم .

لە دەربکە ولاخی سواریمان وەرگرت و بە گوندەکانی شنۆ زەنگ و یەلمیان و ئەندیزی دا هاتینەوە سەروکانی، ماڵە کاحەمەدی قادری . ئەگەر هاتین شیخ مارفی کوری شیخ سمایلی شنۆ لە وێ میوان بوو. شەو تا درەنگ دانیشتین و لە سەر وەزعی هەڵبژاردن قسەمان کرد . شەو درەنگ بوو شیخ مارف گوتی : "دە هەستە حەمەد بڕۆ وە ئێمە دەخەوین ". کاحەمەد گوتی : "شیخ مارف هەرسێك تەلاقم کەوێ بە جێت ناهێڵم لێت خافڵ بین دەچیە زك ژنەکان ".!

لە سەر و بەندی هەڵبژاردن دا بڕیار وابوو بۆ سەر کەوتنی صادق وەزیری هەموو توانایەك بە کار بهێنین . چەند ڕۆژ پێش دەنگدان عەلی قەرەنیاغا و هێندی ئاغای تر هاتنە نەغەدە. ماڵە حەمەد ئاغای مامش کە دەهاتنە نەغەدە لە ماڵە حەمە مزگەر میوان دەبوون . دەرە بەگ لە شارەکان هەمیشە لە مەنزلی نەرم و نۆڵ دەگەران . کەمتر دەچوونە هوتیل و میوانخانە . ماڵە حەمە مزگەریش بۆتە رەونۆلی بە نیو بانگ بوو.

لە گەل کومیتەی ناوچە بڕیارمان دا کە بچینە لای عەلیاغا و داوای لێ بکەین کە بە کوێخاکانی گوندەکانی خۆیان بسپێری کە بۆ صادق وەزیری دەنگ بدەن . دیارە ئێمە کاری خۆمان کرد بوو. ناوی صادق وەزیریمان نوسیبوو لە هەموو گوندەکانی سندوس دابو مان بە و کەسانە کە دەبوایە دەنگ بدەن . پێمان گوتبوون ئەگەر ئەغاکان ناوی کەسێکی دیکەیان بۆنوسین وەری بگرن لە سەر سندوق ناوی صادق وەزیری بخەنە نیو سندوق و ناوەکەی تر کە ئاغا وێی داون بیهێننەوە . بەلام لە گەل ئەوەش برادەران بڕیاریان دا کە من بچمە لای عەلیاغا و داوای لێ بکەم کە لە هەڵبژاردن دا یارمەتیمان بکا .

لە گەل برادەرێکی تر چوومە ماڵە حەمە مزگەر . ئاغاکانی شاوەلە و دیکۆچیش لە وێ بوون . دوای سلاو وبە خێر هاتن عەلیاغا بە خۆشی گوتی : "ئەوە چۆنە؟ ".

ـ هاتووم بە کوێخاکان بسپێری کە لە سندوس رەعیەتەکانی ئێوە بۆ ئاغای صادق وەزیری

دەنگیدەمن .

ـ تو دژی ئاغاکانی و تەبلیغاتەکەت دژی ئیمەیە و دەتەوی دەنگیشت بۆ بدەین ؟ .

ـ عەلیاغا ئەوە مەسەلەیەکی ترە . ئەگەر لەم مەلبەندە کوردیک کاندید بایە من بۆی لایەن دە بووم . بەلام بو لە جیاتی پاشاخانی قەرە پەپاخ ، کوردیکی خوێندەوار، دلسوز بە شەخصیەت نە بێتە نوینەری مەهاباد ؟ .

ـ من بۆ تودەنگ نادەم .

ـ صادق وەزیری کوردە و تودەیی نیە . کاندیدی ئیمە یە . منیش ناچم خواهیشت لە هەموو کەس ناکەم .

ـ چونکە وا بە تۆ رادیوی هاتووی ، کویخاکان دەنیرمە لای تۆ ، چونی دەتەوی بە قسەت بکەن .

ـ زور سوپاس . ئەم تکایەم لە پیروتاغاو سەلیم خانیش هەیە .

گوتیان بە کویخاکان دەلێین بێنە لات و خۆت تەرتیبی بدە . قسەکانیان راست بوو کویخاکان هاتن وخەلکی گوندەکانی ئەوان بۆ ئیمەیان دەنگ دا . سیستمی دەرە بەگی هیندی ئاکاری پیاوەتیش تێدا پەیدی دەکرا . عەلیاغا باش دەیزانی ئیمە چکارەین ، بەلام چونکە چوو بوینەلای ئەو پیاوەتیەی کرد کە منیش قەت لە بیرم نە چۆتەوە و زور جاریش باسم کردوە . بەلام هەر لە مامشان ئاغایەکی دیکە .

برایمآغای کوری حاجی عەولاغای قەلاتان زور دەهاتە لام خۆی بە پیشکە وتنخواز و کورد پەروەر نیشان دەدا . جار و بار برادەران بارمەتی باشیان لیٚ وەر دەگرت. بە تایبەت لە گەل من نیوانی زور خوش بوو . روژیك هات و گوتی : " ئیوە کارتان بە خەلکی قەلاتان و زەلیلان نەدایێ . خوم ناوی صادق وەزیری دەنوسم و دەیاندەمێ بیخەنە سندوق . "

ـ زور باشە سوپاست دەکەین و هەر چاوەروانی ئەوەشمان لە تۆ هەبوو .

تەشکیلاتی حیزبی لە گوندەکانی ئەو زور بە هیز بوو . کەم کەس ما بوو نەبیتە ئەندام و یا لایەنگر نەبی . ناوی صادق وەزیری نوسرا بوو درا بوو بە هەموو کەس . پیٚ یان گوترا بوو کە نوسراوەکانی برایماغا بێننە وە . روژی دەنگ دان خەلکی قەلاتان و زەلیلان گیرفانیان پر بوو لە م ناوانە کە برایماغا نووسیبووی دابوینیٚ کە بیخەنە سندوق . نوسیبوی ( پاشاخانی ئەمیر فەلاح ) . هەلبژاردن تەواو بوو . برایماغا هات و گوتی :

قەلاتان و زەلیلان بە گشتی بو صادق وەزیریان دەنگ دا ".
ــ چاوێکم لێ کرد و نوسراوەکانی خەتی ئەوم لە لا بوون . لە پێشم دانان و گوتم :
" ئەوانە خەتـی کێن ؟ " سەری بەرداوە و دەنگی نەکرد . گوتم : " ئەوەندە بزانە لە گوندەکانی تۆ ئیمە لە تو بە هێزترین . دەستی بە راستی بـە ".
لە کاتی هەـلبژاردن دا ئـەحمەدی قاسملوو وەك نوێنەری صادق وەزیری لە تارانەوە هاتبوە سـەحاباد و لە وێشەوە هاتە نەغەدە و دوو روژ میوانی من بوو . هەوەل جار تووشی ئینسانێکی خوێندەوار، شارەزا، سادە، بێ فێز و ئازا و تێکوشەر دەبووم . بە هەموو کوردەکانی نەغـەدە و هاورێیانی حیزبیمان راگەیاند بوو کە روژی دەنگدان ــ هیچ کەس دوکان دانـەنـی و سەعات هەشتی بەیانـی بە کومـەل بچنە سەر سندوق و دەنگ بدەن . لەولاشەوە پاشاخانی ئەمیر فەلاح بە شەونیزیکەی ٢٠٠ رەعیـە تی چوماخ بە دەستی هینا بوو خەریك بوو لە سەر سندوق کێشە ساز بکا . لە نیو شاریش کرد بوویانە قاو کە هـەر کەس لە کوردەکان بچیتە سەر سندوق لێ ی دەدەن .
کوردەکانی نەغـەدە بە تایبەت برادەرانی حیزبیش کە ئەوەیان بیستبوو بە یانی دوکانیان کرد بوونە وە کەس نەچوو بوە سەر سندوق . من شەو چووسە یەك دوو گوند و دەرنگ گەراسـەوە . بەیانی زوو هەستام بو نیو بازار چووم . تەماشام کرد دوکان و بازار هەمە و کەس نە چوتە سەر سندوق . پرسیم ئەوە چیە ؟ . بو نەچوون دەنگ بدەن؟
ــ پاشاخان چوماخ بەدەستی هیناون و هەرەشەی کردوە هەر کەس بچێ دەیکوژن .
بە توورەیـی هێندی قسەم پێ گوتن و گوتم : " ئەوا من دەچم . ئەگەر کوشتیانم ئیوە مـە بزوون . لە نیو بازار یەك دوو کەس پێشیان گرتم و نابـێ بچی، خوت توشی کیشە بکەی . جوابم نەدا. ئەوە رویشتم . دوو ژاندارم دوور لە مزگەوت کە سندوقی لێ بوو بو پاراستنی هیمنـی راوەستا بوون . پیش مزگەوت هەر جمەی دەهات و چوماخ بەدەستی پاشاخان دەوری مزگەوتیان گرتبوو . بە ژاندارمەکانم گوت : " ناوتان چیە ؟ . من سەعات بـە سەعات راپورتی هەلبژاردن بو روژنامـەکان دەنوسم . وریا بن تەهیلن کەس ئاژاوە ساز بکا و کیشە و هەرا بنیتەوە . "
گورج ناوەکانیان گوت و گوتیان تکایە لە بیرت نەچـی ناوی ئیمە بو روژنامە بنوسی
ــ وەرن وە پێشم کەون بو سەر سندوق . ژاندارمەم وە پێش خودان . خەلکیان دەرپەیا وچووە مزگەوت . کاتێك من بەیانی لە مال دەر دەکەوم کاك ماسـەندی زەرگەتن بە کیك

له‌ دۆست و ئاشناكانی من و لایەنگری حیزب بوو دەچیتە مالی ئێمە و دەیپرسی . دەڵێن وەدەرکەوتووە . ئیتر كاك مامەند یەكسەر بە دوای من دا دێ و لە نێو بازار قسە بە کوردەکان دەڵێ کە بۆچی لەگەل من نەهاتوون . من لە سەر سندوق بووم کە ئاورم داوە دیتم کاك مامەند تەختێك دوور لە پشتم راوەستاوە . قولیخانی نەغەدە كە ئەندامی ئەنجومەنی هەلبژاردن بوو گوتی : " ئاغای حسامی بۆكی دەنگ دەدەی؟
— خان مەعلوومە . ئەوە دەنووسم " صارم الدینی صادق وەزیری " . من خەریکی — نووسین بووم تیلگرافێك هات دە روژ هەلبژاردن وە دوا خرا بوو .

لەگەل كاك مامەند گەراینەوە . سوپاسێکی زوری پیاوەتی و دوستایەتی كاك مامەندم کرد . ئێستاش کە ئەو بیرە وەریانە دە نووسمەوە ئەو پیاوە تێم هەر لە بیرە و سوپاسی دەکەم .

لە کوبوونەوەی حیزبی دا هەلوێستی برادەران رەخنەی لی گیرا . کوردەکانی نەغەدە سەرکونە کران . . لە ماوەی ئەم دە روژە دا کە هەلبژاردن وە دوا خرا بوو چوومە مەهاباد . لە مەیدانی ئاردی دوو چەقوو کێش قەرە پەپاخ بە ناوی جەلیل و فەتاح کە جاسوسی روکنی ٢ بوون پێشیان پێ گرتم و گوتیان : " ئێمە لە ترسی تو نە مان وێراوە بێینە نەغەدە . جنێویان دا . گوتم بیدەنگ نەبن ئێستا بانگ دەکەم بە شەقانو بکوژن . " . ئەوان رویشتن و من چوومە موسافیر خانەی کەریمی ئەحمەدیێن . پرسیم . " ئەحمەدی قاسملوو لە ژوورە کەیە تی ؟ " .
میرزا كەریم کابرایەکی لەکن دانیشتبوو چاویکی لێ هەلتە کاندم و گوتی : وەدەر کەوتووە چوومە موسافیر خانەی کەریمی خوسرەوی . دانیشتم و سەروکی دژبانی مەهاباد لەگەل چوار دژبان و جەلیل و فەتاح وە ژوور کەوتن .

فەتاح گوتی : " ئەوەتا . جنێوی بە شاهەنشا دەدا .
سەروکی دژبان گوتی : " فەرموو بچینە دژبان .
— من سەرباز نیم . کارم بە دژبان نیە . ئێرە شارەوانی هەیە .
— من ئەمرم پێکراوە کە تو بەرمە دژبان . تكایە فەرموو .

هەستام و پێیان کەوتم . کە چووینە روکنی ٢ سەروکی روکنی ٢ پرسی :
— تو خەلکی کوێی ؟ . لێرە چدەکەی ؟
— من ئێرانیم و ئێرەش ئێرانە .

ـ بۆ چوویە موسافیر خانەی گولشەن ؟ . چکارت بە قاسملوو بوو؟ .
ـ قاسملوو نوێنەری ئاغای صادق وەزیری یە . منیش ئەندامی کومیتەی چاوەدێریم بەسەر هەلبژاردندا . دیتنی ئەحمەدی قاسملوش تاوان نیە .
ـ چیت لە باخەلان داییە لە سەر ئەو میزەیان دابنێ . دەت پشکنین .
ـ ئیوە هەقتان نیە من بپشکنن . ئیوە دادستانی لێیە . نوێنەری دادستان بێ ـ ئەودەم بم پشکنن .» . تەلەفوونیان کرد جیگری دادستان هات . هەرچی لە گیرفانم دا هەبوو دەرم هینا و گوتم فەرموو باخەلانم بگەرێن .
ـ تکایە فەرموو برۆ . راپورتی بە دەروەمان بۆ گەیشتبوو . کە هاتمە دەر میرزا محمدیەنی قونقەلا کە کویخا سجیل و ئەندامیکی بە بیر و بروای حیزب بوو چاوەروانی دەکرد .
ـ چۆنە هاتووی ؟ .
ـ ئاغاکانی شار ویران لە قونقەلا کوبوو نەوەیان هەیە . خەبەریان بۆ هینان کە حسامی گیرا . منیش بە غارهاتووم بزانم چیە .
پاش چوونی من بۆ دەژبان خیرا خەبەرەکە بە شاردا بلاو ببووە . رەحیمی سولتانیان لە ئیدارەوە هاتبوو بۆ دەژبان . من وەدەر دەکوتم توونی بووم . کوتی با بچینەوە مالی نان بخوین . بە بازاردا دەرویشتین . سمایلی شەریفزادە لە پیش دوکان خوانچەی دانابوو وردەواڵەی دەفروشت . ویستم شیشگورەوی لێ بکرم . پرسیم
ـ ئەم شیشانە بە چەند ین ؟ .
ـ خالە خەلکی کوێی ؟
ـ خەلکی نەغەدەم ؟
کەریمی حسامی دەناسی ؟
کاک رەحیم گوتی . « سمایل کەریمی حسامیت بوچی یە؟
ـ پێم خوشە بیبینم . ئەو شەولە مالی ئیمە باسیان دەکرد . ئیستا گوتیان گیراوە .
ـ ئەگەر بیبینی شیشگورەوی بە خورایی دەدەیەی؟
ـ یەك شایی لێ ناستینم
ـ ئەوە خویە تۆی کەریمی حسامیە .
سمایل کەمنکە بوو . شیشگورەوی هینا و پولی نەدەویست ، کاك رەحیم پولەکەی دایە و رویشتین .

پاشدەمرۆژ هەڵبژاردن دەستیێکرا . لە ناوچەی سندوس لە ٤٨٠ دەنگ ٤٠٠ کەس بۆ صادق وەزیری دەنگی دابوو . کۆمیتەی نغدە وەشتارەمانی هەڵبژاردن بە تووسین دەستخوشانەی لێکرا . لە مەهاباد لە دووهەزار دەنگ ١٨٠٠ دەنگ بو صادق وەزیری درابوو . بەلان بەو حالەش ئیمام جومعەی تاران لە سەر کورسی نوینەرایەتی مەهاباد دانیشت .!

## سەفەریك بۆ زینوی شیخ

سارەی پایزی ١٣٣٠ ( ١٩٥١ ) سەفەریکم کرد بۆ بەری پیرانان . چەند رۆژ لە گەل کومیتەوشانەکانی ناوچە کوبوونەوەمان هەبوو. پاشان ئیجازەم لە سەرزە بانسی وەرگرت کە بچمە زینوی شیخ . ناردم کویخا خدری دەلاوان بارگینیکی بۆنارد م و سوار بووم چومە زینوێ و میوانە شیخ عوبیدولای رەحمەتی بووم . نیزیکەی دەشەو لەوی بووم . لە گەل شیخ وکورەکانی و دەوکاندارەکانی زینوێ نیوانم زور خوش بوو نەیاندە هیشت بیمەوە ئەوە شەوەی بریارم دا سوزی بگەڕیمەوە بەفر باری . بەیانی دووسواریان دەگەل ناردم تا ئاوی شیوەرەش . سنووری ئیران وعیراق ( بە رەسمی ) .

سوارەکان گەرانەوە ومن بە تەنیا رێم داگرت . لە نیزیك پوستی تەمرچیان بارگین لە بەفردا حاسیە بوو نە بزوت . هیچ چارم نەما، لغاوم لە سەرکردەوە و بە جێم هیشت بە پێ چوومە تەمرچیان مالە باپیرئاغا . خوێ لە مال نەبوو . ژنەکان زور بە خیریان هینام. گوتم دووسی زەلام بچن ئەسپەکەم بێننەوە لە نیزیك پوستی ژاندارمە کە چول بوو حاسیە بووە . خیرا سێ چوا زەلام جۆیان برد و پاش سەعاتیك بارگینیان هیناوە . شەو لە مالە باپیرئاغا زوریان قەدر گرتم و بەیانی سواریکیان رەگەل خستم تا گەیشتمەوە زەرگەتن مالە کاك ماسەمتەدی . هەر ئەورۆژە بارگینم بۆ کویخا خدر ناردەوە . شەو بەفریك باری تەواوی ریگا و باتی گرتن و تەواو مانگیك لە زەرگەتەن مامەوە .

رۆژیك لە گەل کاك مامەند چووسە خانی . خەلك کۆبیوو و لە بەری نەوتی زالەیان بوو . نەوت نەدەهات . خەلك بە کوڵ شتیان دەبرد بۆ ولاخ دەمرنەدەچوو . دەوکاندارەکان نەوتیان شاردبوەوە و تا بە گران بیفروشن . دەوکانداریکی عەجەمیان نیشان دا و گوتیان :" نەوتی هەیە و نەیهینی چەلەنگی بە دە تمەن دەفروشی .

چونە ئیدارەی سەرزە بانی و بە سەرھەنگم گوت : " نەوت وەگیر ناکەوێ . دوکاندار شارد وویانەتەوە . بە گرانی دەفرۆشن . تۆ بیدە منگ بووی . من ئەم وەزعە بۆ رۆژنامە دەنووسم . ".

ـ ھەموویەك لە گەل خۆت بەرە . نەوت لە کوێ ھەبوو بیھێنێتە دەر و بیدەن بە خەلك .
گروبانێك ھات وچوینە دوکانی کابرای خاوەن نەوت . لە پێش دا حاشای کرد . چونە پشتی دوکانەکەی . ٦٠ چەلەنگ نەوتی شارد بووە . نەوتەکانمان بۆ ھێنا دەر و راوەستام تا بە نرخی دەولەتی ھەموویان کری . چەند دوکاندارێ دیکەش لە ترسان نەوتیان ھێنا دەر و فەرحانی پەیدا بوو . خەلك دەھاتن و سوپاسیان دەکرد .

### سەیدی ئەولادی پێغەمبەر

کابرایەکی دوکاندار ھەبوو بە ناوی سەید شامە کوری سەید مرادی . پێشتر دەمناسی مالی لە شاری شنۆ بوو زۆر روت و فەقیر بوو . چووبوو لە خانی دوکانی دانا بوو بە دوو سێ سالان ( ماشەلا ) ببوە لور دوخودا بە سەری دا رژاند بوو . !
رۆژێك لە گەل کاك مامەند لە دوکانەکەی دانیشتبووین ، کابرایەکی خەلکی گوندی دیلزە ھاتە دوکان . سەید شامە کابرای ھەلپچڕا وگوتی : " بە فر باری وچەلتوکەکەت بۆ نە ھێنام . دەبێ قەبزەکەم بۆ تازە کەیەوە . ئەوەتا میرزا کەریم لێرە یە قەبزەکەمان بۆ دە نووسی . " کابرا پاراوە وگوتی : " خولا ھەلناگری . سەنگ وسوکیەکم لە گەل بکە . مندالم ھەن ".
پرسیم ئەوە چیە ؟
کابرا گوتی : " ئەم کاك سەیدە خەرواری چەلتوکی لێ سەلەم کردووم بە ٥٠ تمەن " خەروار ٢٥ پوتە ". ئیستا خەرواری بە ١٧٥ تمەنە . چەلتوکی چاك ھەتا دوو سەدیش ھەیە . لە جیاتی پولەکەش قەند و چا و شرە و برەی داسی بە گران بۆ ئەوخەرواری ٢٠ تمە نیشرنەکەوتوە .

بۆم روون بووە کە سەید شامە چۆن بە سێ سال وا دەولەمەند بوە و ئەوھەموو سەروەتەی وە سەر یەك ناوە . یان ( خودا داویەتی ) . بە سەیدم گوت : ئینساف بۆ دینیش فایدەی ھەیە . زولم شتێکی باش نیە . جا ناکا لێشی بستێنی ؟ .

ـ بۆ؟ هەقی خۆمە . زولمی چی؟ ئەوە سەودایە".
ـ کورە ئەمە کەی سەودایە! ئەمە ڕێگرییە . فەرقی ئەوەیە بە شەو ناچیە سەر ڕێگا خەڵك ڕووت کەی بە ڕۆژی ڕووناك لە نێو شار لە سەر دوکان خەڵك ڕووت دەکەی".
بە کابرام گوت ٥٠٪ سەیدە مێیە ٢٥ تمەنەکەی بدەوە بصیەتی .
ـ وەڵا ئەگەر لێم ڕازی بێ ٥٠ تمە نیشی دەدەمێ . ڕازی نابێ .
بە سەید شامیم گوت قەبزەکەی بدەوە و لە گەڵی ڕێك کەوە . دەنا بۆ ڕۆژنامە دەنووسم ئابڕووت دەچێ". کاك مامەند قسەی لێ کرد و بڕیان بە ٧٥ تمەن قەبزی کابرامان پێ دڕاند . ڕێگا و بان شکان و لەگەڵ دووسێ برادەر بە پێیان هاتینەوە نەغەدە.

## جارێکی تر لێك کۆبوونەوە

نەورۆزی ساڵی ١٣٣١(١٩٥٢) دوکانی باڵغچی ـ م لە میرزا سدیقی بلووریا بە ئیجارە گرت و دایك و بابم هێنانەوە باڵغچی و جارێکی تر هەموومان لێك کۆبووینەوە . تێکۆشانی سیاسی، هاتووچوی شار و گوندەکان چاکی کاسبی خستبووم . من هەر بە ناوکوڕی ماڵی بووم . تەنانەت بە دوکانەکەی خۆشم لە نەغەدە باش ڕانە دەگەیشتم . باوکم لە باڵغچی وەزعی ژیانی باشبوو . ئامۆزایەکم هەبوو لە بەر دەستی دا کاری دەکرد و دوکانەکەی هەڵدەسوڕاند . خەڵکی گوندی باڵغچی لە ڕادە بەدەر باش بوون و ڕێزیان لێ دەگرت . چەند ماڵ لە وسەردارانە بوون کە وەختی خۆی لە ( دەڵاوان ) یەکترمان ناسیبوو ئێستا ببوونە ئەندامی حیزب و هاوڕێ بە وەفا بوون . من شەوانە دەچوومەوە باڵغچی و بە ڕۆژ دەهاتمە نەغەدە.
ڕۆژێك برادەرێکی خەڵکی باڵغچی هاتە لام و گوتی . " دوێنی خانمە کانی قەرە پەپاخ چوونە سەر سوڵتان و هونابێکی زۆریان بە سەر قەبرەکە دادا وە .
سوڵتان چ بوو وکێ بوو .؟ چاکێکە لە پشت باڵغچی و لە سەر لوتکەی چیا . دەور وبەری دارستان و ئاوی سارد و سازگار . گوایا ئەصحابەی پێغەمبەرە و لە سەر ئەو چیایە کوژراوە . کەسێك نازانی ئەم کابرایە کە گوایا ناوی ( سوڵتان بایاقوبە) لە سەککە و مەدینەوە بۆ گەیوەتە کوردستان و لە گەڵ کێ بە شەر هاتوە و بە دەستی کێ کوژراوە؟ ئەوەندە یە ئێستا بۆ کورد بۆتە جێگای ڕازونیازان لە م گەڕە خانوەکیان لە سەر دروست

کەرەوەکەی کلکۆیەکیش لە وێ بەرز بۆتەوە و ( ماشەڵا ) بە قەد دووکەمینەریزە دەبێتی . ڕۆژی جێژنە و نەورۆز خەڵکی گوندەکانی سندوس و تەنانەت هەندێ گوندی شنۆیەش دەیەنە سەر سولتان دەبێتە شایی و هەڵپەرکێ و زەماوەند ( جێگای درکاندنی هەستی دڵانە ) سەیرانگایەکی زۆر خۆشە و منیش پیرەمێری خۆشم لە سەر ئەم ئەسحابە بە هەمە . بەڵێ خولا هەڵناگری سولتان خێر و بەرەکەتی بۆ کیژ و کوڕی لاو هەبوە . ئێمە ئەم شوێن و ئاهەنگانەمان بۆ کاری سیاسی باش بەکار دەهێنا . برادەران هەمیشە دەچوون ڕۆژنامە و بەیاننامەیان دەبرد و دەیانداپە خەڵك . قسەمان بۆ خەڵك دەکرد . دەست و برادەرمان دەدۆزینەوە . ئێمە لە سندوس و شنۆ لە شایەر و زوڕنا ژەن و دەهۆڵ کوتیش باشکەلکمان وەر دەگرت . لە شنۆ زوڕناژەنێکی بە ناوبانگ بە ناوی کوڕی غەنی چاوەش هەبوو . ئەوە دۆستی من و لایەنگرێکی توندی حیزب بوو . بۆ هەموو شایی و زەماوەندی گەورە لێیان دەگێراوە . هەموو جار ڕۆژنامە و بەیاننامەمان دەدایە و لە زەماوەندان دا بە تاقمەکەی خۆی بڵاوی دەکردەوە . جێگای خۆیەتی باسی ڕەسوو چاوەش بکەم کە لەم بارەوە زۆری یارمەتی داوین .

با بگەڕێمەوە بۆ لای ( سولتان ؟ ) . پاش ئەوە کە خەبەر چوونی ژنە قەرەمە پاخانی بۆ سەر سولتان بۆ هێنام . بانگی برادەرێکم کرد کە زۆر فەقیر بوو . کوڕێکی سەرە و ڕەند ، بە دەستەوە ئازا ، پەیکی گوندەکان، گوتم ئێوارە بچۆ سەر سولتان . هەر چی لە سەر کلکۆیەکە دانرا بوو بیهێنە و بۆ خۆت بە کاری بێنە . سبەی هاتەوە لام گوتی " زۆر سوپاست دەکەم . هومایل ئەوەندە زۆر بوو بێجگە لە کراس و دەرپێی منالان بەشی بەرگە لێفە شی کرد . "

حەمەدی مەولوودی

ڕۆژێك لە دوکان دانیشتبووم برادەرێکی حیزبی لە شنۆیە را گەیشتی و پەشۆکاو بوو گوتی : " ژاندارمەیەك مشتە بیل حەمەدی مەولوود و محەممەدی عەولا چەپە و هاشمیان گرتووە و ئیستا هێنایانن بۆ نەغەدە و لە ژاندارمەری حەبسن .

هەستام و چوومە ژاندارمە . بە ئاجودانم گوت : " بیستوومە چەند دزێ لە شنۆ گیراون هاتووم بزانم کێن و چۆن گیراون تا بۆ ڕۆژنامە بنووسم .

ئاجودان گوتی : "دزنین خەلکی مەهاباد ن زەمانی دیموکرات هەلاتوون تاوانی
قەتلیان لە سەرە .
ــ دەکری بین بینم رەنگە بیان ناسم .
ــ بچوو ئەوە لە زیندان دان .
کە چوومە زیندان راست بوو ، کا حەمەدی مەولودی و محەممەدی مەولا چەپە و هاشم
بوون . لیم پرسین چتان گوتو و لە کوێ گیراون . گوتیان : " لە پاسگای ( کانی سپی )
دەشتە بیل گیراوین و گوتومانە هاتووین خوری بکڕین . عیلاجیکمان نەکەی نەجاتمان
نابی ".
چوومەوە لای ئاجودان . گوتم : " دەیان ناسم . بە خورایی بۆ خەلک تووشی
زەحمەت دەکەن . ئەوانە کاریان خوری کرینە و هیچیان لە سەر نیە .
ــ باشە ئیمە دەیان نیرینە مەهاباد لە وێ بەریان دەدەن .
ــ بو دەیان نیریە مەهابلو؟ . لیرە من دەبمە دەستە بەریان ئازادیان کە .
ــ ئەدی من لیرە کا دەمخوم ؟
ــ باشە ئیمرنسی تو من دەمیدەم .
ــ بچوو لە نیو بازار شاهید ناسمیک بکرە چەند کەس ئیمزای بکەن کە ئەوانە بی
تاوانن ".
هاتمەوە بازار شاهید نامەم بە دە کەس ئیمزا کرد و بردمەوە لای ئاجودان . پینج
تمەنم دایە و هەرسیکم هینانە دەر و لە گەل برادەریک ناردمنە بالغچی مالی خومان .
لە بازار سەد تمەنم کو کردەوە لیباسم بوکرین سی روژ لە بالغچی حەسانەوە و رویشتن ،
بە داخەوە کا حەمەدم نە دیتەوە . بەلام پاش چەند سال هاشم و محەمەدم لە عیراق
دیتنەوە .

## جاریکی دیکە ش بو تاران

لە و ماوەیە دا کە دوکان دانرا بوو سەید عەولا دەهات لە دوکان ئەشیای
دەبردەوە و بە خەتی خوی دەینووسی . روژیک حیسابم لە گەل کرد باسی چوار ـ
هەزار تمەن ئەشیای لە دوکان برد بووەوە . گوتم با بچین سەنەدی سەبتی بە تال
بکەین و لیک جیا بینەوە ."

گوتـی " با دوکانە کە هەر بمێنێ . رەسیدێکی چوار هەزار تمەنت دەدەمێ ".
من هەر گیز بیری ئەوەم نەدەکردەوە کە سەید عەولا لەگەڵ ژاندارمە ریک کەوتـوە و
دەمیانەوێ بە دەستی سەید عـەولا تووشی کێشەم بکەن . رەسیدەی چوار هەزار تمەنم لـێ
وەرگرت . کومیتەی مـەهاباد خەبەری داسی کە پێویستە بچمە تاران و شەش مانگ
لە کلاسی کادری سیاسی دا بەشدار بم . بۆئەوە تا لە تاران دێمەوە دوکانە کە بـێ
ساحیب نەبێ بریارمان دا بیدەم بە دەستەی ئاغا مەجید و ئەو پارێکی لە سەر دابنێ
حیسابمان کرد بایی هـەزار و پێنسەد تمەن بوو قەبزێکم لێ هەستاند .
برادەران لە مـەهاباد بریاریان دا تا لە تاران دێمەوە مانگی ٢٥ تمەن پارمـەتـی
باوکم بکەن کە قەت بریارەکەیان نەبردە سەر . چووم تاران و جاری مانگێک لە تاران
بـێ کار دەسورامەوە و هەر دەمیانگوت چاوە روان بە . کورەکانی مـەهابادی کاک ئەمیر
قازی و سولەیمانی موعینی و دەستەی ئیسحاقی لە تاران دەیانخوێند . منیش لە گەڵ
ئەوان دەژیام . لەم ماوە یـەدا هێندێ برادەری تورکی سندوس هاتنە تاران .
ئەم تورکانە خەڵکی گوندی ( زولفابات وعەجەملیان ) بوون . ئاغاکان دەیانویست لە
گوند دەریان بکەن . ئەوانیش بیوونە لایەنگری حیزب و ئیمە پشتیوانیمان لێ دەکردن .
چەند جار لە گەڵیان چووبوومە تەوریز و رەسی . پیاوانە بەربەرە کانیان دەکرد . کە
زانیبویان لە تارانم هاتبوونە تاران . لە گەڵیان چوومـە لای وەزیری عـەدلیە و داستا
نـی گێرتی و حوکمێکمان هـەستاند کە دەبێ پێش زولم و زوری دەرەبەگان بگیری و کـەس
حەقـی نیە دەریان بکا . سەر کەوتنـی ئەوان لە ناوچـە دەنگی دایەوە . بوو بە هوی
ئەوە کە زەحمەتکێشانی تورک لە سندوس بۆ لای ئیمە بێن و پشتیوانیمان لێ بکەن .
پاش مانگێک ئاغای صادقی وەزیری گوتـی . " لە مـەهابادەوە نامەیان نووسیوە
کە بچیەوە . دەڵێن بوونی لە مەلبەند پێویستە و کارە کان بە رێوە ناچـن . سوزری بـو
نانـی نیوە رۆ وەرە ماڵی ئیمە ". بە یانی چوومـە ماڵە صارم خان . کە چووم هوشمەندی برا
لە وێ بوو . بریکمان باسی سیاسی کرد و پاشان گوتـی . " برایمئاغای قادری دەناسی؟
چکارە یە و چ پیاوێکە ؟ .
ـ برایمئاغا کوری کاخدری سەرو کاتی و برای کاپیتان قادری و ژن برای سەید عـەولای
کـە ماڵی بوو . خوی کرد بوە ئەندامی حیزب و مانگی ٢٠ تمەن مانگانەی دەدا و بـو
هاتوو چوی دێهات ولاخمان لێ وەر دەگرت و جاری وایـوو بە کومـەڵ بانگی دەکردین .

گوتم براپماغا ئەندامی حیزبە و پارەمەتی دەدا. کاک حەمەدی برای ئەندامی کومیتەی نەغەدەیە و یەکێک لە تیکوشەرانی حیزبە.".
نووسراوێکی هینا دەر و لە پیشی دانام. گوتی " ئەم خەت و ئیمزایە دەناسی ؟ ".
تەماشام کرد خەت و ئیمزای براپماغا بوو. گوتی : " بیخوێنەوە ".
کە خوێندمەوە براپماغا راپورتی لیّدابووین و دابووی بە روکنی ٢ی ستادی لەشکری چواری ورمێ. ناوی ئەندامانی کومیتەی نەغەدەی نووسیبوو. ناوی هیندی ئەندامی تیکوشەری حیزبی نووسیبوو. پاشان گوتبووی ئەگەر ئەوانە نەگیرین ناوچەکە دەشێوێ.
نامەکەیدا بە من گوتی : " با لەلات بێ . بەلام وریا بن ئەوکەسانە خویان لە نێو حیزب بخزاندوە " .

بە خشداری سندوس

سندوس بەخشداریکی بۆ هاتبوو چەندی بلێی خراپ و کونەپەرست و دژی ئێمە بوو . لە کیشە و هەرای وەرزیر و دەرەبەگاندا پشتی ئاغاکانی دەگرت . چەند جار کیشەمان ببوو . شکایەتم لێ کرد بوو. لە گەرانەوەدا لە تاران لە تەوریز چووم لای ئوستاندار شکایەتم لی کرد و بە سەنەد و بەلگە بەخشدارەم تاوانبار کرد . ئوستاندار مەعموریکی لەگەل ناردم بو نەغەدە . کابرا هات و چوو لە مالە بەخشدار میوان بوو. ئیمە ناردمان لە گوندەکان ئەوانەمان کۆکردەوە کە شکایەتیان لە بەخشدار هەبوو.
لە سالوتی شاردارای نەغەدە کوبوونەوەیەکی گەورە لە سەروکی ئیدارەکانی سندوس و هیندی پیرا پیکراوی نەغەدە پیک هات . ئەوانەی شکایەتیان هەبوو هاتنە ژوور و قامکیان دەچاوی بەخشداردەنا . کابرا گەراوە بەلام بەخشداریش هەر لە جیّی خۆ مایەوە
لەوکاتەدا لە نەغەدە هەیئەتی ئەصناف هەلدەبژیردا . کوردەکانی نەغەدە بە نیکرایی منیان هەلبژارد بوو. لە بەر کاری سیاسی نەمتوانی قبولی بکەم.
دوکتور مصدق لەو سالەدا بو پیشگری لە شورشی قولی کومەلایەتی لەجیاتی ئیصلاحاتی زەوی و زار قانونی سەدی بیستی پەسند کرد . قانوونی سەدی بیست ئەوە بوو کە لە بەهرەی خاوەن ملک سەدی بیستیان دەگیراوە . لەم سەدی بیستە سەدی دەیان بوو

ئاوەدانی گوند دادەنا و سەدی دەشیان دەدا وە بە وەرزێر . ئەم قانوونە دەرەتانی ئەوەی پێك هێنا كە بە ناوی بەجێ گەیاندنی قانوونی سەدی بیست خەبات دژی دەرەبەگ و خاوەن ملكان توندتر بكرێ . لە گوندەكان كومیتەی وەرزێرەمان پێك دەهێنا كە بۆ خۆیان بە سەرچونیەتی بەجێ گەیاندنی قانوونی سەدی بیست رابگەن .

حكومەتی مصدق لە بەرامبەر ئەم قانوونە دا قانوونی كومیسیونی ئەمنیەتی پەسند كرد بوو كە بە كوێرەی ئەو لە هەموو شارێك كومیسیونێك لە بەخشدار و یا فەرماندار و فەرماندەی ژاندارمە و سەروكی عدلیە و سەروكی مالیە و دادستان پێك دەهات و ئەم كومیسیونە دەسەلاتی هەبوو هەر كەسێكی بیەوێ بە ناوی ( ئاژاوە چی ) دووری خاتەوە و یا شەش مانگ حەپسی بكا .

لە زوربەی گوندەكانی سندوس كومیتەكانی وەرزێری كار و باری گوندیان گرتبووە دەست و جوابی ئاغایان نەدەداوە . لە مەهاباد كومیتەی وەرزێری سەرانسەری كوردستانمان پێك هێنا بوو . یەكێك لە هەلەكانی ئەم كومیتەیە ئەوە بوو كە بێجگە لە من و لە كاك سولتانی حاجی باغر ئەندامەكانی تری كومیتە خەلكی گوندی نە بوون . گەنجی مەهابادی بوون . دەچوونە گوندی زمانی خەلكی گوندیان نەدەزانی . لە وەزعی ژیانی دێهات و كار و باری كشت وكال شارەزا نە بوون . لە زور شوێن هەلوێستیان زیانی دەگەیاند .

سەفەرێكی تەورێز

لە ئاخری بەهار دا سەفەرێكی تەوریزم كرد . رۆژێك لە شەقامتوشی كاك بایزی كوری سوارەی ئەحمەدی گولاویاغای مەنگور بووم . كورەكانی خال ئوغلی تەورێزی شكایەتیان لێ كرد بوو ئەوەندەیان لێڕ و لە وێ دایبووتە رایی یان لە بەر بریسبوو . پانی بە خێر هاتن و چاك و خوشی گوتی . «جاری با بچین نانێك بخوین . چونە جێگایەكی خاوێن وچلا و كەبابمان خوارد . زوورم پێ خوشبوو گوتی . «جا پولەكەی بدە . كە هاتینە دەر گوتی . «هیچ پێت سەیر نە بێ . ئەمجەم هیچیان بێ نەهێشتوم یەك تمەنم لە گیرفان دا نیە .»

ــ من پولم پێ یە با بت دەمێ .

ــ نا . سابلاخی لیرە ن لێیان وەر دەگرم .

نازانم بو چووبمه موسافیرخانەی شەرافەت . تەماشام کرد ژنێکی کورد لە بن دەرگای موسافیر خانە هەلکروشماوە . سلاوم لی کرد و پرسیم خەلکی کوێی ؟ .
ـ خەلکی گوندی ( قەمرە بلاخم) لە سەر دوکتور بووم چاویان عەمەل کرد بووم .
ئیستا لە خەستە خانە وە دەریان ناوم و هیناویانە ئیرە . دایکی وسیتی حەمە شیخەم . نە کەس دەناسم و نە دەزانم چبکەم .
گوتم هیچ کاریکت هەیە لیرە؟
ـ تا بە قوربانت بم کارم نیە . دەمەوی بچمەوە بەلام چون نازانم .
ـ دوای نیوەرو من دەچمەوە مەهاباد لە گەل خوم دەت بەمەوە .
ـ ئەی خولا دەستت دەرد مری گری . ئەگەر ئەو چاکەم لە گەل بکەی قەت لە بیرم ناچی کورەکانی من زور پیاون . چاکە دەدەنەوە .
دوای نیوەرو لە گەل خوم بلیتم بو کری و هیناسەوە مەهاباد بردمە مالە خزمیکی خوی . پاش چەند روژ وسیتی حەمە شیخە دایکی برد بووە و هاتە نەغەدە وسین بوو بە ئەندامی حیزب . پیاویکی جوامیر ئاقل قسە خوش لە سەر حیزبایە تیش چەند سال کەوتە زیندان .

## زیندانی سەید عەولای کەمالی

روژیک لە دوکان دانیشتبووم دیتم مەئموریکی ئیجرا هات . پەریکی ئیجرای پی بو کە لە ماوەی دە روژ دا دەبوایە چوار هەزار تمەن بدەم بە سەید عەولا .
بەختیار و فەرماندەی ژاندارمە ئیجراپایین پی صادر کرد بوو کە بە گرتنم بدەن .
ریگای قانوونی ئەوە بوو کە چوار سەد تمەن لە عەدلیە دابنیم تا شکایەت دەکەم و دادگا تەوا و دەبی . چووم ە ورمی . چوار سەد تمەنم لە دەفتەر عەدلیە دانا و ئیجرا راگیرا سەید عەولا یان فیر کرد بوو کە داوای گرتنم بکا . لە بەر ئەوە زور لە ماموستاکانی تورک لە سەند ور لە شانەکانی ئیمە دا بە شدار دەبوون و کوردی ئیمەش لە ورمی لە شانەکانی حیزبی تودە دا بە شدار دەبوون بریار درا بوو کە من لە کوبوونەوەکانی کومیتەی شاری ورمی دا بەشدار بم . هەر پازدە روژ جاریک دەچووم ورمی و کوبوونەوەمان دە بوو .

بیجگه له وەش له گەل دوکتور کرمان زور نیزیك بووم و زور جار نه خوش و دەرده داومان دەنارده لا و یارمەتیەکی زوری دەداین . بوّ بەشداری له کوبوونەوەدا چوو بوومە ورمی . له دەرەوەی شار له باخی برادەریك به ناوی ( فەلاح ) کوّبوینەوه و لای ئیواره هاتم که بیمەوه بو نەغەدەه تووشی سەید عەولا بووم . دوو ئاژانی له گەل بوون وکوتی ئەوەتا . ئاژان هاتنه پیش گوتیان فەرموو بو شارەوانی . سەروکی شارەوانی ورمی سەرهەنگیکی بیناموسی شاپەرست بوو . بردیانمه لای سەرهەنگ .

به توورەیی بەگژم داهات . « توّ بو ئاگرت کردوتەوه . ؟

ـ هیچم نه کردوه . مەبەستا چیه ؟ .

به ینیك له وە پیش بوّچوو بویه تەوریز ؟ .

ـ کاری خوّمه و تو هەقی ئەو پرسیارەت نیه

گوتی دەستبەندی له دەستی بدەن و بیبه نەزیندان

ـ ناتوانن دەستبەندم له دەستی بدەن . به بیّ ئەمری دادستان چون زیندانیم دەکەی .؟

ـ بچو زیندان پاشان ئەمری دادستان دیّ .

بردیانم بو زیندان . مودیری زیندان گوتی « به بی ئەمری دادستان ناتوانم بیگرم دیار بوو سەروکی شارەوانی تەله فوونی بو کرد بوو که به ناوی تەوقیف راپگره .

بردیانم بو حەساری سیاسیان . چەند برادەریکی ئازربایجانی گیرا بوون دەمناسین ئەو خوشمان رابوارد . به یانی سەرگورد وەکیلی سەروکی زیندان هات . پیشتر باش یەکتر مان دەناسی . ئینسانیکی باش و ئازادیخواز بوو . گوتی هیچ ئەمری راگرتنت نه هاتوه . له وه دەگەرین بەلگە بوّ راگرتنت بدوزنەوه . من له ٢٤ سەعات پتر راتناگرم .

دوای نیوه رو له دەفتەری زیندان بانگیان کردم گوتیان ئیجرای عەدلیه نوسیویەتی قەرزداره و دەبیّ بگیری . برادەرانی ئازربایجانی ناردیان نوین و پیخەفیان بو هینام . روژی دوایی بانگیان کردم بوعەدلیه . که چوومه عەدلیه برایەی مەعسومی سەروکی دادگای شارستان که لایەنگری حیزبی بوو بانگی کردم . گوتی « ئەورو زانیم که گیراوی . ئەو سەیده بی شەرەفەیان خیر کردوه که داوای گرتنت بکا . جاری بچوو له دەفتەر چوار سەد تمەنه که وەر بگرەوه یا ئەوپش نەبات . بانگی مودیری دەفتەری کرد و گوتی چوار سەد تمه نەکەی حسابی بدەوه . پوله کەم وەر گرتەوه هاتمەوه زیندان .

خـە بەرم دا باوكم بەلگەی چوار هـەزار تمەنەكەی بۆ هێنام كە لە سەید م وەر گرتبو لە عـەدلیە شكایەتم كرد . برادەرانـی حیزبی هـەموو رۆژ لە نەظەدە و شنو لاجان دە هاتنە لام . كیژە ئاغایـەكـی بە شەرەف خـەبەری نارد بـوو ئەگەر بە پارە تمجاتـی دەمی من گوارە و دەرزیلەی خوم دەفـروشم بۆی دەنێرم .

پاش ماتێك سەید كە هـەستی بەوە كرد بوو لە دادگا مـەحكوم دەبـی و برادەرانیش یار بوو هەڵیان نا بوو نامـەی نووسیبوو بوعـەدلیە كە ئازادم بكەن .
رۆژێك لە دەفتەر زیندان بانگیان كردم . كە چووم دیتم سەید عـەولا لە گەل مـەلا عەزیزی عـەبباسی لە وی داتیشتوە . هـەستا دەستی لە ئەستو كردم وگوتی : " هاتووم لیم ببوری . من خەراپەم كرد تو چاكەی بكە . لە زیندان هاتمە دەر و چوومـە وە نەغـەدە .
من بە رۆژ لە نەغـەدە دەبووم و شەو دەچوومـە وە بالغچـی . لە ئیدارەی ژاندا رمـەری كروبانێك لە دەفتەر كاری دەكرد . كوڕیكی ئازادیخواز و هاو كاری دەكردین و خـەبەری بۆ دە هێناین . رۆژێك هات گوتـی : نابی بە شەو بچیە وە بۆ بالغچی . دەیانەوی ژاندارم بنێرنە سەر رێگات و بە بیانووی قاچاخچی تە قەت لێ بكەن . "
كومیتەی شار بریاری دا هـەموو رۆژ دوو برادەر تا بالغچی لە گەلم بێنەوە .

## راپـەرینـی وەرزێـرانـی مـوكریان

جولانەوەی كرێكاری و وەرزێری لە سەرانسـەری ئێران پـەرەی دە گرت . پێ بە ـ پێی خە باتی دژی ئیمپریالیستی و دژی كومپانیە كانـی نەوت و دژی دەربار كـە حیزبـی تودەی ئێران پێشقەرەول و هاندەر و رێبەری بوو ، لە كوردستانیش خەبات دژی زولم و زوری دەرەبەگان پەرە ی دەگرت . وەرزێری كورد چاوی دەكراوە . دەیویست خـۆ لە چنگ ژێر دەستی دەرەبەگان رزگار بكا . هـەر وەك گوترا ئێمە لەو مەلە دەرفەتمان وەر نەگرت و جارێك مـەسەلە ی نەتەوایەتیمان تەهێنا گوڕی و لە گەل خەباتـی كومـەلایەتی تێكەلمان نەكرد . حیزبی تودەش بە جارێك لەو سەر دەمـەدا مەسەلەی نەتەوایەتی خستـە پشت گوێ و باسی نە كرد .

لە مانگی بەفرانباری ١٣٣١ ( ١٩٥٢ ) كومیتەكانی وەرزێری لە ژێر رێنوێنـی رێكخراوە كانی حیزبی تودە بو كورت كردنەوەی دەستی دەرە بەگان كەوتنە كار .

ئەمجار ئیتکاری جوانیان بە کار دە هینا . لە سەرکەوت کۆدەبوونەوە سویند یان دەخو دەخوارد کە خەیانەت بە یەکتر نەکەن . پولیان کۆدەکردەوە بۆ شکایەت و هاتوچۆی شار و کیشە و هەرای ژاندارم . لەم خەباتەدا زور لە مەلا کانی کوردستان دەوری جوان و پیروزیان هەبوو. روژنامەکانی تاران دەیان نووسی کوردستان بوتە کو مونیستی لە گوندی ( کۆل ) ناوچەی محالی ( یەختەچی ) زەماوەند ساز دەکری .

مالە برایماغای قارەمانی کە یەکیك لە دەرە بەگە ناسراوەکانی جاسوس و سەر بە دەربار بوو دەمیانەوی بیانوو بە مەلا عەولای مەلای گوند بگرن و بە زوری کیژی مەلا بەرنە نەیو شایی . وەرزیران لیّیان وە خوّدەکەون و مالە ئاغا پەلامار دەدەن . ئاغاکان لە گوند دەر دەکەن . دەرە بەگەکانی ناوچە خەریك دەبن بە هاواری برایماغاوە بین کومیتەکانی حیزب لە و مەلبەندە داوای لە وەرزیران کرد کە هەر خاوەن ملکیکی بە هاواری برایماغاوە بچی، لە گوند دەری بکەن . وەرزیران لە سەرانسەری ناوچە لە دەرە بەگان و وە خوّکەوتن . گوندەکانی ( کول ، مەلالەر، عەمبار، ناچیت، شاریکەند ، رەحیم خان و ناوچەی فەیزولا بەگیان ناوەندی راپەرینی وەرزیری بوو . لە هەموو گوندیك ئاغاکانیان وەدەرنان . دەرە بەگەکان پەنایان بۆ بوکان برد و شاری بوکان بوو بە مە کۆ و پەنای دەرە بەگە هەلاتوەکان . وە رزیران بۆ دیفاع دەستەی چەکداریان پیك دە هینا . بە داخەوە کومیتەی سەر کردەیی لە مەهاباد و ریبەرایەتی حیزبی تودەش نەیانتوانی راپەرین بە هیز بکەن و بۆلای شورشیکی راستە قینە پالی پیوە نیێنا کومیتەی مەهاباد غەنی بلوریان و عەزیزی یوسفی کردە مەعمور کە بگەنە ناوەندی راپەرین و ریبەرایەتی بکەن . بەلام ئەوان لە میاندواوەوە دە چنە تەوریز و لە ویوە دە چنە کرماشان و لە تاران سەریان هینا دەر . سەرتیپ موزەفەری فەرماندەی سوپای مەهاباد لە شکری بە تانك و توپەوە بە هاواری دەرە بەگانەوە نارد . قاسماغای ئیلخانی زادە سەروکایەتی دەرە بەگە هەلاتوەکانی گرتە دەست و چەکی لە ژاندارمە وەرگرت و بە پشتیوانی تانك و توپی لە شکر، راپەرینی وەرزیران سەر کوت کرا . دەرە بەگ و کونە پەرستی ناوچە لە هەموو لایەك لە وەرزیران وە خوّکەوتن . محی دینی بابانزادە لە دەستالی پەنا سابلاخەوە بو سەرکوت کردنی راپەرینی وەرزیرانی ناوچەی بوکان کەوتە ریّ و دەستی گلاوی بە خوینی وەرزیران سور کرد . ئەم گوندانەی کە خاوەن ملکەکانیان لە ترسی وەرزیران رایان کرد بوو کەوتنە بەر پەلامار و هیرشی دەرەبەگ وژاندارم .

دەستیان کرد بە کوشتار و تالانی وەرزێران . منداڵی بەرمەمکانیان بە بێشکەوە خستبوە چۆمی تەتەهوو، لە ناوچەی شامات خەڵک بێشکەی منداڵی خنکاو وتەرمی کوژراوەکانیان دەگرتەوە . لە هەموو ناوچەی مەلاکانیان لە گوندی وەسەر دەناو وەرز یرە سەر بزێوەکانیان دەر دەکرد . دەرەبەگەکانی ناوچەی بوکان و بە شی بەگزادە مەر و گارنسی تالان کراوی وەرزێرەکانیان دەنارد بۆ بازاری مەهاباد لە سنە وس بیفرۆشن .

کومیتەی نەغەدە کۆبوونەوەی تەواوی لە ئەندامان پێکهێنا و پاش لێکۆلینەوەی روو داوەکان ئەم بڕیارانەی ویرەوەی پەسند کرد و هەر یەک شەو لە سەرانسەری سندوس بە ڕێکخراو و کومیتەکانی حیزبی راگەیاند .

١ شانە و ڕێکخراوەکانی حیزبی لە گەل کومیتەکانی وەرزێری لە وپەری وریایی و ئامادەیی دا بن و هەموو خەبەر وجموجولی دەرەبەگەکان بۆ کومیتەی نغەدە بنێرن .

٢ ـ هێزی بەرگری لە لاوان پێک بێنن و شەو روژ لە ئامادەیی و کێشک دا بن .

٣ ـ ئەو گوندانەی ئاغایان لێ نیشتە جێ نیە، ڕێگا مەدەن کە ئاغا بێتە نێو گوند .

٤ ـ برادەرانی گوندەکانی ( قەرە قەساب وخەلیفەلیان و مەمەلیان ) لە سەر ڕێگاکانی ( شەرگە و زینوێ باراملووان ) کێشک بکێشن و مەر ومالاتی تالان کراوی وەرزێرەکانی ناوچەی بوکان و بەختەچی کە بو بازاری مەهاباد بۆ، بیبەستێنن و بیبێنن بو نەغەدە و تەحویلی کومیتەی نەغەدەی بدەن .
قادری سوفی حەمزە لە قەرەقەساب بە مەسئولی ئەم بەشە دیاری دەکری .

٥ ـ هاوریانی حیزبی لە گەل کومیتەکانی وەرزێری خەریکی کو کردنەوەی یار مەتی و پیتاک بن بۆ لێقەوماوەدەر کراوەکانی ناوچەی بوکان .

٦ ـ هەموو ڕێکخراو و ئەندامانی کومیتە پیوەندی داشیان لە گەل مەسئولی تەشکیلات هەبی .»

ماڵەکەی من وەک مزگەوتی لێ هات . شەو روژ لە سەرانسەری ناوچە وە برادەران دەهاتن و خەبەریان دەهینا . لە زور بەی گوندەکان ئاغاکان لە ژوری دا وەک حەپس وا بوون و نەدەهاتنە دەر . چاوە روان بووین کە لە مەهابادەوە دەستوری راپەرین بەرێ .

بـو ئەوە جم وجولە کە توزی لە بەر چاوی ژاندارم ون بـێ، برادەران بریاریان دا بـو چـە ند روژ من نە بمە نفـەدە و هەر لە بالغچـی بـم .کا حسـه مه دی قادرەش لە گەل من بـێ . تازە ژنم هینا بـوو روژیك دایك و بابم لە مال نەبوون لەگەل خیزانم دانیشتبووین پیکەوە نانمان دەخـوارد . لە بەر هاوری بەکی خـە لکی کولیوە ژوور کـە وت . کە ئیمەیدیت پیکەوە نان دەخـوین حەپەسا . کوتم وەرە پیش بـو وا مات بووی . دانیشت و نان و چای خوارد و وەلامی نامەکانی وەر گرتە وە و روی. کە چوو بووە بە برادەرانـی گوتـبوو: هەر ئەومان پیاو لە نیو دابوو ئەویش هیچ .. پرسیبوویان بـوّچ بـوە ؟

ـ چون کە چوو مـە ژوور لە گەل ژنەکەی نانـی دەخـوارد ".!

برادەرانـی قەرە قصاب و خـە لیفە لیان نیزیکە . . . ە سەر مـە ر و رە شـە ولاخیان لە نوکەر و چلکاو خوّری دەرە بەگان ئەستاند بووە و کە هینا بوویان لە بازار بیفروشن . لە نەغەدە دوو کاروانسەرامان دیاری کرد بوون ئەم ئاژەل و مالاتـە مان لە وی رادەگرت و خە بەر مان دا بـە مـە هاباد کە رابگە یە نن خاوە نەکان بـێـن مـەر و مالاتیان بـە رنە وە . ئەوانەی بوّ فروشتنیان هینا بـوون لە نەغـە دە بـە گرتنمان دان .

دەرە بەگەکانـی لاجان و سندوس و شنو ناوچـەیان بە جـێ هیشتبوو چو بوونە ورمـێ . کومیسیونـی ئە منیە تی شارستانـی ورمـێ بریاری دابوو کە هیندی لـە وکە سانە بگری کە لایان وابوو ئاژاوە دە نێنە وە . فـەرماندەی ژاندارمری ورمـێ و جیگری فەرماندار هاتـبوو نە نـەغـە دە .و لە بە خشداری لە گە ل فەرماندەی ژاندارمـە و بە خشدار و سـەروکـی ئیدارەکان کوّبوو نە وەیان هـە بـوو.

من وەك هەوالدەری روژنامـە چو مە بە خشداری و چووبـە دیوی کوبوونەوە .

فەرماندەی کوردانی ژاندارمە پرسـی . " ئاغای حسامـی کاریکت هـە بوو ؟ .

ـ ویستم بزانم جـە نابت بوّ هاتو تە نەغـە دە؟ . بوّ پیشگری لە کوشتار وتالانـی وەرزیرانـی ناوچـەی بوکان چ هە نگاویکتان ناوە ؟ .

ـ فـە رموو تە شریفت تاویك لەودیوە دابنیشی وە لامـە کانت ئەدەمـە وە .

چوو مـە دیوە کەی تر و چایە کیان بـوّ هینام چام خوارد ە وە و گروپانیك و دوو ژاندارم هاتنە ژوور وکوتیان . " ئاغای حسامی فـەرموو بوّ ئیدارەی ژاندارمـە .

ـ من کارم بە ئیدارەی ژاندارمە نییە بۆچی دێم ؟
ـ تۆ حەسە پسی و فەرموو بۆ ئیدارە ·
چار نە بوو وە پیشیان کەوتم و لە ئیدارە ژاندارمە خستیانە زیندانەوە . زووری ێ
تە چوو یەك یەك و دوو دوو برادەرانی ئەندامی کومیتە و هێندێ هاورێی تێکوشەری
دیکەشیان هێنان . گیراوەکان بریتی بوون لە :
کاك حەمەدی قادری ، مستەفای ئاغا مەجید ، کاك سەعدە ، ئەحمەد حەمە لەبَ
مەحمود حەلەب ، سدیقی عەلائی ، حەمەدی خانمی ، حەمە مزەنائشەوان
محەمەدی سوفی رەسوو ، قاسمی پینەچی .
هەموو یان لە ژووریك دا کۆکردینەوە . شەو لە مالەوە را نان و پێخەفیان
بۆهینابین . بەیانیی چوار شەمووروژی بازاری نەغەدە بوو . ئوتوبوسێکیان
هێنا وگوتیان نەفەری سی تمەن بدەن بۆ ورمێتان دەبەین .
ـ هیچ نادەین . ئیوە دەمان بەن بو ورمێ ، پولی ئوتوبوسیش بدەن .
قاجودان هات گوتی ." ئیدارە بودجەی نیە . دەبێ خوتان کرێی ئوتوبوس بدەن .
دە نا بە پێ دەتان نیرین ."
ـ پێمان خوشە بە پێ بمان نیرن . دەبێ بیست ژاندارمەمان لە گەل بیت . دە
روژ بە رێوە دەبین . لەرێگا خەلك دەمان بینێ . هەر ئەوەمان دەوێ .
چەقەقەیەکی زوری کرد جوابمان نەداوە . بریك جنیوی بە فەرماندەی ژاندارم دا و
سواری ئوتوبوس بووین . بە شوفیری ئوتوبوسم گوت ناسیار بوو ، لە نێو بازار رایگرە ـ
هێندێ پول لە برادەریك وەر دەگرم .
کە پشتینە نێو بازار و ئوتوبوسی راگرت . خەلك بە جاریك لێمان کو بووە . من لە
ئوتوبوس هاتمە دەر و چوومە سەر پیشی ئوتوبوسەکە . سەودا و مامەلە راوەستا و لە دەور
مان کو بوونەوە . ژاندارم هاتنە خوار و لە چەخماخەی تفەنگیان دا و گوتیان وەرە
خوار . گویم نەدانی و دەستم پیکرد .
" برایانی بە ریز زەحمەتکیشانی شار وگوند ! وەك دەبینن حکومەتی دوکتور
مصدق لە هەموو شوینی پشتیوانی لە دەرەبەگان دەکات . ئیستا بە پشتیوانی لەشکری
مەهاباد بە تانك وتوپەوە چوونە سەر وەرزیرانی ناوچەی بوکان و فەیزولا بەگی . ئەو
زەحمەتکیشانەی داوای مافی ژیانیان دەکرد و دەیانگوت با ئاغا چیدی نەمان چەوسینەوە

خراونه به ر هیزشی چەکدار و لێ یان کوژراوه و تالان کراون . ئیمه لیره . . . ده سەر مەر و مالاتی تالانکراومان ئەستاندوتەوه و خەبەرمان داوه بین وەری‌گرنەوه . ئاغاکانی سندوس و لاجان و شنو ئیستا له ورمی کو بوونەوه و داوای چەکیان کردوه که لەم ولاتەش ئەو تاوانانه دوو پاته بکریتەوه . ئیمه که به ر هەلستی ئەم جنایەتەمان دەکرد و پشتیوانیمان له ماف و خەباتی ئیوه زەحمەتکیشان دەکرد. ئەوا گرتوویانین و بۆ ورمێ مان دەبەن . بەلام نابێ ئیوه بیلن به گرتنی ئیمه خەبات راوەستێ . دەبێ کومیتەی‌وەرزیران کە دامەزراوه به هیزتری بکەن . پشتی یەك بگرن . له تیلگرافخانه شکایەت بکەن . برادەرانی ئیمەزور لە دەمرێماون و لەگەڵ ئەوان هاوکاری بکەن ".

ژاندارم کردیانه هەرا و هاواریان برد بۆ ژاندارمەری . ئاجودان هات . که پشتی من قسه کانم دەهات تەواو بن . یەك دوو جار گوتی . " تکا دەکەم وەره خوارێ ".

هاتمه خوار . دوو برادەر ۱۷۰ تەمەنیان هێنا کونیان‌ئیستا لێره کوّمان‌کردوتەوه . ئوتوبوس له نیوە شەوار دان و چەپلە ریزان دا کەوتە رێ .

که پشتینه ورمێ . له گاراژ دابەزین و بە پێ یان به شەقام دا ژاندارمەوه پێش‌خویاتیان داین . خەلکی ورمێ لەوبەر و بەری شەقام راوەستا بوون و سەیریان دەکرد . یازدە کەس به جلی کوردی لایان وابوو داخوا ریگرن . به ژاندارمەکانم گوت با به فایتون بچین . لەخولا یان دەویست .

فایتونیکم راگرت و سەر کەوتم . تا فایتونی تر دەهات دەبوایه راوەستین . لە سەر فایتوون هەستام و به ترکی رووم کرده خەلك و گوتم . " هاونیشتمانانی ئازربایجانی پیتان‌وانەبێ ئیمه له سەر دزی یا شەر و کیشه گیراوین . ئیمه یان به تاوانی دیفاع لە مافی زەحمەتکیشان و پشتیوانی له خەباتی وەرزیران گرتوه . له بوکان دەرەبەك و ژاندارم و لەشکر دەمیان وەرزیریان‌کوشتوه و تالانیان کردوون . نەك هەر له کوردستان له سەرانسەری ئیران ئازادیخواز کە وتونه بەر پەلاماری حکومەت . ئیستا ٢٥ تیکوشەری خەلکی ورمێ لەزیندان دان . ئیمه ش بۆلای ئەوان دەبەن . ژاندارمەکان کردیانه هەرا وفایتون هاتن و بردیانین بۆ ئیدارەی ژاندارمە .

دوو روژ له ژاندرمەری‌رایان‌گرتین و بێ ئەوه که هیچمان‌لی بپرسن . روژی سێیەمم کردمان به هەرا وگوتمان . " ژاندارم هەقی نیه ئیمه رابگری . ئەمان بەن بۆ داد سەرا نان ناخوین . دوای‌نیوه روّ بردیانین بۆ داد سەرا و قازی بریار راگرتنمانی دا .

ئیمەیان برد بۆ زیندانی شارەوانی . کاتێک ئیمە گەیشتینە زیندان ٢٥ هاورێی ئازربایجانی لە زیندان ئازاد دەکران . لێفە و دۆشەک و قاپ و قاچاخ و هەموو شتومەکی پێ یان بوو بۆ ئیمەیان بەجێ هێشت . ئەودەم زیندانی سیاسی رۆژی ١٧ قران جیرەیان دەدایە . نان و چێشتیان لە زیندان دا بۆ خۆ دروست دەکرد . رۆژە بەدەمیان کەس دەهاتە مولاقاتێ پولیس هەموو شتێکی پەیوەستی بۆ زیندانی دەکری . زیندان کتێبخانەی هەبوو ، کتیبی باش دەهاتنە زیندان و لە واقیع دا مەکتەبێکی سیاسی بوو . دوو رۆژ بێدەنگ دانیشتین و رۆژی سێهەم پاش نانی بەیانی گوتم :

" کاغەز و قەلەم بێنن تا شکایەت بکەین و تەلگراف بکەین بۆ مصدق و بۆ رۆژنامەکان و بۆ شوێنە بەرزەکانی دەولەتی . بزانین ئیمەیان لە سەر چی گرتوە ؟ " .

کاحەمەدی قادری بەرەحمەت پێی گوتم :" دەتەوێ چبکەی ؟ نوسینی چی ؟

ـ تەلگراف بکەین شکایەت بکەین خۆ نابێ هەروا بێدەنگ دابنیشین .

ـ هەرسێک تەلاقم کەوێ قەلەمی پێدا ناهێنی . لێمان گەڕێ با توزێک بحەسێینەوە و یەک دوو جەمی خوش بخوین . خۆمن بەنان و شوربەی سەروکانی چاوم کوێر بوو .

هێندێ برادەرانم دلخوشی داوە . کردمانە بەرنامە رۆژی چوار سەعات ئێوارە و بەیانی باسی سیاسی و خوێندنەوەی کتیبمان هەبوو . کوڕە جوانێکی ئەرتەشی هەبو بەناوی ( شەوقەلی ) بەخێر ئازادی بخواز بوو بەلام هەمیشە لە زیندان بوو . ئازادیان دەکرد پاش دوو رۆژ دەچوو کونە بەیانێکی دەدزیەوە و لە پیش ستادی لەشکر بلاوی دەکردەوە دیسان دەیانگرتەوە . برا ئازربایجانیەکان دەیانگوت هاورێ شەوقەلی لەدوو شت دەترسی ، یەکەم ئیعدام ، دووەم ئازاد کردن . هەرکەس هاتبا زیندان و لە بەندی سیاسیان بایە پێ ئەوە کە بزانێ کێیە و لە سەر چی گیراوە شەوقەلی دەچوە پەنای و دەیگرت و باسی سیاسی بو دەکرد و بە ئیستلاحی خوی ( روونی دەکردەوە ) . دەستی لە کابرا هەلنەدەگرت و پشوی لێ دەبری .

رۆژێکیان دوای ناشخواردن شەوقەلی ئەحمەد حەلەبی گرت و بە بن دیواردا هاتو چوی پێ دەکرد و قسەی بۆ دەکرد . تا سەعات بوو بە یەک پشووی پێ نەدا . سەعات یەک بانگمان کردن نان بخوین . کە دانیشتین ئەحمەد حەلەب یادی بەخێر پێی گوتم : راوەستن قسەم هەیە . گوێ راگرن . بریارم دا بوو هەتا دەمرم دەست لە خەبات وتێکوشانی سیاسی هەلنەگرم . بەلام تەلاقم کەوێ ئەم جارە بچمە دەر تازە کارم بە سیاسەت

و تیکوشان نابی . بەلکو جاریکی دیکەش گیرام و ئەوقەلی هەر لیرە بوو . ئیشکی سەرم دەیا و مال ویران دەبم . کورە ئەوە تۆ چت لە من کرد ؟ ".

دەستمان کرد بە نووسین و شکایەت . لە نەغەدە و مەهاباد لە سەرگرتنی ئیمە تیلگرافی سکالا و ئیعترازمان بۆ تاران دەنیردران . بەدوای سەرکوت کردنی راپەرینی وەرزیران لەناوچەی بوکان و گرتنی ئیمە لە سنەوس، دەرەبەگەکان لەم ناوچانە کەوتنە خۆ و دەستیان کرد بە دەرکردنی وەرزیران لە گوندەکان . ئەوەی دەیانزانی سەر بزیوە و بۆنی حیزبایەتی لێ دێ، دەریان دەکردن . لە گوندەکانی ئارنە و قەلاتان و دیلان چەرخ ١٣ مالی فەرە و جوتبەندیان دەرکرد بوون . لە بالخچی میرزا ــ صدیقی مامی غەنی بلوریان مالی ئیمەی دەرکرد بوو . لەناوچەی بوکان بەدەیان مالیان دەرکرد بوون و لە هیچ کوێ رایان نەدەگرتن .

پیاوەتی و ئینسانیەت و ئازایەتی خانمە خانمی سەدری قازی نابی لە بیر بچێتەوە . زور لەو مالانەی دەردەکران ئەو لە گوندەکانی گویگجەلی و برایمابات خانووی دەدانی و رایدەگرتن . چەند کەس لە دەرکراوانی سنەوس هاتنە زیندان و گوتیان لە هیچ کوێ رامان ناگرن ".

گوتم : " ئەگەر لە حەلب و کویکان راتان بگرن چۆنە ؟ .

ــ زور باشە لە دەخلێ و دانمان نیزیك دەبین و هەر وەك لە سەر جێ و ڕێی خۆمان بین وایە ". نامەیەکم نووسی بۆ مام وسینی خەلیل و مستەفای خەلیل ( پاشایی ) لە حەلب و کویکان . ئەوان خۆیان بە دۆستی حیزب دەزانی و ئیوانیان لە گەل من زور ــ خوش بوو . بۆم نووسین ئیستا روژی ئیمتحانە . تکا دەکەم ئەو ١٣ مالە رابگرن و جێگا و ریگای باشیان بدەنێ ".

برادەران گەرانەوە . پاش دوو روژ محەمەدی کوری مام وسین هاتە مولاقات . هەموو برادەرەکانی بانگ کرد . گوتی بابم ناردوەمی دەیگوت ئیمە خاوەن ملك نیین بۆ هەموو هاو کاریەك ئامادە ین . هەر ١٢ مالیان راگرتبوون و حاوا بوونەوە .

روژیکی دیکە میرزا مەولود و کەریم لیتان هاتنە زیندان . بانگیان کردم و پاش چاك و خوشی گوتیان : " خەراب قەوماوە . هەموو کوردستانمان کرد وە لە هیچ کوێ رامان ناگرن . " . مالە برایم لیتان لەو کەسانە بوون کە لە راپەرینی وەرزیرانی ناوچەی بوکان دا دەوریکی پیاوانەیان هەبوو . میرزا مەولود و میرزا کەریم ئازا و نەترس و بە

کار بوون . برایم لیتان‌پیاویکی به ناو بانك و دەستکەرەوە بوو . ئاغاکان بو راگرتنی برایم لیتان رقە بەریان دەکرد . بەلام پاش هەرای بوکان لە گوندی ( عەمبار ) دەریان کرد بوون و لەهیچ کوێ راپان نە دەگرتن . چوو بونە دەشتە بیل و مەرگەوەریش‌جیگا ـ یان وەگیر نەکەوتبوو. گوتیان : " وەزعە کە ئاوایە و هاتووین بزانین تە‌کبیر چییە ؟ .
گوتم : " ئەگەر بچنە ئالیاوێ شنویە من نامە بو موزەفەر خان دەنووسم خانوو وجیگا تان بداتێ .
ـ ئەگەر وابکەی‌لە بیرمان ناچێ . چوینە شنویە جیگامان وەگیر نەکەوت . ئالیاوی زور جیگای‌چاکە و لە خولامان دەوێ " .
نامەیەکم نووسی بو موزەفەرخان . داوام لی کرد کە ئەو مالانە رابگری وجیگای باشیان بداتێ . موزەفەر خان بیجگە لەوە کە برای‌خیزانم بوو ، کوریکی پیشکەوتنخواز و خوێ بە لایەنگری حیزب دەزانی . میرزا مەولود ومیرزا کەریم گەرانەوە . پاش‌دوو حەوتوو هەر دووکیان هاتنەوە زیندان . مالە کەیان‌هێنا بوە ئالیاوێ و باش‌دامەزرا بوون .
هیندی پارۆل و ریێ و شوێنی خەباتم لە ناوچەی شنو یێ‌نیشان دان و گەرانەوە .
هیشتا لەزیندان بووم مستە فای موئمنی هات . مستەفای موئمنی برادەریکی حیزبی بوو لە ورمێ ماموستای وەرزش‌بوو. کوریکی هەلسوڕ مالەکەی مزل و مالی هەموو برادەرانی حیزبی بوو . بە کاری خەلکەوە ماندوو بوو . رابیتی ئیمە بوو لە گەل برادەرانی ئازربایجانی . بە داخەوە پاشان دەستی لەخەبات هەلگرت و لە تاران کاسبی دەکرد . مستەفا هات وگوتی : " تاهیر خان توتنی بردوونە دخانیە و هاتووم نامەیەك بۆ‌مسیو بنووسی کە توتنەکانی باش‌بۆ بقە بلینی . نامەم بۆ مسیو نووسی و پاش چەند روژ تاهیر خانی سمکو هاتە لام و سوپاسی کرد .
پاش ٢٥ روژ لە باز پرسی بانگیان کردین . باز پرس‌گوتی : " ئیوە ئازاد دەکرین بەو شەرتەی لە شاری‌ورمێ نە جنە دەر و لیرە بمینەوە . "
گوتم : " ئیمە لیرە گیر نابین . خەرجی ئیرەمان نیە . ئەگەر تاوانباریین داد اگاییمان بکەن . ئە گەر تاوانیکمان نیە لیرە گیر نابین و لەم گرتنەش‌خوش‌نابین . "
ـ ئەگەر ئەوانیش‌بچنە وە تۆ پیویستە لیرە بی .
برایانی ئازربیجانی خەبەری ئازادی‌ئیمەیان زانیبوو . نیزیکەی ١٠٠ کەس بە دەستە گولەوە هاتبونە دەرکی زیندان . هێندی‌کوردی شنو ونەغەدەش‌هاتبوون و بە شیوەیەکی

شایی و پیشوازیەکی گەرم لە زیندان هاتینە دەر . چووینە موسافیرخانەی ژالە . هیندی لە برادەران نارەحەت بوون و بۆ چوونەوە بە پەلە بوون . گوتم ئەوەی دەیەوی با بچیتەوە من لیرە دەبم و وەلام دەدەمەوە . چەند کەس لە برادەران چونەوە و پاش دوو روژ هاتنەوە ورمێ . دوای چوار روژ بریارمان دا بچینە فەرمانداری و رابگەیەنین کە یا دەچینەوە یا دەبێ لیرە موخاریجمان بکیشن . لە بەر دەرگای موسافیرخانەی جیهان نووسەر کاک ئەحمەدی سەروکانی برای کاپیتان قادری بووین . گوتی :

ــ وەرن چایەک بخونەوە ئیمەشیان بۆ فەرمانداری بانگ کردوە و پیکەوە دەچین . کە چووینە ژوور عەولای بایزئاغا لە وی بوو . دانیشتین و کاک ئەحمەد گوتی : "عەولا ئاغا ئەوە کاک کەریمی حسامی یە . نا یناسی ؟".

عەولاغا هەستا و هات لەکن من دانیشت . گوتی : "دەلیم تۆ بۆ دە ئاغایانت هەلپیچاوە؟ چتلە گیانی ئیمە دەوی ؟ .

ــ عەولاغا خەرابیان حالی کردووی . من دەلیم کورد بۆ خۆ میللەتە. زمانی خوی هەیە. خاوەنی میژو و رابردووی خوێەتی . بۆچی دەبێ کورد هیچ دەستەلاتی نە بێ و هەر عەجەم حوکماتی لە سەر بکا؟ .من دەلیم لە جیاتی مەعموری تورک و فارس بۆ کورد لە کوردستان مەعمور نە بن ؟ . من دەلیم با چیدیکە کورد ژیر دەستە نە بن و بو خویان دەستەلاتی ولاتی خویان هەبێ . ئەوێە تیکوشانی من . جا ئەوانەی نوکەری عەجەمانیان پێ خوشە دژی من قسە دەکەن . "

کاک ئەحمەدی سەروکانی گوتی : "عەولاغا ئاغای حسامی بو کورد هەول دەدا خەرابیان حالی کردووی ." عەولاغا گوتی : "ئیستا تەوە حالی بووم . بە سەرقەدی شیخی برهانی دەبێ بێ یە ترکەترو خەلاتیشت دەکەم" .

کە چووینە فەرمانداری کومیسیونی ئەمنیەت کو بوونەوەی هەبوو . دەیانویست بریار لە سەر ئەوە بدەن کە ئیمە ئازاد بکرێین یا دوورمان خەنەوە . من دانیشتم و لە بەر بێ کورسی برادەران راوەستان . رووم کردە فەرماندار و دادستان و گوتم :

" ئیمە چاوەروانی ئەوە بووین کە فەرماندەی ژاندارمەری تەمێ بکری . ئەو بێ ئیجازەی دادستان ئیمەی هیناوەتە ئیرە و ٤٨ سەعات لە ژاندارمەری رایگرتووین . ئیمە بە نوسین شکایەتمان کردوە و ئیستاش داوا لە دادستان دەکەم کە بە شکایەتی ئیمە رابگا " .

فەرماندەی ژاندارمە هەستا وگوتی : "لە بەر قانوون نەبایە تووم نە دەهینا زیندان

له بن داران دا دەمكوشتی ".
گوتم . " ئەگەر قانوون هەبایە کونە قازاخـی وەك تو بەم چشنە راو ورووتی نە دەكرد ".
بۆ فەرماندار و دادستان شەرمە که ژاندارمەیەك بە ئاشكرا لای ئەوان هەرەشــە ی کوشتن دەكا ."
دادستان رووی‌کردە کابرای‌ژاندارمە و گوتی . " لە کوبوونەوەی‌رەسمی دا پیویستە رعایەتی قسە بکری ".
بە فـەرماندارم گوت . " بە گوێرەی کام قانون ئێمەتان لێرە راگرتوە ؟ . ئیمە بــە گوێرەی‌کام قانوون مانگێك زیندانی کراوین ؟ . ئەگەرتاوانمان هــەبوە بو چـی بازپورس هیچی لی نە پرسیوین ؟ "
دادستان گوتـی . " دەولەت‌کومیسیونی ئەمنیەتی داناوە . کومیسیون هــەقی هەیە تا شەش‌مانگ‌یەکیك زیندانی بکـا . ئێستا ئێوە برونەوە . کارێکی وامـەکەن کە ناوچە ئالوز بـی ."
ئێمە وە دەر کەوتین و گەراینەوە بو نەغەدە . ئەم جار ئەو ئاغایانەی وەرزێریان دەر کرد بوون کە وتبوونە کلکە سوتە و روژێ دەهاتن دەپارانەوە کە با بێینەوە سەر شوێنی خوێیا کومیتەی‌وەرزیرانمان تێ‌گەیاند کە دراوی‌توتن و چــەوەندەر بۆ خوێیان وەر بگرن و نــە هێلن ئاغا وەری‌بگرێ . نامەی بە کومەلمان پێ دەنوسین بۆ دوخانیە و کارخانە ی قەند کە دراوی‌توتن و چــەوەندەر مــە دەن بە ئاغاکان . پیشتر وەرزیر نە یدەتوانی دراوی توتن و چـــەوەندەر وەر بگرێ، نەیدەزانی چــەندی‌هەیە .
پاش‌رهاتنەوەم لە زیندان روژێك هاوڕێیانی دەریەند بانگیان کرد بووم . لەگـەل دووسێ برادەر چووینە دەربەند . گوتیان سەید مارفـی کامووسی مردوە و لە گەلمان وە رە بچینە سەرە خوشی . منیش‌کورەکانی سەید مارفم دەناسی و چووینە کامووس .
دانیشتبووین و میوان زور بوون رادیوتاران خەبەری دەگوت و باسی شەری کورە و سەر کەوتنی کومونیستەکانی دەکرد . سەید رەحمانـی کوری سەید مارف‌گوتـی . " کاك کەریم حـونکە کومونیستە ئەوە خەبەرەی چـەند پی خوشە ".
گوتم . من هاوڕێیانی دەربەند هینایانم دەنا نایەمە مالـی تو . ئەوە دەروم و ــ مــەگەر بە لەشکر بێمە وە مالت ". هەستام و دەر کەوتم . وەرزیرە کانـی کاموس چونە کارخانە و پولی چـەوەندەریان وەر گرتبوو. سەید رەحمان هەموو روژێ دەهات‌دەیگوت

ـ پولەکەیان وەرگرتوە هیچ، بەلام رێگا نادەن کە پەیمانی چەوەندەر ببەستم ".

ـ هەقی خۆیانە . بو تۆ پەیمان ببەستی ؟ . تو چەوەندەر ناکەی، کوێرە وەری ناکیشی ئەولادی پیغەمبەریش بەستە ".

قاوەخانەی سەید کاکە ببوە مەکو و جێگای کو بوونەوە و هاتووچوی خەلك و جێگای سکالا و نامە نووسین . روژی جاریك دەچووم سەعاتێك قسەم بو خەلك دەکرد و بو بەکێتی و دریژەی خەباتەانم دەدان .

کە لەزیندان هاتمە دەرمالەکەی ئێمەیان دەرکرد بوو . بابم هاتبوو لە نەغەدە خانویەکی لە حەسارێکی گرتبوو دەیان بێ کار و کاسبی ما بووە . کویخا حەمەدی بالغچی زور پیاوانە مالەکەی بە عارەبەی خوی هینا بوە نەغەدە . ئاورد و دار وبار و شتی پێویستی بو هینا بوون . چاکە و پیاوەتی کویخا حەمەد م لە بیر ناچی و نەچوە . ئاموزایەکم هەبوو لە قەلاتان سەلت و کاردارێ خەلکی دەکرد . بیستبووم کە نسی هەمیە . ئیوارەیەك چومە قەلاتان و بە ئاموزاکم گوت : " هاتووم ئەو گەنمەی هەتە ودەچالت کردوە بە قەرز بمدەیەی . "

ـ قەرزی چی ؟ خودەزانم نامدەیەوە . سبەی چالەکە دەربێنە و بیبە .

برادەران گوتیان ئەو مەچوە . بەیانی چال دەردێنین و بە عارەبە بوت دەبەینەوە نەغەدە . راوەستا بووین قسەمان دەکرد، برایماغا هات . سلاوی کرد و گوتی : " هاتووم ئەو میوانی من بی "

ـ میوانی تۆنابم . رابردوویەکی خاوێنت نیە . مەسەلەی هە لبژاردنەلە بیرە .

ـ با وەدوای رابردووان نەکەوین . هاتووم میوانم بی .

زوری بو دا گرت. چەند برادەری حیزبیم برد و چووینە دیوە خانی ئاغا . کە چووین کاك سەعیدی کوری حاجی سەید حەسەنی کوتە قەلا لەوێ بوو . کاك سەعید کولکە مەلایەکی خەمر مقدس بوو هیچی نەدەزانی و لە بەر خاتری حاجی سەید حەسەن کردبوویانە مەلای قەلاتان و ئاغاکان بەمەلائیکەتیان دەزانی . لە گەل کاك سەعید چاك وخوشیمان کرد وسەعات حەوت کاتی بلاوبوونەوەی دەنگ و باس بوو .

گوتم : " برایماغا کوا رادیوت نیە؟ کاتی ئەخبارە . با بزانین دنیا چ باسە

ـ کاك سەعید تەشریفی لیرە یە .

ـ جا چبوو ؟ کاك سەعید بزەوەك ئێمەکوی دەداتێ .

ـ ئیجازە نادا
رووم لە کاک سەعید کرد وگوتم . " ئیجازە دە فەرمووی گوێ بدەمینە دەنگو باس ؟
ـ کاک کەریم حەرامە حەرام
ـ بۆ حەرامە ؟
ـ بۆی ناوی حەمرە و برایەوە.
ـ کاک سەعید خۆتۆ لەگەل عایز کاکەل قسان ناکەی . لە گەل من قسە دەکەی . پێم بلێ بۆ حەرامە تا منیش گوێ نەدەمێ .
ـ حەرامە . کافر دروستیان کردوە و ئێمەش موسلمانین !
ـ دە وا بفەرموو تا دەلیلە کە بزانین و ئێمەش قانیع بین . کە وام گوت کاک سەعید بێ حەو خوش بوو وای زانی بە راستیمە وبێدەنگ دەبم . گوتم کاک سەعید پێم نالێی ئەو کەوا و پانتولەی لە بەرت دان ونوێژیان پێوە دەکەی کێ دروستی کردوە ؟ . ئەو مەندیلەی لە سەرت هالاندوە کێ دروستی کردوە ؟ . ئەو شالەی لە پشتت بە ستوە وجولە کە شینیان کردوە کێ دروستی کردوە ؟ . تاکەی بەم قسانە وبەناوی ئیسلام خەلك گێژ دەکەن ؟ .
بەناوی حەلال وحەرام چاوی خەلك دە بەستن ؟
ـ لەگەل تۆ قسە ناکری . بێنن ئەغباری خۆتان بگرن .
رادیو هاتە دیوەخان و برایەلغا گوتی . " خوا وەتحەسینی لەچنگ کاک سەعید رزگار بووم . بەیانی برادەران چالە گەنمیان دەرهینا و بردم لە نەغەدە فروشتم.

## هێندێ بیرە وەری جور بە جور

برادەرانی لەکومیتەی نەغەدە هاوکاریان دەکرد بە تیکرایی هاوریی تیکوشەر. خەباتکێر، ئازا، جوامێر، بە دیسیپلین. بەلام لە نێو هەموان داکاحەمەدی ـ قادری کاحەمەدی سەروکانی، کاپیتان قادری جیگا و شوێنی تایبەتی هەبوو .
کاحەمەد تاقە کەسێك بوو لە کوماری دیموکراتی کوردستان مەالی قارەمانی پێ بە خشرا بوو . مثالاپەکی زوری لە سەر مارکسیزم هە بوو . ئەو ماوەیە کە پاش روخانی کوماری مەهاباد رای کرد بوو چوو بوە عیراق لە گەل کومونیستە کان پێوەندی گرتبوو

زور شت فیر بــبووله سەر خەباتی چینایەتی و نەتەوایەتی بۆ ی دا دەگرت . شاعیر بــوو شیعری دەگوت وچــەند شیعریکم لەشیعرەکانی کاحەمەدی رەحمەتی هەر لەبیر ماوەو بەیادی ئەولێرە دەیان هێنمەوە :

« کوردەهەستە ، پشت بەستە ، رامەوەستە ، توند بــرۆ
وەختی شیشە ، دامە نیشە ، دەستە ئەژنــوو رەنجــە رۆ

« گەرچــی مێژوو ونۆ دەنوسن میللەتی کوردی رەشید
من دەلێم کەمتر لەجوونەخان و ئاغا بــی درۆ
« نیشتمان دایکی مەبوو گایان وئاغا چــی نــەگــوت
ســۆزی گــەر دایکی بکەین بــێ شك دەلــێ ئەی دایــە رۆ
« گەر چــی خــوشی خانەجــەنگی خانــیوا بــە زیاد نەبــی
دوژمنی مــە شەو بیەارە و ئیمەنوستووین نیوە رۆ »

رۆژیك لەمــە هاباد رەحیمی سولتانیمیان تەلەفونــی کرد وگوتــی : « یا بــو خوت یا برادەریکی تر بنیرە ئەم شەو بێتەمەهاباد کاری پیویست هەیە » .
ماشینی عــەلی عــەجــەمــی دوکانداری سەروکانــی دەچوە سەروکانی . بۆکاك حەمەدم نووسی ، گیرمەبەهەرلەگەل ئەوماشینە وەرە بۆ ئیرە . زوری پێ نەچوو ماشین هاتەوەو کاحــەمەد تێدا . لەگەل چــەند برادەر راوەستا بووین و چاوەروانی ئەو بووم . کاحەمەد دابەزی و بەخیر هاتن ودەستی دەگیرفانی رو کرد حەوت تمەنــی هینا دەر و دای بەمن .

ــ ئــەوەچــیە کاحــەمەد ؟

ــ دار ونەدارم ئەوحەوت تمەنەیە . ئەوەشم بەناوی تو لە . . . . وەرگرتــوە ، جا ــ چــەندم لیرە رادەگری و چونم بەخیو دەکەی خوت دەزانی . پولەکەم لێ وەرگــرت . دەمزانــی دەچــێ کورج بەئارەقــی دەدا . گوتم بچۆ قاوەخانەی محەمەدی سوفی رەسوو . ئیستا دێم دەچینەوەمالــێ . کاحەمەد رویشت وگەراوە . گوتــی :

ــ ئەری تمەنیکم نادەیەی ؟

ــ بۆ چیتە تمەنیك؟

ــ گوتم نەوەك لەپیش وکانی عــەجمیك لەگوزمیەك هەلینگووم با پیم بێ . دەی قەی نا کا ، پێچەکەم لە بارمتەدادەنێم تا تۆدەبیتنەوە .

حەوت تمەنەکەم داوەو رویشت . پاشان چوینەمالی ئیمە تانمان خواردو گوتم :

ـ ئێستا بچۆ گاراژ . گیر مه به سوار به بچۆ هاباد . بچۆ ماله ره حیمی سولتانیان . بزانه چیان دەوێ . یاد داشتی بکه و به یانی وەرەوە .

کاحەمەد هەستا و رۆیشت . نیزیکەی سەعات پێنجی ئێواری براد مریک هات کوتی . "کاحەمەد ئەوە لە مەیخانەی سەرەوەی گاراژ ئارەقی دەخواتەوە ."
هەستام راست چوومە مەیخانە . پرسیم کاحەمەد لە کام دێوە ؟
پێیان نیشان دام . کە دەرگام کردەوە ئیستکانی ئارەقی بە دەستەوە بوو قسەی بۆ سی ماموستای ئازربایجانی دەکرد . کە چاوی بە من کەوت ئیستکانەکەی دانا . منیش زۆر بە توندی ئیستاشرکە وەبیرم دێنەوە خۆم سەر کونە دەکەم کوتم . "جا تۆنی بۆ پیاو دەبی ؟ وەدەرکەوتم . بە دەلاڵی گاراژم گوت کە ماشین هەبوو بۆمەها باد خەبەرم بدە پێ . چوومە وەمال . سەعات حەوت بوو لە گارازەوە هاتن کوتیان ماشین هەیە بۆ مەهاباد چووم سوار بووم و شەو چوومە مالی کاک رەحیم . شەو قسەکانمان کرد و بە یانی نان و چایمان دەخوارد لە دەرکە یان دا . کە دەرگایان کردەوە کاحەمەد وەژوور کەوت . بەخێر هاتن وکاحەمەد ئەوەچی بە چۆن هاتووی ؟ .
ـ کە تۆدەنگت دام هاتمە دەر . دوو نانم کڕین و بە پێیان ملی رێگام گرت و بەشەرگە دا ئێستا ئەوە دەگەمە ئێرە ".

کاحەمەد رەعینەکانی خۆیانی فێر دەکرد کە بێکار نەکەن . ئاغاکانی ماسەنی قینیان لێ دەبوو . قەت دەتەنی لە گیرفانی دا نە بوو . ئەگەر پولێکی هەبایە کورج دەیدا بە سندوقی حیزب . بە زەحمەت سالێ دەستە لیباسێکیان بۆ دەکری .

## مەولودنامە

من زۆر جار دەچوومە سەرو کانی . منداڵەکانی کاک ئەحمەد وەگرم ببون و بابیان دەیکوت . "منداڵەکان هامووهاتونە سەر دێنی تۆ و من بە شەم پێ بیانەوە نەماوە ."
جارێک ماڵە دەولەمەندێک مەولودیان کرد بوو من وکاحەمەدیشیان بانگ کرد تازە مەدرەسە دەهاتە سەرو کانی . کاحەمەد بە ماڵان دا دەگەڕا و تکای لە خەلک دەکرد کە منداڵان بنێرنە مەدرەسە . پێ یان بخوێنن . حاجی مەلای گوندی لە مەولود نامە دا دەستی کرد بە تەبلیغات دژی مەدرەسە و خوێندنی منداڵان .
خۆم پێ رانە گیرا . بەرپەرچی مەلام داوە وکوتم :

ــ ماموستا زور عەمیبە تو دژی خویندن قسە دەکەی . بوچی دە تانەوی کە لە کە مان هەر لە نەزانیدا بژین . ؟ هەر نە بیی لە جەنابی مەلای کویە دەرس وەر بگرن بەکەم کەس بوە کە کیژی خوی نارد وتە قوتابخان و بوی خویندەوە . چەند شیعری حاجی قادرم خویندەوە و توند بە سەر مەلا دا هاتم و داوام لە خەلك کرد کە منداڵان بنیرنە مەدرەسەو بخوینن .

لە نیو مامەشان هیندی قولە ئاغا بو راووروت تفەنگیان لەحکومەت وەر گرتبوو قاچاخچی یان دەگرتن و خەلکیان رووت دەکرد و رە گەل ژاندارم دەکەوتن و ببوونە جاشی حکومەت . رەسووی عبد الصمد و رەسووی خەرابە و رەحمانی شیلەجاران و هی تر . جاریك لە سەروکانی بووم رەسووی عبد الصمدی لە گەل سی نوکەری چەکدار ـ گە پشتەوی . تازە چەکی وەرگرتبوو دەستی کرد بوو بە راو وروت . کاك بایزی دەربکەش کە خزمی کاحەمەد و کابرایەکی کونە پەرستوزالم و نەزان و هیچ بوو لەوی میوان بو . رەسووی عبد الصمدی گوتی : " بریا لیرە م نە دیتبای جا خوت دەدیتەوە . تو بوچی هەموو ئاغای ئەم ولاتەت دەعازاب تاوە ؟ . نازانم تو چی ؟ .

ــ من هیچ نالیم . دەلیم مە بە بە نوکەری عەجەمان . چەك وەرمەگرە فەقیری کوردی پی رووت کەی .

ــ ئەوقسانەت لە بیر نە چی .

ــ قسەی زیادی مەکە . هەر ئیستا بانگ کەم لیرە پەتت لە ئەستو دەکەن .

ــ کاك ئەحمەد دەوەدەنگ هات و گوتی مام رەسوو تو میوانی و مەداوای کاری خوت کە وتووی کاك کەریم بوییەنابی کیشەی لەگەل بکەی .

لە سالەکانی حکومەتی مصدق دا زوربەی ئاغاکانی مامەش تایفەی قادری خویان بە لایەنگری حیزب دەزانی . پییان گوتبوون کە داوای مەدرەسە بکەن . داوایان کرد بوو زوربەی گوندەکانی لاجان مەدرەسەیان چوو بویە . ماموستاکان هەموو کورد بوون و سابلاخی . زوربەیان ئەندامی حیزب و لەوریا کرد نەوەی خەلك دا دەوریان هەبوو . ماموستایەکی سابلاخی بە ناوی صدیقی میزانی کچی کاك ئەحمەدی سەروکانی هەلگرت بیاتویەکی کەورە کە وتە دەست ئاغا کونە پەرستەکان . دژی حیزب دەست کرا بە تەبلیغات . لە هەموو گوند قوتابخانەکانیان داخست . بە تایبەت بو مالە کاحەمەد

بوو بە هوێ سەرکونە و براکانـی کا حە مەدیان لە گوندی دەرکرد و ناردیانـی گوندی بۆبە جێ لە سندووس . لە دیوە خانی ئاغایان باس هەر سەرکونەی کاحە مەد و دزی حیزب بوو . لە پێشدا وایان بلاوکرد بـووە کە من ئەو کارە م کردوە . بابی کیژەکە هاتە نەغـەدە و کە چاوی بە من کەوت گوتی " من سەر شۆر بووم ئابرووم چـوە . بەلام زۆر شوکر کە تو ئەو کارە ت نەکردوە ". ماوەیەکی زور کاری تەشکیلاتیمان لە لاجان شوشتنەوەی ئەم کارە بوو .

## ئارمحمانـی بە لە بان و پولـی تـوتن

تازە لە زیندان هاتبووینە دەر، ڕۆژێك لە چایخانەی مـە حمودی قاوە چـی دا دانیشتبووم دوو کابارای زەلا م وە ژوور کەوتن و لە قاوە چی یان پرسـی لەکاك کەریمـی حـسامـی دە گەڕێین . مە حمود هاتە لام گوتی . " ئەو دوو کابرایە کاریان بە تۆیە . با بچین بزانم چی یان دەوێ . هاتنە پێش و سلاویان کرد وگوتیان ئێمە خالعان لـــە گوندی( بە لەبان) ی نێو مامـە شان بوە . بارمان کردوە و چووینە گوندی( ئادە) . توتنمان هێنا بوە دوخانیە . ئێستا فروشراوە وکاك ئارمحمانی ئاغای بە لە بان دراوی توتنە کەی وەر گرتوە و بە شی ئێمە نادا .
— دراوی بە شی ئێوە چـە ندە ؟
— بە شی ئێمە چوار سەد تمەنە . دەلێ بە رتیلم داوە و قەرزدار بوون و لی ی کردووین بە هەشتی پاك و نوێ پیس، هیچمان نادا تـی ".
قاوە خانە پڕ بوو لە خەلك . گوێیان دا بوە قسـە کان . گوتم دا زە حمەت نە بێ هە ستە سەر پـێ . کابرا وەك چە لەکەیەك راست بـوە . گوتم . " توگەورە تری یا کاك ئارمحمان ؟ . تو بە هیزتری یا کاك ئارمحمان؟ .
— وەلا ئەگەر بە وێ قسێ بـێ دوو ئەوە ندە ی ئەو بە هیزم .
— دە ك داوە شێ ی . بۆ لە نیوە راستی شـە قام نایگری وە بەر شەقانی بدەی و پولـی خوتی لێ بستێنی . تاکەی ئیوە هیندە خوێری و بێ دە ستەلات دە بن؟ . ئیستا لە کوێ یـە ؟ "
ئەوە لە دوکانـی میرزا رەحمانـی مـە عروفیە .

هەستام لە گەڵ کابرا چووم بە دوکانی میرزا رەحمان . سلاوم کرد و چایە کیان هێنا بە کاك ئارەحمانم‌گوت : " دراوی‌توتنی ئەوەندە قیرانە بۆ نادەی؟ ژن و منداڵیان لە بەر هە تاو سوتاوە توتنی‌هەقی خۆیان نادەیەی ؟

ــ پێم قەرزدارن

کابرا گوتی : " هیچت پێ قەرزدار نیم . ئەگەر ماڵم باری کردوە هەموو حیسابیکت لێ گیراوەتەوە . " .

گوتم کاك ئارەحمان منیش‌رەعیەت بووم و ماڵم لە گوندی بوە . رەعیەت قەرزدار بێ ئاغا تا قەرزەکەی بەزیادیەوە لێ نەستێنی ناهێڵێ بروا . توش ئیستا بەشە دراوی خۆی بدە بەو ببرێتەوە .

ــ جا بە تۆچی خۆتو وەکیلی ئەوان نی ؟

ــ ئەوە قسەی زیادیە . لە بەر خاتری‌میرزا رەحمان هیچ ناڵێم. بەڵام دراوی کابرا باشە کە نەیگیریەوە . مەحمود حەلەب لەو بەرەوە هات وگوتی : بابم کاك ئارەحمان تا کەی ئەوەندە قیر و هەژارە دە روتینێنەوە . بۆ پولی کابرا نادەی ؟ بۆ خۆت‌سوك دەکەی؟ "

زانی تینی بۆ دێ گوتی . " لە گەڵ دوخانیە هێشتا حیسابم نەکردوە . سبەی پولی وەردەگرم . یا سبەی‌بێتە ئێرە لە کن میرزا رەحمان‌حیسابی لە گەڵ دەکەم " .

هەستام و پسولە یەکم بۆ حەمەدەمینی ئیمامی سندوقداری دوخانیە نووسی کە پولی توتنی ئەوکابرایە بگیرێتەوە و نەیدا بە کاك ئارەحمانی بەلەبانی " .

نوسراوە کەم نارد . لە وەلامدا نووسیبوویەوە کە ئارەحمانی بەلەبانی دوێنی حیسابی کردوە و تەواو دراوی‌وەرگرتوە و هیچی لە دوخانیاە نەماوە " .

پرسیم لە کوێ دەبێ ؟ .

گوتیان لە کاروانسەری سولتان دابەزیوە . یەك دوو برادەری گورج و گۆڵم بانگ‌کردن و گوتم بچنە دەرکی کاروانسەرای سولتان . ئەگەر ئارەحمانی بەلەبان هاتە دەر لێی‌دەن .

بۆ خۆشم چوومە حەسار و ئەگەر چووم نوکەرەکەی ئەسپی زین دەکرد . گوتی :

ــ چاك‌هاتووی‌ سەگباب‌خەریکە رابکا .

لە دەرکا راوەستام تا دێتە دەر . لە وکاتەدا ئاجودانی ژاندارمەری هات . سلاوی کرد و پرسی بۆ لیرە راوەستاوی ؟

ــ ئارەحمانی بەلەبان چوارسەد تمەنی لە سەرەچاوە رواتم بێتە دەر لێی‌بدەم و لێی ستێنم .

ـ بو له ژاندارمه شکایه تت نه کرد وه ؟ .
ـ ژاندارمه‌ی‌چی؟ بۆ‌خوم‌ئیستا بزانه چۆنی لێ ده ستینم ؟ .
ـ ئه‌و رو هیچم وه گیر نه که‌وتوه ده تمه‌ن‌دمیه ده چم لێ ی‌ده ستینم کیشه‌نن‌نا بـێ .
قسه‌که‌ی حیسابی بوو . ئاجودان پینج قرانیشی وه‌ر ده‌گرت . گوتم : " باشه بـه‌لام ده یێ ده تمه‌نیش‌له‌و بستینی . "
ـ ئۆکی هیچ ؟ . واته ئه‌و هه‌ر قسه‌ی لێ ناکری .
پـوریا ئاجودانی ژاندارمه چوه سه‌ر زوری بیێ نه چوو بانگی کردم : وه ره پوله‌که وه‌رگره " .
ـ نا یه‌م خوت بوم بێنه خواری
پوریا چوار سه‌د تمه‌نی هینا خوار وگوتی : " پازده تمه‌نم لی ئه‌ستانده‌وه به لام ـ که مه به شی ئه‌ووڕۆم ناکا . تونیێکه پازده تمه ن " . پوله‌که‌م دایه و ئه‌وی دیکه شـم داوه به خاوه نـی و پیم‌گوت به سه‌ر چیه‌ یکه مل بۆ زولم وزور رامه کیشن . "

## بـه ره و خبـتـیوا لـی لاوانـی جـیـهان

له به هاری سالی ١٣٣٢ حیزبـی ستوده‌ی ئیران بۆ یارمـه تی به حیزبی دیموکرات عبد الرحمانـی قاسملوی وه‌ک کادری سیاسی ناردمـه‌هاباد . له پیش‌قاسملودا کابرایه‌کـی دیکه‌ی نارد بوو کریکاری کارخانه‌ی چیت‌سازی تاران بوو . ئه‌و زور شاره‌زای تایبه تیه‌کانی ناوچه نه بوو، پاش‌چـه‌ند مانگ چو وه تاران ره‌حمانـی قاسملو هات .

ره حمانـی قاسملو کـێ بوو؟

عبد الرحمانـی قاسملوو کوری مـه‌مـه د ئاغای وسوق خه لکی ورمـی و باوکی یه‌کی له خاوه ن ملکه قورسه کانی ورمـێ و ده‌وروبـه ر بوو . مه مه د ئاغا به پیاویکی کورد ونیشتمان په‌روه‌ر ناسرا بوو . له سه‌ر ده‌مـی دیموکرات دا، ره‌حمانی قاسملوو له ورمـێ له گه‌ل لاوانـی فیرقه ی دیموکرات ده بـێ و پاش‌ته واوکردنـی خویندنـی نیونجـی ده چێته پاریس بۆخویندن . ئه‌وده م له مه جلیسان زور باسـی ئه‌وه ده کرا کــه مـه مـه د ئاغای وسوق کوره کانـی هه موو ناردونه ده‌ره‌وه بۆخویندن و تاقه کوردیکه

ئاوا بە کورەکانی دەخوێنێ . قاسملوو لە پاریس لەگەڵ ئەحمەدی برای دەست بە خوێندن دەکا و لەگەڵ هیندێ کوردی بەشەکانی تری کوردستانیش دەبێتە ئاشنا و لە ئاخردا لەگەڵ نورالدین زازا و چەند کوردێکی دیکە کومەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئورووپا پێک دینن . پاشان هەر دووک برای قاسملوو ( ئەحمەد و رەحمان ) دەبن بە ئەندامی حیزبی توودەی ئێران . ئێرەجی ئەسکەندەری دەچێتە پاریس و دەلێ کوردی هەر ولاتێک پێویستە لەگەڵ ریکخراوی خوێندکارانی ئەم ولاتە خەبات بکا . لە سەر بنج و بناخەی ئەم تێئوریە چلکنە کە گویا کورد ناشێ ریکخراو و حیزبی سەربە خۆی مارکسیستی یا خۆکومونیستی هەبێ ، ئەوانیش واتە قاسملووکان، بە پاشێک دەر دەکەن و یەکتی خوێندکاران کورد هەلدەوەشێننەوە . تا سالی ١٩٥٦ کە جارێکی تر هیندێ لاوی نیشتمانپەروەری کورد، کومەڵە دادەوەزرێننەوە . رەحمان و ئەحمەدی قاسملوو لە ئورووپا دەچنە نێو ریکخراوی خوێنکارانی ئێران) سەر بە حیزبی توودەی ئێران .
پاشان کە دەولەتی ئێران ئەوزی خوێندکاری لە قاسملوو دەبرێ حیزبی توودەی ئێران دەیهێنێتە چسکوسلواکی و لەوێ خوێندن درێژە پێدەدا . پاشان لە سالی ٥٢-٥٣ دا کە جولانەوەی دژی ئیمپریالیستی لە ئێران دا پەرەی دەگرت قاسملوو هاتبووە ئێران و لە تاران لە حیزبی توودەدا کاری دەکرد وهەتا ئەودەم کە وەک کادرێکی حیزبی توودە نەهاتبوە مەهاباد هیچ پیوەندیکی بە کوردستانەوە نەبوو.
سالی ١٩٦٠ لەگەڵ رەحمانی قاسملوو لە برلین لە کونگرەی کومەڵەی خوێندکارانی کوردا لە ئورووپا بەشدار بووین . کامران بەدرخانیش هاتبوو . لەگەڵ قاسملوو چاک و خوشی کرد و کە ناسی گوتی . " تو جارێک کومەڵەی خوێندکارانی کوردت تێکدا .
لە وەلام دا گوتی . میرم ئەوە من نەبووم کاکم بوو ".
دیارە قاسملوو باشتر لە کار و باری حیزبی دەزانی و لە شانەکانی حیزبی توودەدا کاری کرد بوو . بەلام ئەوەی باسی نەکرا بابەمەسەلەی کورد و یا نەتەوایەتی بوو.

لە مانگی جوزەردانی ١٣٣٢ ( ١٩٥٣ ) بو پێشوازی لە فیستیوالی چوارەمی لاوانی جیهان و بەشداری لە فیستیوالی لاوانی سەرانسەری ئێران لاوانی مەهاباد و دەور و بەر کوبوونەوەیەکی گەورە و ئاهەنگیان لە دەرەوەی شاری مەهاباد لە باخی میکائیل پێکهێنا . هەر ئەو روژە کومیتەی شاری مەهاباد بە بەشداری نووسەر و کاکسولتانی حاجی باغری تالاو

و كاك سولتانی حاجــی باقری‌تالاو له ماله میرزا که ریبی وه یمی کوبوونه وه‌ی‌هه‌بوو.
کاتیك لاوان بەرەو شوینی ئاهەنگ دەرون فەرماندەی‌لە شکر پولیك سەر باز بە سەروکا‌ـ
یه‌تـی سەر گورد رادپور سەروکی‌دژیان بو بلاوکردنی ئاهەنگی لازان دە نیری . تازه
دی ئاهەنگ دەستی بکا سەر بازگه‌ماروبان دەدەن ؟ تەقەیان لی دەکەن . قوتابیەك
به ناوی ح ـه سەنی رەحـەزانی وە بەر گولله دەکەوی‌و دە کوژری . یەك دوو کەس وەبەر
دەستی گروبان و سەربازان دەکەون و لی یان دەدەن . لاوانـی مـەهاباد تەرمـی
کوژراوه که و لاشه‌ی کوتراوی محه ممەدی رەوشەنفکر لە سەر دارە میت‌دادەنین و بـو
نیو شار دە گەرینه وه .
ئیمه له کوبوونه‌وه‌دا بووین ته قه هات . گوتمان تەقە لە لاوان‌کرا . مـن و رەحیمی
ره حیمی سولتانیان وه دەرکەوتین . لە پیش ستادی لە شکر کە پشتینه تەرمـه کان
له سەر شانی لاوان بوون و خەلك هەلمەشکوت بوو . من‌وعمولای ئیسحاقـی و رە حیمی
سولتانیان که وتینه پیش‌خوپیشاندان و دروشمه که بوو به وه ( موجـازاتـی قاتلین ) .
بە جاریك خەلکد میگوته‌وه . رویشتین تا چرا بەرق وگه راینه وه یه و مه بەسته کە لاشه‌ـ
کان به رینه پیش‌مـەدلیه . لە پیش‌مزگەوتـی هـەباساغا بە جاریك ئاژان و سەرباز
خوپیشاندانیان په لاماردا . له مناوەدا ئازایه تی‌ئامین ی کیژی حـه مـەدی مەولود
بەر چاو وجیگای سوپاس بوو . لە پیش‌مزگەوتی‌هەباساغا خوی وەبەر سەر نیزه ی سەربازان
دا کە دەمیانویست‌لە تە رمـه‌کان بدەن . بوو به راکردن و بلاوه . هیندی‌لە لاوان
تەرمـه کانیان‌دانەنا و هاتینه خوار تا بەر دەرکی ستاد . لەوی هیرمشەکە توند بـوو
میته کانیاه لی ئەستاندین ودەست‌کرا بە گرتنی برادەران و نیزیکەی حـه فتا کە س
گیران و بردیانین بو شارەوانـی ‌ـه له بەر دەرگای شارەوانی من به سەروکی شارەوانیم
گوت . " منیان بو هیناوەته ئیره . من خەلکی‌ته غـەدەم و ئیستا کە پشتووسه مه هاباد
وە پیشرخویان‌داوم ." گوتـی برو کەرکاری به تونـیه . ئیتر ماشین‌هەبوو بو نەغـه دە
سوار بووم و هاتمەوه نەغـەدە . لە مـە هاباد لاقاوی سکالا و ئیعتراز ریکخـرا .
نیزیکەی سەد کچ وژن چوونه تیلگرافخانه‌ی مـه هاباد و دانیشتن و تا ئازادی گیراوه
کان نه هاتنه دەر . لەنەغـەدە تیلگرافی سکالا و پشتیوانی لە لاوانـی‌مه هاباد مان
بـه سەدان کەس ئیمزا کرد و داوای سزا دانـی قاتله کانمان دەکرد .
دوو روژ دوای کە رانەوەم لە مـەهاباد کاك سولتانی‌حاجی باغر هاته نەغـەدە .

سولتاناغا لە راپەرینی وەرزیراتی بوکان و شاماتە دەوروبەرەبوو . ئەوپش گوندەکەی خۆی بە جێ هیشتبوو هاتبوە مەهاباد . پاش رووداوی مەهاباد ویستبوویان بیگرن . رای کردبوو هاتەنەغەدە . نیزیکەی دوو حەوتوو زۆر خۆشمان رابوارد . رۆژیك بریارمان دا کە بچینە شاری شنۆ وەمیوانی شیخ مارفبین . ئەز و کاك سولتان و مستەفای ئاغاجە جیە و سدیقی عەلائی سواری ئوتوبوس بووین و چووینە شنو . بەدوای ئیمەدا ژاندارمەری نەغەدە تەلیفونی کردبوو بۆ ژاندارمەی شنو کە نەهێلن لە شنو بمێنینەوە . کە یشتینە شنو و چووینە مالی شیخ مارف لەمال نەبوو . گوتمان لەدوای بنێرن بێتەوە میوانی هاتووین . چووینە موسافیرخانە و ناردمان گیلاسیان بۆ هینایین . خەریکی گیلاس‌خواردن بووین دوو ژاندارم پەیدا بوون . گوتیان هاتووین هەموو تان بێنە ژاندارمەری . هەستاین و چووینە ئیدارە . ئەفسەری ژاندارم بە خیر هاتنی کردین وگوتی : " ئاغای‌حاجی قەمەرمان پێ‌کراوە کە ئێوە تەشریف بەرن وناب‌ێ شەو لێرە بمێننەوە . "

ـ زۆر ئەسەریکی بێ جێ یە . ئێرە ئیرانە . ئێمەش بیگانە نین . بەتایبەت من هەوال دەری‌رۆژنامەم و کەس نەتوانێ پێشی هاتوو چوی‌من‌بگرێ . لەم چەقەوکیشە دا بوم ژاندارمە یەك هاتە ژوور . کە چاوی بە کاك سولتان کەوت قوت بوو .

= "ها ئاغای‌سولتانی شیخ ئاغایی ئەوە لیرە چدەکەی؟ کە یفت چۆنە ؟ "

کاك سولتان سەری‌هێناپە بن گوێ‌وگوتی : " کیشە مەکە بابرۆین . ئەوسە گیابە لە میاندوا بوو . ئاگای لەدەوسیەی میاندوا و هەمرای شاماتە هە یە . دەم گرن ئەویشم لێ زیندوو دەکەنەوە . دەست هەلگرە با برۆین . "

دام نواند . گوتم باشە بەلام ئیستا ماشین نیە چۆن‌برۆین؟ .

ـ تۆ ماشین پەیدا دەکەی . تکایە شەولیرە مەمێننەوە .

وەدەر کەوتینەو هاتینە کاراژ . بە عەولا سوار ـ م گوت ماشینیکم بۆ پەیدا کە تا نەغەدە . عەولا سوار هاورێ‌یەکی حیزبی و تیکۆشەر و خاوەن کاراژ بوو. کورج ماشینی هێنا و سوار بووین شەوهاتینە گوندی( لەواشلی ) میوانی میرزا ئەحمەدی زەناویری بووین . بەیانی بە سەیران‌هاتینەوە نەغەدە .

## سەفەرێکی سیزوویی

مانگی جوزەردانی ئەو ساڵە کومیتەی مەهاباد بڕیاری دا بە سەروکایەتی دەستەی نوێنەرایەتی لاوانی کوردستان، بۆ بەشداری لە ئاهەنگی فیستیواڵی لاوانی سەرانسەری ئێران دا بچمە تاران و لەوێشەوە بۆ بەشداری لە چوارەمین فیستیواڵی لاوانی جیهان دا بچمە بوخارێست پێتەختی کوماری دیموکراتیکی رومانی.

لە نەفەدەی مستەفای ئاغا سەجیدمان بە بەرپرسی کومیتەی سنەوپەر دیاری کرد خوا حافیزیم لە هاوڕێیان کرد و چومە مەهاباد. لە مەهاباد دەستەی نوێنەرا یەتی کە ٩ کەس بووین لە ماڵە غەنی بلوریان کۆبووینەوە و رەحمانی قاسملوهات بە بونەی سەفەرمەوە پیروز بایی لێکردین و گوتی:

ـ هیوا دارم سەفەرێکی سەرکەوتوانە بێ، ئەوپەری چالاکی و دیسیپلین نیشان بدەن. بەرپرسی دەستەی نوێنەرایەتی کاک کەریمی حسامی یە. بە ئامینی کیژی حەمەدی مەولودی گوت: پێویستە بە بێ ئیجازەی کاک کەریم بۆ هیچ کوێ نەچی و هەر لەگەڵ ئەو بی. کاک کەریم لە تارانە وە دەچێتە بوخارێست و ئیوەش دەگەڕێنەوە بەمنی گوت لە تاران هاوڕێ صادقی وەزیری دەبینی و رێنوێنی تان دەکا.

رۆژی ڕویشتنمان لە ترسی ئەوە نەوەك دژمان پێشمان بگری بە رنامەی ئاهەنگی بەڕێکردنمان تێك دا، بە بێدەنگی سواری ئوتوبوس بووین و چووینە تاران.

لە سەرانسەری ئێران لاوانی سەربە حیزبی تودە بۆ فیستیواڵی مەللی هاتبوونە تاران و بەرنامەی جوربەجوری باش و بە کەڵك ڕێکخرا بوون. ئێمەیان دا بە ماڵێکی تورك لە باکۆوە هاتبوون. چوار برا بوون و ئاسنگەر بوون. ماڵێکی گەورە، خێزانێکی باش و میوانگر و کومونیست. بێجگە لە مندالەکان هەموویان لە باکو گەورە ببوون. زمانیشیان تورکی ئەو بەر بوو.

رۆژی کردنەوەی ئاهەنگی فیستیواڵ لە تالاری سەعدی من بە ئەندامی دەستەی سەروکایەتی فیستیواڵی مەللی دیاری کرا بووم و شوێنی تایبەتیم بۆ دیاری کرا بوو.

کاتــی نوره وتاری‌من‌هات یه را نك‌وچوخه‌ی‌کورد ی هه‌ستام و له سه‌ر نه خوینه‌ده‌واری و بێ‌به شی لا وانی کورد ستان و سته‌ مه‌ی نه ته‌وایه تی و به شداری لا وانی کورد له خه باتی د ژی‌ئیمپریالیستی و جنایه ت‌وتاوانی له شکر و ژاندارم له کورد ستان قسه م کرد . باسی کوژرانی حــه سه‌نی‌ ره‌مــه‌زانیم کرد وگوتم کورد ستان تاقــه جیگای ئیرانه که له پێناوی ئاهه‌نگی فیستیوال دا خوێنی داوه . وتاری من به چه‌پله و بژی‌کورد وکورد ستان بــه گه رمــی پیشوازی‌لیّ‌کرا .

به‌لا م هه‌ر ئه‌ود ه‌م هه‌ستم به‌وه کرد من که باسی‌کورد ستان ده که‌م خه‌لك هه‌ر به سه هاباد و ده‌ور و به‌ر له کورد ستان ده گه ن . چونکه ده سته‌ی‌نوینه‌رایه تی لا وانی کرماشان و ســنه به جیا هاتبوون و هه‌ر باسی کورد یان‌نه ده کرد . باسی‌حیزبی دیمو کراتیش‌هه‌ر له‌گوریّدا نه بوو. له سه‌ر ئه‌ومــه سه له یــه له ماوه ی سه فه‌ر دا له‌بوخارست و موسکو وله تفلیس‌له گه‌ل شوورینیسته ئیرانیه‌کا ن کیشه‌م لــیّ په یدا بوو .

روژی هه وه‌لی مانگی گه لاویژی ١٣٣٢ ( ١٩٥٣ ) ده‌سته‌ی‌نوینه‌رایه‌تی لا وانــی ئیران له‌نێو بهریکرد نــی هه‌زاران لا وی‌کیژ وکور و خه‌لکی تر به ئوتو بووس به‌ره‌و جلفا سنوریّ به کیتی سوویتی که وتــه ریّ . خه به‌ر درا بوو به شاره کان له‌هه‌مووی خه‌لك هاتبوونه پێشوازی‌کاروان . شه‌و له ته‌وریز ماینه‌وه و به یانــی نیزیك نیوه رو گه یشتینه سنوور و له جلفا له پرد په رینه وه‌و گه یشتینه به کیتی سوویتی . له جلفا شیرنــی ومیوه یان- هینا و پاش‌چه سانه‌وه سواری قــه تار بووین بو ئیره وان . له ئیره‌وان هه‌زاران که‌س هاتبوونه پیشوازی‌ومه وه‌میوانــی کومسومولی‌ئه‌رمــه نستان بووین . به یانی دیسان به قه‌تار که وتینه ریّ و دوای‌نیوه رو که یشتینه باتوم . شاریّکی سه‌ر ده‌ریا گه‌رم شه‌دار وجوان . له‌وێوه سواری پاپور بووین‌بوچــی و سوخوم و یالتا . به داخه‌وه یاد دا شتی روژانه و ناوی شوێن‌وسه‌یرانگا و چاو پیکه وتن و ئه‌وانه‌م که نووسیبوونه‌وه له‌گه‌رانه‌وه دا سه‌ریان تیدا چوو هه‌ر ئه‌وه‌نده ی له بیرم ماون لیره دا ده یانگیرمــه‌وه .

جیهانگیری ئه‌فکاری سه‌روکی ده سته‌ی‌نوینه‌رایه تی لا وانــی ئیران له ( یالتا ) گه یشته ئیمه . له‌یالتاوه سوار پاپور بووین و به‌ره و له نگه‌رگای ( کوستانزا ) له رومانــی که وتینه ریّ . سه فه‌ری‌چــه‌ند شه‌وورۆژی‌ده‌ریاش‌خوشی و ناخوشی خوێ‌هه‌یه .

له کوستانزا پیشوازیه‌کی گه رم مان‌لیکرا و سواری قه تار بووین بو بوخارست .
بیّ ته ختی رومانی و شوێنی فیستیوالی‌چواره مــی لا وانی‌جیهــان . له بوخارست‌جیگا و

شوێنمان بۆ د یاریکرا . بەرنامەی ئاهەنگی فیستیوال و چاو پێکەوتنی دەستەی نوێنەرا یە تـی لا وانی ولاتانی دیکە و بەرنامەیخواردن و هاتوچۆمان بۆ دیاریکرا و هەر یەکە نوسخەیەکمان درایە . ڕوژێکە فیستیوال دەست پێ دەکرا من جلی کوردیم لە بەر کرد بو یەك دوو فارسکەگویا حیزبیش بوون، گوتیان ئێمە هەموو ئیرانیین و ئەم جلەیتو مانای جیاوازییەدا و خۆت بە جیا دەزانی . لێمان بوو بە کیشە وجیهانگیریئەفکاریهات گوتی : "هاوڕێمان نوێنەری لا وانی کوردە . پێویستە جلی میللی خۆی لە بەربکا . ئێوە هەقتان نیە لەوبارە وەرەخنە بگرن ." پاشان بە منی گوت : "تکایە چونـی دەتوانی بـو ناساندنی میللەتی کورد کار بکە . بەرنامەت بو د ادەنیم کە لە رادیو بوخارست بـە کوردی قسە بکەی . بۆ هەموو چاو پێکەوتنێك لە گەل لا وانی ولا تانی تر لەگەل ئێمە دەبی و بە جلی کوردیە وە ."

لە بوخارستلەگەل دەستەینوێنەرایەتی لا وانـیعیراق بووم ئاشنا . دوکتور نە نەزیهە دیلمی ، دارا رشید جودەت، رەئوف مەعروف و هی تر . رەئوف مەعروف لە سلێمانـی ئاد ریسی کتێبفروشی (گەلاوێژ) ی داسێ و بریارماندا نامە بو یەکتر بنوسین . کە چی سالی ١٩٥٨ کە چوومە سولەیمانـی، چومە کتێبخانە کە . پرسیم کاك ــ رەئوف مەعروفم دەوی . گوتی : "فەرموو خۆمم . لای وابوو یاریکی زورمهێناوە و کتێب دەکرم . گوتم من کەریمی حسامیــم لە بوخارست پێکەوە بووین وئادریست دا بوو مێ ویستمەلاویکت لێ بکەم ".

ــ ئا . . . عەفووم بکە . . من نە بووم ــ من نە چوومە ئیوروپا ". !

چاوم بەهەژاری شاعیر کەوت . باسی ولاتمانکرد . برپاریدا کە لەگەل ئێمە بێتەوە ئیران . من بە جیهانگیریئەفکاریمگوت وئەویشلە گەل لا وانـی یەکیتی سوویت باسی کرد بوو کە هەژار لەگەل ئێمە بگەڕێتەوە . پاشان نازانم چـون بوو لە گەلمان نە هاتـە وە .

لە بوخارستداوایانکرد لەرادیو وتاریك بخوێنمەوە . وتارەکەم لە بارەی وەزعی فیستیوال و پێشکەوتنی رومانی و بێ بەشی گەلی کورد و بە تایبەت لا وان بە فارسی نوسیبو برادەریکی ئیرانی "ناظمی" کە لەوی دەیخوێند و ناسیاریقاسملوو بوو، قاسملوو نامەی بۆنوسیبوو، وتارەکەیکرد بوو بە رومانی . من بە کوردی وتارەکەم لە رادیوخویند وە و بـە رومانیش وەرگیراوەکەی بلاوکرایـە وە .

ڕوژێك لە بوخارستچوو بووینە موزە . لە دەفتەری یادداشتی موزە بە کوردی دەم

نووسی . دوو کەس لە ئێرانیەکان کە دیتیان من شتێک دەنووسم گوتیان : " رەفیق مەسئولی ئێمەنووسیوە ئیتر پێویست ناکا تو بنووسی . "
من بەکوردی دەنووسم
ــ یانی چی ؟ مەگەر ئێمە هەموو ئێرانی نین ؟
ــ ئەگەر هەموو ئێرانیین وەرە بزانم دەزانی من چیم نووسیوە ؟ .
رۆژی ٢٨ ی گەلاوێژ رادیۆ خەبەری دا کە شای ئێران رای کرد وە و لە ئێران داوای رژیمی جەمهوری دەکری . بوو بەشایی و لوغان و دەستەی نوینەرایەتی ولاتانی جیاواز بۆ پیروز بایی دەهاتنە لای ئێمە . بە پەلە داوامان کرد کە بگەرێینەوە . رۆژی ٢٨ ی مانگ سواری قەتار بووین ، بە ریگای سوویێتدا بەرەو ئێران کەوتینە رێ .
لە بوخارێست بەهەلکەوتونی کوردیك بووم خەلکی سنە و لەکاتی شەری یەکەمی جیهانی کەوتبوە رومانی وگیرسا بووە . بەلام لەویش هەر پینەچی بوو . من هەوەل جار بوو دەچوومە ئوروپا . هێندی شتم چاو پێ دەکەوت پێم سەیر و تەنانەت عەیبیش بوو . وەك شالواری دەلنگ کورت ، یا بەستەنی خواردن لە سەر شەقام ، یا ماچ کردنی کیژ وکور لە شەقام ولەبەر چاوی خەلك .
لەکاتی رۆیشتن دا بۆ بوخارێست چەندە شاد بووین لەگەرانەوە دا سەد ئەوەندە . خەبەرمان زانیبوو شا رای کرد وە و چۆتە ئیتالیا . کە پشتبووینە مولداوی لە پر رادیوی قەتار راگەیاند خەبەریکی گرینگ . قوتبووین وگوێمان هەڵخست . گوتی لە ئێران کودیتا بووە . مصدق گیراوە . ریکخراوەکانی حیزبی تودە کەوتوونە بەر پەلامار و هەزاران کەس حەپس کراوە . بە جاریك توزی خەم وخەفەت باری . شاییمان لێ بوو بە شین .
قەتار رێگای خۆی بری و شەوچووینە کی یەف . رۆژی دوایی چووینەمۆسکو . لە مۆسکو کۆیان کردینەوە و گوتیان : " وەزع لە ئێران ئالوزە . شا گەراوە تەوە . ریکخراوە دیموکراتیەکان کەوتوونە بەر پەلامار . ئەوکەسانەی نایانەوی بچنەوە ئێران و دەخوازن بچنە رۆژئاوا لێرە وە دەیان نێرین . ئەوانەی دەیانەوی زوو بچنەوە ئێران دیسان راست بۆ تارانیان دەنێرینەوە . "
دیار بوو جیایان کرد بووینە . ئەوانەی حیزبی نە بوون سواری فروکەیان کرد بوون و راست بۆتاران . ئێمە ٩ کەس ما بووینە وە . بۆم دەرکەوت ئەفرادی ئەوتوهاتبوونە فیستیوال کە نەك هەر پێشکەوتوو نە بوون بەلکوو کونەپەرستوخەراپیش بوون .

بەکیکی ئیسفەهانی تەختە نەرد و شەترنجێکی کە لاوانی سنە ناردبوویان بۆ فیستیوال و شتێکی عەنتیکە و نەیاب بوو، دزیووی ئەیدا بوو بە کومیتەی فیستیوالی لاوانی جیهان . ئەوانەی مابنەوە لە موسکو گەلێک جێگای جوانیان پێ نیشان داین . چووینە موزەی کرملین، موزەی دیاریە کانی ستالین، موزەی جل و بەرگی ژنانی پاشاکانی روسیا، باخی وەحشی موسکو، کارخانەی ماشین سازی و شوێنی دیکە . لە موسکو داوایان کرد کە لە رادیو قسە بکەم . وتاریکم لە سەر وەزعی کوردستان، دواکەوتوویی بێ بەشی و نەخوێندەواری و سیاسەتی زولم و زوریرێژیە کانی ئیران، خوێندەوە . باسی ئەو شتانەم کرد کە لە یەکیتی سوڤیەت دیتوو مانە . روژی دوایی پاکە تێکیان بو هینام ٢٧٠ روبلی تیدا بوو .

جیهانگیری ئەفکاری لە موسکو گوتی : " رەفیق تو لە کوردستان زور ناسراوی . وەزعی تو لە ئیران باش نیە . ئەگەر دە خوازی لیرە بمینەوە بخوێنە .

گوتم : " لەم وەزعە دژوارە دا لیرەنامێنمەوە . دەگەرێمەوە بو ئیران . لە موسکو بە قەتار بردیانین بۆ ستالین گراد . دوو روژ لە ستالین گراد بووین . ویرانی شار شوێنی شەر وەکە ماروو دانی لە شکری فاشیزم و کارخانەی تەراکتور سازی ستالین گرادمان بینی . لە ستالین گرادەوە سواری پاپور بووین، بە وولگا دا تا بەندی وولگا دون کە تێکەلّ کرا وە تەوە . ئەوەی لە بیرم مابێ پاپور لە هەشت حەوز وە سەر دەکەوێ و لەچواران دێتە و خوار و دەچێتەوە نیو چەمی دون . وا دروست کراوە پاپور دەچێتە نیو حەوزی یەکەم . ئەو تومانیک دەرگای حەوزەکە دادەخرێ و دەرگای پیشەوەی دەکرێتەوە و ئاو لە حەوزی پیشەوە دێتە نێو ئەم حەوزە کە پاپوری تیدایە . بە هەشت دەقیقە پر دەبێ . کە پر بوو پاپور سەر دەکەوێ و دەگاتە بەرامبەر حەوزی پیشوو . دیسان دەرگا لە پشتەوە قەپات دەبێ و دەرگای پیشەوە دەکرێتەوە و پاپور رەسەر دەکەوێ . بەم شیوە لە هەشت حەوز دەچیتە سەر و پاشان دیتەوە خوار و بە چەمی دون دا دەروا بو روستوف .

لە روستوف سواری قەتار بووین بۆ شاری گورکی . ئەم شارەی کەلینینی سەزن لێ ی لە دایک بووە . روژێک لەوێ بووین و پاشان چووینە تفلیس . لە تفلیس من جلی کورد یم لە بەر کرد . دوو کوردی تفلیس کە ماموستا بوون هاتنە لام و بردیانم بۆ مالی خویان و چەند کوردی دیکەم لێ هالان . بەلام بە داخەوە زور کەم لیکتر حالی دەبووین .

ئیوارەیک بە قەتار لە تفلیسەوە کە وتینە رێ لای بەیانی بوو کە یشتینە باکو بێ تەختی

ئازربایجانی سوویتی . تالای ئیواره له باکۆگیرابانین . هیندێ دیاری و شتمان کری من داوامکرد که کوردە ئیرانیەکان ببینم . گوتیان . " له باکۆنین و چوونه سەرەخستی دوای نیوه رو سواری پاپور بووین به دەریای قەزوین دا بەرەو بەندەر پەهلەوی .

## که پشتنه وەی ولاتو هەلویستی کوردیتا چی بان

شەوله بەر شەپولی بەحر و ئالوزی تەمانتواتی بروێن و لەنێو دەریادا ماینەوە . پاپوری ٧٠ هەزار تۆنــی وەك پێشکه له سەر ئاو جولانەی دەکرد . هەموو دەرشانەوە . هیچ نە دە خورا . کاپیتان رایگەیاند که ناتوانین بروێن . بەیانی که هەستاین چەند کەسی نەجات هاتبوون و لە دەور وبەری ئێمە راوەستا بوون . بەیانی رویشتین و لای ئیواری گه یشتینه بەندەر پەهلەوی .

له لەنگەرگا سەر بازچاوە روانیان دەکرد . یەك یەك که دابەزین پاسپورتـــە کانیان لێ وەرگرتین . پاشان بردیانین بۆ فەرماندار ی نیزامــی . دەژوریکیان کرد ین و یەك یەك بانگیان دەکردین له پیش دا سەر و سمیلیان بەمە کینە دەتاشین و هەر کەس بە گوێرەی شانسی رێکیان لێ دەدا ین و دە ژوورەکیان دەکردینەوە . هــەرچی پێمان بوو لەدیاری و لیباس و پول ونوسراوه لێیان دەستاندین و لە وێ کۆیان دە ــ کردەوە . که نۆرەی من هات فەرماندار ی نیزامی وەك لە بیرم بێ سەرهەنگ نەسیری بوو دوو زللەی لێ دام وگوتــی . " رەفته بودی ملا مسته فارا بیاوری ؟ " . بەو ەندەی من رزگار بووم . یەك دوو گورانی بیژمان لەگەل بوون . سەریان تاشی بوون لێیان دا بوون پاشان هێنا بوویانن کە گورانی بۆسەر بازان بلێن . بێجگە لەوانە جنیو لا تاو بە ژنەکانی لەگەل مان بوون باسی ناکرێ . هەموویان تا روژ له ژوریك کرد بووین بێ نان وئاو وبــێ سیغار . جا لەم حاله دا یەك له خانمەکان دەیگوت . " رفقا اعتراض کنید " .

بە یانی روت و برسی و سەر تاشراو سواری کامیونی ئەرتەشیان کردین و بۆ رەشت . لەوێ بردیانینه سەر بازخانه و دە ژوریکیان کردین . برسیەتی و بە تایبەت بێ سیغاری هیرشی هێنا بوو . من هاتمه دەر و لەوکاتەدا سەرهەنگیك تێ دەپەری . بانگم کرد . گوتم . " جەنابی سەرهەنگ ئێمە ئیرانین . بە ئیجازەی دەولەتی وەخت چووینه فیستیوال . پاترخه بەری کوردیتا خۆمان گه راوینه وە . ئیستا دوو روژه بێ نان و ئاو وسیغار ئیمەیا

راگرتوه وهیچیان‌نەد اوُمنی . د ووسەر بازی‌بانگ‌کرد وگوتی برون : " نان و د ووسەوەتە ترێ‌و د وو بوخچە سیغاریان بۆ بکرن و زوو بویان‌بینن . "
لەوکات‌ەدا من قسەم لە گەل سەرهەنگ دەکرد، سەروانیکی ئەرتەشی هات . گوتی
ــ تۆ کورد ی ؟
ــ بەلی کورد م
ــ منیش‌کورد م و خەلکی مەهاباد م . ئاخر تۆ چیتلە ئوروپا دابوو .
ــ پێم‌وابوو دە نیوی‌نان و پێخورمان بۆ بینن . جا وە ختی ئەو پرسیارە یە ؟
بە سەر بازە کانی‌گوت زوو برون وەرنەوە . زوری پێ نە چوو نان و د وو سەوەتە ترێ و د وو بوخچە سیغار هاتن . دەستم کرد بە دابەشکرد ن . بە جاریك( بزی‌کورد ) سالونی پر کرد . لە وێ‌سواری کامیونانیان کردین و بۆ تاران . ئیواری کە یشتینە تاران و بردیانین‌بۆ فەرماند اری‌نیزامی . یەك یەك ناو نیشانیان دە پرسین و لیکیان جیا دە کردینەوە . ئیمە ٥ ٤ کەسیان برد بۆ شوینیکی دیکە . پاش‌د وو شەووروژان بە یانیەك د وو ئەفسەر و گرویان هاتن . گوتیان : " ئەوانەی ناویان دە خوینینەوە ئازادن . بێن ئیلتزام بدەن کە لە تاران نە چنە دەر ".
من نە فەری ٣٤ ی بووم بانگیان کرد م . چووم نوسیم کە بەبێ ئیجازەی فەرماندار نیزامی لە تاران ناچمە دەر . وەك سلقی رووت بە تای‌کراسیك و شالواریك سەر تاشراو وە دەر کەوتم . بچمە کوێ؟ چی بکە م؟ کەس‌نا ناسم قرانیکم پێ‌نیە ناوێرم هیچ لە کەس بپرسم . رەسمیان لە روژنامەکان دا چاپکرد ووین سەرو سمیلمان تاشراوە .
بسێ بەر نامە دە سەراسەوە، لە شەقامی سەعدی گوێم لە دەنگیکی ناسك بوو بە ناوی ( رەفیق . . . رە فیق . . ) بانگ‌دەکا . نەم وێرا ئاور بدەمەوە . پاشرچەند هەنگاو لە پشتەوە باسکی‌گرتم وگوتی : " رەفیق من با شما هستم ) . واتە لە گەل تومە . ئاورم داوەو گوتم : " من تونانا‌سم . بیگومان بە هەلە چووی ".
ــ نا بە هەلە نە چووم . تۆ ئەو رەفیقی کوردی لە فیستیوالی میللی دا لە هەیئەتی رەئیسە بووی . وتارتدا . جلی کوردیت لە بە ر بوو . چوویە بوخارست . بێ شەرە فانەسە ریشیان تاشیون ."
نیشانە کانی راست‌بوون . گوتم : راستە . بەلام وای‌لێ هاتوە مروف ناوێری لا ی کەس‌قسە بکا .

ــ ئیستا بۆ کوێ دەچی ؟ . من خوێنکارێکی ئیسفەهانیم. لێرە دەخوێنم . یەکێ دیکەم لەگەڵە . دەتوانی بێ بە مزلەکەی ئێمە .

ــ سوپاس . دەمەوێ بچمە ماڵە عەلی قازی. بەلام ئادرێسەکەم نە ماوە و شارەزاش نیم .

ــ من بە ماڵەکەیان دەزانم . با پێکەوە بچین . پاشان دەچین کراس و شالوارت بۆ دەکڕم .

چووینە ماڵەکوڕەکەی. گوتیان لێرە نەماوە چوتە وە مەهاباد . گوتی :

ــ کە وایە با بچینە مزلەکەی من . جێگای تۆ دەبێ . ژوورەکمان گەورەیە .

ــ نا . دەچمە موسافیرخانەی فیردەوس. رەنگە کوڕەکانی مەهابادی لە وێ بن .

ــ کە وایە با هێندێک پارە بدەمێ . رەنگە هەر ئەو کراسە شەت هەبێ .

ــ پولم ناوێ . لە وانەیە مەهابادیەکان بەدوزمەوە لە وان وەر دەگرم .

ــ من پولم هەیە . تازە ۱۰۰ تمەنیان بۆ ناردووم . با ئادرێس ماڵەکەم بنووسم، کاتێک ویستت وەرە لای ئێمە . حەفتا تمەنی دەرهێناو دایمێ . پولەکەم لێ وەرگرت و ئادرێسەکەم یادداشت کرد و قەلەمێکی دامێ و لێک جیا بووینە وە . چوومە موسافیرخانەی فیردەوس . کە چووم سولیمانی موعینی و مستەفای ئیسحاقی و ئەحمەدی قازیحاجیابات و چەند کەسی تر لە وێ بوون . ماوەیەک دانیشتین . دیتم لەوە دەترسین کە لە گەل من بیان بینن . مەسەلەی گەورەش ئەوە بوو دەستگرا بوو و بەرەخنە لە حیزبی تودە . سولیمان گوتی با وەدەرکەوین . وەدەرکەوتین چووین نانمان خوارد . پاشان سولیمان گوتی : "من سدیقی ئەنجیری دەبینم . پێی دەڵێم کە ئازاد کراوی . سەعات حەوتی ئێواری لێرە یەکتر دەبینینەوە . چل تمەنی دامێ و لێک جیا بووینەوە . چوومە دوکانی ئەو برا تورکە ئاسنگەرە کە پێش رۆیشتنم لەماڵی ئەوان میوان بووم . کە دیتیانم گەشکە بوون . ماچ و چاک و خۆشیە کەی کەرم . کوڕ ج منداڵێک حەوت هەشت ساڵەیان لە گەل ناردمە وە . گوتیان بۆهیچ کوێ ناچی . وەتاغی تۆ هەر بەتاڵە و جێگای خۆتە و زۆر کەم وەدەر کەوە .

کە چووینە ماڵەکەیان دایکی وژنەکان بە پیرمەوە هاتن و کە لێک چاک و چوونی و بەخێر هاتن . چوومە وە ژوورەکەی خۆم، تاوێک راکشام و هەستام بۆلای جێ ژوان لە گەل سولیمان رۆیشتم . چووین لە چایخانەیەک دانیشتین . کراس و لیباسی ژێرەوەی بۆ کڕیبوم .

باسی وەزعی مەهابادم لێ پرسی . گوتی : "کەس لە شار نەماوە ، هیندێك چوون بۆعیراق . هیندێك لە نێو مەنگوران خۆیان شاردوەتەوە . هیندێك هاتوونە تاران و ئیستا ئێرە پڕە لە مەهابادی . ناو وئادرێسی کابرایەکی پێ بوو لە ئیدارەیەکی فێر- کردن وعاملاندن . گوتی : "کاك سدیق گوتوویە بچێیتە لای ئەو کابرایە . پاشان خۆشمان یەکتر دەبینین .

ئادرێسەکەم وەرگرت و ئادرێسی ماڵەکەی خۆم دا بە سولیمان و بریارمان دا هەمو رۆژێك لەم شوێنە یەکتر ببینینەوە . شەوچووسەوە ماڵە برا تورکی بە شەرەف و ئینسان . هەموویان لەماڵ بوون . تا نیوە شەو باسی فیستیوال و ریگا و چونیەتی سەفەرم بۆ گیرانەوە . پرسیاری جور بە جوریان دەکرد . بیر ورای جور بە جور لە سەر وەزعی ئیران دەربردەبرا . گوتیان ئێرە ماڵی خوتە . ناتوانی بچیەوە کوردستان . لێرە بە و بە ماڵی خۆتی بزانە .

بە یانی چووم کابرام دیتەوە . هیچی پێ نە بوو . گوتی : "جاری هەر لەوماڵە بمینەوە . سی تمەن پولی داسێ . گوتی پاشان سدیق دەبینی و لە بارەی وەزعی کوردستان لە گەڵ ئەو تەگبیر بکەن ."

چومە بازار ئەسبابی ریش تاشین و فرچە و خاولە و شتی پێویستم کرین و چووسەوە ماڵ حەمامم کرد وچاوە روان بووم زوو تووکی سەرم بێتەوە . روژانە روژنامەکانی تارانم دەکری و پر بوون لە دوزینەوەی ریکخراوەکانی حیزبی تودە و پەشیمان بوونە و شتی ناخونرو داخدار . روژێك لە سەر قەراری پیشوو لە گەڵ کاك سدیقی ئەنجیری و سولیمان یەکترمان دیت . باسی وەزعی خەبات و دوزینەوەی ریکخراوەکانی حیزبی تودە هاتە گوڕی . گوتم : "ئەوهەمموو دوزینە وەی شانە و ریکخراوەکان وگرتنی ئەندامانی حیزب شتیکی هەلکە وت نیە . پولیس خۆی خزاندە نێو حیزب.
کاك سدیق توورە بوو : "هاورێ چون قسەی وا دەکەی ؟ . باسەکەمان درێژەی هەبوو . سدیق تورە بوو رویشت و بە جێی هێشتم .

رۆژێك سولیمان گوتی : "میرزا خەلیلی خوسرەوی لێرە یە و دەخوازی بتبینی . جیگایەکی پێ گوتبووم چومە ئەوێ . کە چووم میرزا خەلیل بە رەحەتیبێ چاوەروان بو . پاش یەکتر ماچ کردن گوتی : "با بڕۆین .
ــ بۆکوی ؟

ــ تۆ وەرە کارت نە بـێ . وەزع خـە راپە ، دە بێ بچینە شوێنێ ئەوتۆ کە نە مان ناسن .
ــ جا لە تاران کێ ئێمە دە ناسێ ؟
ــ نا وانیە . پیاوناتێ ئیحتیات لە دەست بدا . با برۆین .
لە شەقامـی ناسر خوسرەو لە دەرگایەك چووینە ژوور . سەر کەوتین بۆ قاتی دووەم . چـ
چایخانە یە کی کە ورە پر لە خەلك هەر زمە ی دە هات . پر لە دووکەڵی قەلیان و سیغار
لەقوژبنێك دانیشتین و گوتـی . " ئێرە جێکای چاکە . کەس نایە نە ئێرە . "
قاوە چـی دوو چای لە پێش دانان . داوای قە لیانم کرد . لە پر میرزا خەلیل گوتی :
ــ ئەوکابرایە وا لە وێ دانیشتوە دوێنی لێرە نە بوو . شاپکەی لە سەرە ، زوویش دەروانێ .
ــ هیچ نیە . رەنگە ئەویش وەك ئێمە خۆی شارد بێتە وە .
ــ نا ئەوانە بێکار نین . دنیا پاکی بۆتە پولیس . ریکخراوەکانی حیزبی کە شف دەکرێن دە بـێ وریا بین . "
تا درەنگ لەوێ دانیشتین . کە دەر چووین گوتـی . " ئێرەمان جێ ژوان بێ . لێرە ئەوەندە مانە یەکتر دە بینینەوە . " . من چوومـە وەمال . کیژێکی جوانی شوخـی بالا بەرز دەرگای کردە وە . چوومـە ژوور، دایك وەك رۆژان بە گەرمـی بە خیر هاتنی کردمە وە و گوتی
ــ نانت خواردوە ؟
ــ بە لێ خواردوومـە .
ــ چۆن وادە بـێ ؟ بۆ لە دەرەوە نان دە خۆی ؟ لێرە نان دروست دە کەین . ئـە م دختر خانمە ش میوانی تازە یە . لێرە دە بـێ ، یە کتر بناسن .
کیژە جوان دەستی لە دەستی نام و گوتـی . " بە دیتنت خۆشحال بووم . باسی ــ تۆیان بۆ کردم . چەندەم پێ خۆشبوو لە گەل تۆ بوومە هاو مزل . من خەلکی ( ساری ) م کیژی سەروکی دادگوستەریم . ناوم لە ریکخراوێکی حیزبی تودە دا دەر کەوتوە . رام کردوە هاتوومە ئێرە . داویانم بەومالە . زور خیزانێکی باشن . تەواوتودە یین . دە بـێ بـە وردی باسی فیستیوالم بۆ بکێریـە وە . رۆژنامـە کانم دە خوێندەوە . زانیم لە گەرانەوەدا چی یان لێ کردوون . با بچینە ژوورەکەی من . کتیبی باشم پێن ئەگەر بخوێنیەوە . "
چووینە ژوورەکەی ئەو روو بە رووی دیوەکەی من بوو . شیرنی هینا . هاومزلە کـە م نەك هەر جوان بوو بە لکوو خوێندەوار و روو کراوە و خۆش قسە بوو . لای ئێوار گوتـی .
ــ با بچینە دەر . خۆتۆ کارت نـیە ؟
ــ کارم نـیە . بەلام ئێستا بۆ خوێندنەوە دە رفـە تە . وەخت بە خۆرایی دە چـێ .

وەدەرکەوتین . تاویك سووراینەوە گوتم : " من ئەمنێ بچمە نیو شار . کارم هەیە

ـ زوو وەرە وە . هیچت ناوێ بوت بکرم ؟

ـ سوپاس ، هیچم ناوێ . لە وانەیە زوو بیمە وە .

چوومە موسافیر خانە و لە گەل برادەران دانیشتین و ئیتر رەخنە لە رێبە رایەتی ـ حیزبی تودە و باسی کە شەف بوونی ڕێکخراوەکانی حیزب و لێکدانەوەی جۆر بە جۆر ببوە توقلی مەجلیس و دانیشتن . لەوکاتەدا ( جزوەی ٢٨ ی گەلاویژ) بلاو کرا بووە . گەلێك شیر و ڕێوی یان تێدا هوند بـوو وە وفەلسەفەیان سازکرد بوو کە تەنیا ساویلکە و خاوەن سە سلەحەت توانایان هەبوو بڕوای پێ بکەن . کاك سدیقی ئەنجیری دیفاعی لێ دەکرد و منیش پێ ی قانیع نە بووم . زور جار لێمان دەبوو بە موناقەشە . کاك سدیق هات بردمیە ماڵەکەی خوێ، زور جار لە ماڵی ئەوان دا دەنیشتین و سولیمانیش هەر لە گەڵمان دەبوو .

پاش کودیتای ئیمپریالیستی ٢٨ ی گەلاویژ ئاغا و سەرەك عەشیرەتی کورد هاتبونە تاران بۆ پیروز بایی لە شا و بە جلی کورد یەوە دە سووڕانەوە لایان وابوو فەتحیان کردوە . ڕوژێك بە بەر دەرکی موسافیر خانەی ( گیلانی نەو) دا تێ دە پەریم دیتم ئاغا مەنگوڕەکانی لای مەهاباد هەموویان لە پیش دەرگا ڕاوەستاوەن . ویستم خوێ نەناسکەم و تێیپەڕم . لە پڕ یەکیان گوتی : " ئەوە حسامیە " .

عەولای بایزئاغا بانگی کردم . کە ڕامەوە سلاوم کرد و گوتی : "

ـ دەلێم ئەوە هاتوویە وە ؟ . ئەوە ئەیان گرتووی؟

ـ بۆ دەمگرن عەولاغا؟ چیم کردوە ؟

ـ دەلێم لە چی دەگەڕای؟ تۆچت بە ئوروپا داوە ؟

ـ عەولاغا سەفەری ئوروپا خوشە بە تایبەتسە فەرێکی ئاوا .

ـ بە سەرقەدی شیخی بورهانی دەلێم تودە نار بوویانی .

ـ عەولاغا من کوردم و تونەری لاوانی کوردستان بووم .

ـ دە لێم ئیمەش کوردین و ئاگاشمان لێ نە بوو .

ـ ئیوە کورد یکی دیکەن . ئیستا بۆ هاتوونە ئیرە؟

ـ هاتووینە کن شای وەهاتونە وە .

ـ جا بە ئێوە چی . ئەوشایە چی بوکورد کردوە ؟

ـ شەی . . دە لیم خۆ زمانیشی دە کەرێ . هیشتا دەست هەلناگرن .

ـ چمان‌کرد وه . د ه‌مانه‌وێ به ئازاد ی بژین .
ـ توّ له‌وقسانه گه‌ری . د ه‌وێری بێ بێیه‌وه مه‌هاباد ؟
ـ بوّ ناوێرم ؟ چم کرد وه بترسیم ؟
ـ هیشتا چت نه‌کرد وه . ؟ ناوێری بگه‌ڕێیه‌وه مه‌هاباد . به‌لام وه‌ره تورکه‌ش ماله خوته‌وکه‌س نتوانـی چت پـێ بلێ .
ـ زور سوپاس عه‌ولاغا . بوّ سه‌رد انت هه‌ر د ێم . خوا حافیزیم لێ کرد ن و رویشتم .

له ماله براد ه‌ری ئازربایجانی زور به ره‌حه‌ت بووم . به‌لام فیکری د ایك و بابم ویستخه بیه‌ر له وه‌زعـی کورد ستان نه‌ی د ه هیشت ئاسوود ه بم .

روژێك هاومزله‌که‌م له بازار هاته‌وه . گوره‌وی و د ه‌سره و ژێر کراس و کراسی بوکریبووم .

گوتـی . " بابم زور د ه‌وله‌مه‌ند ه . منیش پولم هه‌یه . ئه‌وانه شتێك نیه . چـو مـه‌ ژووره‌که‌ی خوم و خه‌ریکی خوێند نه‌وه بووم لیم وه‌ژوور که‌وت . گوتـی :

ـ راسی د ه‌زانـی ؟
ـ نازانم . راسـی چی‌یه ؟
ـ یاری به وه‌ره‌قه . یاریه‌کی خانه‌واد ه‌گیه . زور خوشه . با بێتم یاری بکه بن فێر د ه‌بی .
ـ د وو د ه‌ستی وه‌ره‌ق هێنا و رێ و شوێنی یاریه‌که‌ی بێ گوتم و ورد ه ورد ه فێر بووم .
سه‌ر گه‌رمیه‌کـی بانی بوو ، په کی خوێند نه‌وه‌ی خستبووم .

## حاجـی شـیخ عـه ولا شـه فـه نده ی

روژێك که چوومـه لای میرزا خه‌لیل گوتـی : " مزگێنیت د ه مـێ حه زره‌تی شیخ هاتوه . له‌مالی ره‌زا ئه‌فشار نوێنه‌ری وه‌ســێ یه .
ـ پێم خوش بوو که نکی بچینه خزمه تـی ؟ .
ـ من عـه‌رزی د ه‌که‌م و قه‌رار د اد ه نێم .
میرزا خه‌لیل به ته‌لیفوون گوتـی : " بوّ روژی هه‌ینی قه‌رارم د اناوه . زوّرت ئاره‌زوو د ه‌کا
هاومزله‌که‌م هات گوتی : " بلیتی سینه‌مام کریوه . فیلمێکی خوش هه‌یه .
ـ به شه‌وچوونـه د ه‌رمان بانییه .

ــ کێ بە کێ یە ؟ کێ دەزانێ ئێمە لێرە خۆمان شاردۆتەوە ؟ . کەشفی رێکخراوەکانی حیزب پولیس خۆی نێ خزاندە وە .

ئەو چووینە سینەما . کە هاتینە دەر قوڵی خستە تاوقوڵم وخۆی پێوە دەنووساندم . تەزووم لــە لەشی دا دەهات . شەرمم دەکرد .

رۆژی هەینی لە گەڵ میرزا خەلیل چووینە خزمــەت حاجی سەید عــەولا ئەفەندی زۆر بە گەرمــی بە خێر هاتنی کردم . وەزعــی سەفەر وگە رانەوەی پرسی . پاشان باسی سەید عــەزیزی لێ پرسیم . گوتم بە داخــەوە کوردە ئێرانیەکانم نەدیوە .

گوتی پێشرێوە بێم بۆ ئێرە لە نەغــدە بووم . بابت لە مالە میرزا شەریف هاتە لام . زۆر لە خــەمــی تۆدا یە و نیگەرانە . پێم گوت دەچمە تاران و خە بەرت بۆ دەنێرم . نامەیەك ئێستا بنووسە من بۆ میرزا شەریفی دەنێرم بیدا بە بابت . چەند رۆژی دیکە دەگەرێمەوە لە گەڵ تیمسار ئەمیر عــە زیزی مە سەلەی تۆ باس دەکەم . ئەمنیەتی تەواوی تۆی لێ وەر دەگرم نامەت بۆ دەنووسم . ئەگەر نامــەم بۆ نووسی گەرمــە بە وەرەوە . بابت زۆر بە تەنیایە . تا قەولی لێ وەر نەگرم نامــەت بۆنانووسم . نامەکە بە ئادرەسی میرزا خەلیل دەنێرم ."

زۆر سوپاسم لێ کرد ونامــە یەکم بۆ بابم نووسی و دام بە شێخ و هاتینە دەر .

تەنیا کە سانێك لە تاران دەمبینین سولیمان و کاك سدیقی ئەنجیری و میرزا خەلیلی خوسرەوی بوون . لە گەڵ هاومزلەکەم خەریك راسی و کتێب خوێندنەوە دەبووین وناخۆشیشمان لێ نە دەگوزەرا . بەرنامــەی دیتنی میرزا خەلیل هەر وەك خۆ ما بوو . جار وبار شوێنەکەی دەگۆری و جێگای پەنا تری دەدیتەوە .

پێشتر بەفەرم بۆ ئورووپا لە گەڵ دوکتور جــەعفەری رەحمانی ببوومــە ئاشنا . رۆژێك لە گەڵ سولیمان چووین سەری بدەین . زۆری پێ خۆشبوو . باس و خەبەری ئورووپا و سەفەر سەفەری پرسی . لە کوردەکانی عیراقی پرسی ، کێم دیوە و کێ هاتبوە فیستیوال .

پاشان گوتــی ئێستا لێرە چ دەکەی ؟ . خۆناتوانی بچیە ئەغــدە ؟ .

ــ لێرە بیکارم . هەر دەسوورێمەوە . پێم خۆش نیە بیکار بم بەلام چارێش نیە .

ــ پانزەی رۆژی تر سەرێکم لێ بدەوە .

کە هەستاین برۆین ، هەشتا تمەنــی هێنا گوتــی با پێ پول نەبــی . بەلا م لە بیرت نە چــی بیرەوە لام . وە دەرکەوتین . سولیمانیش جار وبار دەهاتە مزلەکەی من و راسی دەکرد . رۆژێك کە چوومــە لای میرزا خــە لیل گوتــی : " مزگێنیم دە یــە . نامــە حــەزرەتی شێخ هاتوە . نامەکەم وەر گرت و تا سالی ١٩٥٨ کە بۆ عیراق رۆیشتم نامــەکەم

هەر پاراستبوو . پاشرووێشتنم ئەویش وەك تەواوی نوسراوە و سەنەد و بەڵگە و کتیب لە بە ین چوون .

حاجی سەید عەولا ئەفەندی نوسیبووی . "چاوم بە تیمسار میر عەزیزی فەرماندەی لەشکری چوار کەوت . باسی تۆم لە گەڵ کرد . قەولی شەرەفی داوە کە هیچ کەس کاری بە تۆنەدا بێ و ئازاد بی . ئیتر لە سەر قەولی ئەو، ئەم نامەیەت بۆ دەنوسم داوات لێ دەکەم گیرەسە بە ومرەوە با چید بکە باوکت بە ریشی سپی نارەحەت وتەنیا نەیێ چاوە روانی گەرانەوەت دەکەم ".

میرزا خەلیل گوتی . "جا گیرەسە بە . حەسە زرەتی شێخ قسەی لێ کردوە و ئەساوە . ـ با بزانین چون دە بێ . لام وایە حیزب خەریکە خۆ کۆ بکاتەوە . ئەو دەم خەباتمان لە پیشە .

پاشرەیێ رۆژ لەگەل سولیمان چووینەوە لای دوکتور جەعفەر . گوتی ژنیکی زوردەولەمەند هەیە . کوریکی لە ئورووپایە و کوریکیشی لێرە یە تەمەنی ١٧ــ ١٨ساڵە . نەخۆشی ئەعصابی هەیە . پیویستە یەکێك هەبێنە لەگەڵی بێ شەترنج وتەختە و یاوەرەقی لە گەل یاری بکات . هاودەمی بێت . ئەگەر قبوول بکەی زور ئاسودە دە بی پولیکی باشیشە دا . دایك و کوریکی زۆر باشن ."

گوتم زور سوپاس . پیویستە بیریکی لێ بکەمەوە . نامەیەکی حاجی سەید عەولا ئەفەندیم بۆ هاتوە . ئەگەر نەگەرێمەوە دێمە لات .

ـ هەر وەختی ویستت فەرموو . ماڵی خۆتە .

لە گەڵ سولیمان وە دەرکەوتین . گوتی هەتیو پارووت دەرونی کەوتوە . لە سەر دایکی لە گەڵ کورەکە شەترنج بکە . جیگا وکاری وا باشت گیر ناکەوی . ئەگەر هاو مزلە کەت دەستت لێ هەلگری .

لەم بەینە دا هیندیدوکاندار دەهاتە تاران . پرسیبوویان و هاتنە لام . نامەم بۆ بابم نووسی و هیندی پارەم بۆناردەوە . ساردی پاییز بوو، رۆژیك سولیمان گوتی " کاك سدیق چاوە روانە ئەوشەو بچینە ماڵەکەی ئەو . ئیواری چوینە لای کاك سدیق . برادەریکی فارس لەوێ بوو نەم دەناسی . دەستمان کرد بە قسان . گوتی حیزب بریاری داوە کە ئەوکەسانەی لە ناوچەکانەوە هاتوونە تاران ئەشێ بۆ شار وناوچەکانی خۆیان بگەرینەوە . پێویستە تو . برادەرانی کوردی ناوچەی مەهاباد بەوزیەوە و

بۆ یان رابگە یەنی کە بۆ وڵات بگەڕێنەوە . چەند کەس ئامادە بوون بلیتیان بۆ دە کرین ولەگەڵ خۆت بیان بەوە . لە تەوریز لە گەڵ ئەحمەدی قاسملو یە کتر دەبینن و ئەوچونیەتی کە رانموەتان بۆ دەڵێ ."

رۆژی دوایی لە گەڵ سولیمان کوردە کانی مەهاباد مان دیتە وە . نیزیکەی ٧٠ ئەندا می حیزبی هاتبوو نە تاران . پێمان راگە یاندن کە پێویستە بگەڕینە وە . خۆمان بۆ خە باتیکی جیدی ئامادە دەکە ین . بێجگە لە سولیمان هیچ کە س ئامادە نە بوو بگە ڕێتەوە بۆ مەهاباد . ناچار لەگەڵ سولیمان رۆژی کە رانموەمان دیاری کرد و بلیتی ئوتوبوسمان کڕی . شەوکە چووسە ماڵێ ، دوای نان خواردن بە هاوری یانی خانە خوێم گوت ." ئێوە بە یانی دە چنە سەر کار . با هەر لە ئیستاوە لەگەڵ سوپاسیکی زور ماڵ ئاوایی تان لێ بکەم . من بە یانی سەعاتی چوار دوای ئێوە رۆ دە کەومە ڕێ بۆ مەهاباد . هاومزلە کەم زور تێکچوو .

ــ چون دە گەڕێیە وە . دە تناسن . دە تگیرێ .

ــ دە بێ بگەڕێمە وە بلیتم کڕیوە . خواحافیزیم لە برایانی ئازربایجانی کرد وچووم لە ژوورە کەی خۆم دانیشتم . هاومزلە کەم هات . زور نارەحەت بوو . زورمان قسە کرد ئاد ریسی ماڵە باوکی دامێ . تا زور درنگ هەر لەلا م بوو . بە یانی بە یەکجاری لە دایك و خیزانی ماڵێ خوا حافیزیم کرد ولەگەڵ هاومزلە کەم هاتینە نیو شار . من چووسە لای سولیمان و ئەویش رۆی کوتی دیمەگاراژ .

سە عات سی ونیو چووینەگاراژ و هیندی لە برادەران هاتبوون و دیتمان هاومزلە کەم هات. چەند جونگورەوی و دە ستەوانە ودەووکراس و شیرنی و هەنار وسیوی بۆ هینا بووم . لەوێ راوەستا تا ئوتوبوسەکە وتە رێ .

لە تەوریز چووینەماڵی نزدیکی سولیمانی موعینی . رۆژی دوایی چووینە ماڵی ئەحمەدی قاسملو . کە چووین دیتمان رەحمانی قاسملوش لە وێیە . دانیشتین باسی وە زعی مەهاباد مان کرد . رەحمان گوتی کە س لە شار دا نەماوە . من ماوەیەك لە ماڵی پینەوا خوم شاردەوە پاشان سواری گوێ دریژ بووم و بە نیوی کاردا ری باخی تا وسوکەند هاتووم . لەوێ سواری ئوتو بوس بووم چوومە ورمێ و ئیستاش دە چمەوە تاران . بریارمان دا من بچمە وە دەور وبە ری مەهاباد و پاشان بچمە وەنیو شارو خەباتە ریژە پێ بدەم . رەحمان گوتی ."حیزب خۆ بۆ خەباتی پارتیزانی ئامادە

دەکا . لە بەهاردا شەری پارتیزانی دەست پێ دەکەین . پێویستەناوی ئەوکەسانەی کە دەتوانن لە خەباتی پارتیزانی دا بەشدار بن بنوسری . سەد تەن پولی دامی کە بۆ بابەی بنێرمەوە .

سولەیمانم لەگەل یەك دوو کەسی مەهابادی چەند روژ پێشتر ناردەوە مەهاباد ئیوارە یەکی سارد، لەتەوریز بەشەقامی پەهلەوی دا دەرویشتم هەمزە خەلیل و مام وسێنی برای لەگەل دوو سێ کەس راوە ستا بوون . من ویستم تیژ تێ پەرم . چەند هەنگاو رویشت رویشتبووم وسینەزەرد لەپشتەوەرا بانگی کردم .

ــ بۆکوێ دەروی؟ . ئیمەت نەدیبوو؟

ــ دەچمە ومەزل و ئیوە شم نەدیبوو .

ــ وەرە کاك هەمزە بانگت دەکا .

لە گەلی گەرامەوە . کاك هەمزە لەگەل چەند کەس راوەستا بوو . بەخیر هاتنی کردم گوتی : " وا توند تێ پەری، خۆتلە ئیمە مشاردەوە ؟

ــ نە خیر . بۆ خۆ لە ئیوە دەشارمەوە . زور سارد ە و دەمویست بگەمەوە مزلە کەم .

ــ مزلی چی ؟ دەی بێ بۆیە مالی ئیمە .

کە وای گوت ترسم لێ پەیدا بوو . هەمزە خەلیل لە گەل روکنی ٢ ی ستاد هاو کاری دەکرد . دوژمنی سەر سەختی دیموکرات و حیزبی تودە بوو . وە سەرخۆم نەهێنا، گوتم

ــ ئەگەر ئیجازە بدەی دەچمە وە مزلی خۆم . کارم هەیە .

ــ ئەمشەومیوانی من دەبی . ئەوەی گوت و فایتونیکی بانك کرد ورویشتین .

هەمزەخەلیل مزلیکی لە تەوریز بوو کور" کانیان لە وێ دەیانخویند . کە یشتینە مال و میوانی دیکە شی هەبوون . دانیشتین وگوتی .

ــ دەی . کاك کەریم باسی ولاتی روسانمان بو بکە .

ــ مە بەستت یەکیتی کومارە کانی سوویتی سوسیالیستی یە ؟

ــ تووای کەورە مە کە مە . رووسن ــ رووس . خۆئیستا ش دەست هەلنا گری .

ــ بۆ ئیستا چ بوە؟ باسی چی ولاتی سوویت بکەم ؟ . ولاتیکی تیر و پر . بیکار و فە قیر و سوالکەر نیە . کار بوهەموو کەس هەیە . ئازادی هەیە . باس چی بکەم ؟

ــ یانی نانتان وەگیر دەکەوت بخون ؟

ــ چون نەتی وا دەلێی و . گوندی یەکی سوویتی سەد کەرەت لەئاغایە کی ئیرە تیر ترە .

ـ دڵم نایە بڵێم درۆدەکەی. بەصەرقەدی شێخی بورهانی ئەو سەگبابانە هەر بوقو قرژاڵان دەخۆن".

بەیانی نان و چامان خوارد وکاکەهـەمزەگوتی :

ـ دەست ڕۆژی لێ قـەومان دیاری دەکا . بلێی وەلێی، بەصەرقەدی شێخی بورهانیش لێت قەوماوە . ئێستا دەستم دەڕوا . ماڵێکم لێرە یە . کورەکان لێرە دەخوێنن . تالاو پێش ماڵە خۆتە . ئێرە با تالاو کۆێت بێ خۆشە وەرە و بێ ترس لێی دانیشە . کەس ناتوانی قسەت پێ بڵێ . "

زۆر سوپاسی کاکەهـەمزەم کرد و ڕۆیشتم . جارێکی تر قاسملوم دیتەوە و ماشینێکم گرت بۆ سارو قامیش . ئێوارە درەنگ چوومە سارو قامیش ماڵە ئاغای سالار .

ئاغای سالار لەمرادە بـە دەم ڕێزی لێ گرتم . سالاری میرزا فەتاح ئامۆزای پێشەوا قازی محەممەد پیاوێکی زانا، تێگەیشتوو، ئازا، قسەخۆش و شەخسیەتێکی هەڵکەوتووی کورد ونیشتمانپەروەرێکی ناسراو بوو . ناردم عـەولا بارزانیان دیتەوە و هێنایان .

عـەولا بارزانی کابرایەکی کوردی عێراق بوو . لەگەڵ بارزانیان هاتبوە ئێران و پاش ڕۆیشتنی بارزانیەکان خۆی شاردبـووەوە چوو بوە تاران . لەوێ لەگەڵ برادەرانی حیزب ببوە ئاشنا وەگەڵ حیزبی ئێمەکەوتبوو. پاشکودیتا ناردبوویانەوە ناوچەی مەهاباد لەگوندەکان دەگەڕا .

عـەولا بارزانی هات و وەزعـی گوندەکان و ئەندامانی حیزبم لێ پرسی و لای خۆم ڕام گرت.

چـەند ڕۆژ لە سارو قامیش بووم . قسەخۆش و بەکەڵکەکانـی ئاغای سالار دووری و خەفەتی وەزعـی دایك و بابمی لەبیر بردبوومـەوە . کوڕێکی کاکە ڕەحیمی سالار بـە ناوی ( عـەبەسوور) وەگرم ببوو بۆنوستن نەبا لێم جیا نەدەبـووەوە .

کاتێك لە سارو قامیش بووم ڕۆژێك قازی حاجیاباد برای ئاغای سالار و بابـی کاك ئەمیری قازی، بانگهێشتنی کردبین . ئێوارەیەکی سارد سوار بووین چووینە حاجیاباد .

پاییزێکی سارد ە تۆزێ بەفر باری بوو بەلام تەواوعـەرزی نەگرتـبوو . نوێژی ئێوارێ ئاغای سالار نوێژی دەکرد کوێخای گوندی هاتە ژوور . قازی گوتـی :

ـ خەڵکەکەت دەنگدەوە . کەس نەمێنێتەوە

ـ بەلێ قوربان بەهـەمووکەسم ڕاگەیاندوە . قەرەوجو تیەندەم دەنگدەون .

ئاغای سالار سلاوی نوێژی داوە و گوتـی :

ــ هـــه رەوەزی‌چـــی بەوسەرمایە ؟

ــ هێنـدێ چـــەوەنـدەری سەمیزادە ماونەوە هەڵنە کە نراون . کوتمان بە هــــە رەوەز تا بە فر نەبارێوە بۆی‌هەڵکەننە وە .

ئاغای‌سالار کوتـــی : " هـــە رەوەزی چـــی ؟ بۆنالێ ی‌بیگار . ئاخر تو لە سەر بەرمالی پێغەمبەر دانیشتووی، بەرمالی پێغەمبەر لەاوبرچوت دا . بەوسەرما وسە یاقمژن و مندا لـی خەلك دە بەن و بیگاریان‌پێ دەکەن . نیومیلیونت دراوی‌چــە وەندەر دە بێ .

ــ . . . ە متمـە نی لێ بەدە و بەکرێ بۆی‌هەڵکەنەوە . ( سەمیزادە خیزانی قازی حلجیا بوو . ) . پاشان رووی‌کردە من و کوتـــی : " کاك کەریم پیاوناوێری دەنا کاری‌خـــوا بــو دەست ئێوەر دان‌دەبن " .

پاش‌چـــە ند روژعـــەولا بارزانیم ناردە وە شار لەوێ‌بــێ تا من‌دە چمە وە . ( ئەم عـــەولا بارزانیە پاشان هێندێ‌زیر و دراوی‌مالە پێشەوا قازی‌محە مەدی‌دزی و خوێشا ردەوە . سالە کانی دوای ٧٠ بیستمان لەهە ولێرە ولەنە قاباتی سە یاران‌کار دەکا و ناوی‌خوێ گورێوە . )

لە سارووقامیشەوە لەگەڵ دوو برادەر چـــوو مــە گوندی ( کەلبە رەزاخان ) . لە وێ ولەقە با کەندی برادەرانی حیزبیم دیت و دەستکارێەکی شانە و ئەفرادم کرد ودوو سێ روژ لە سەر سە فەری ئوروپا وژیان‌لە یەکێتی سوویتی قسەم بوکردن . رەمزو پارۆلـــی پێیوە ندیم بۆدانان و چووەمـــە شامات لە ( دێی مــە سوور ) میوانی مالە ( حاجی‌حە مــە سوور ) بووم . مالێکی مـــەردار دەولە مـــەند . مالێکی سەر ئاوالە . برادەرێکی بـــە ئە مـــە کی حیزب . زوری پێ نە چوو تە ماشام کرد مارفـــی کوری سمایلی شێخ ئاغایـــی هات . لە گەڵ ناوی ئەندامانـــی حیزب‌عـــەولا بارزانی‌ناوی ئەوێشی دابوو . برادەرانی حیزبم کوکردە وە تە ماشام‌کرد مارفاغا هەموو کارە یە . هیچ نە دەکرا . حاجـــی حـــە مــە سور کوتـــی : " ئەوکابرایە یان رەکەڵ حیزبیخستوە . کورە ئەوە زور خە رایە . لـــە گەڵ ژاند ارمـــە ی‌میاند واو سرت و خورتی هـــە یە . ئەم‌حاجی‌ە نەخوێندە وارە لە رێگای هـــە ستی‌چینا یە تـــیە وە مارفاغای تا سیبوو . سوراخـــی سولتاناغام کرت .

کوتیان : " پاش‌کودیتا لەترســـی هـــەمزە خەلیل وژاند ارمی میاند وا هەلاتوە و چـــوتـــە مالی حاجـــی بایزئاغا .

لە دێی مەسوور بووم روژێك محە مە دی‌برای‌کاك سولتان‌هات . کوتی : "

- زۆر شپرزە بین . هەمزە خەلیل و وسێنە زەرد ناهێڵن کەرهاتوو چومان بکا . ئاردمان نەماوە ناهێڵن وشترمان بدەنێ کە نهێنیێرینە ئاشی ".

بە حاجی حەمە سوورم گوت سێ وشتران بنێرە کەنمی ماڵە سولتاناغا بەرنە ئاشی خەتایی ". گوتی کورە . " ئەوسەگبابەی خوشمان موخالیفە . مە بەستی مارفاغا بوو. حاجی وەك پیاوان وشتری ناردن بار ئاشیان بۆماڵە کاکەسولتان لێ کرد وهێنایانەوە .

پاش دوو سێ ڕۆژ لە دێی ڕوینشتم چووم بۆ گەزەلین ماڵە ( سۆفی هەمزەی قادر ە سووری ) ئەندامێکی باوەڕ پێکرا و قادری کوڕی لە سندووقیەکیك لە کوڕە چالاکەکان بوو. دەم دەست خۆڵە سمایلی شێخ ئاغا ومارفی کوڕی بشارەوە . نیزیکەی بیست شەوله گەزەلین بووم . جێگایان لە تەویلە بۆچاك کرد بووم . بە ڕۆژ لە تەویلە دادەنیشتم و بە شەو لەگەڵ دەو براەدەرە چووینە گوندەکانی شامات و ئەندامانی حیزبم کۆدەکردەوە و لە بارەی خەباتی پارتیزانی دوا ڕۆژی نیزیك قسەم بۆدەکردن . لاوەکان ناوی خۆیان دەنووسی وئامادە دەبوون .

لەوکاتەدا لە پڕ بە بەیاننامەیەکی حیزبی تودەیان بۆناردم . نووسرا بوو ئەژمارە شانەکانی شار وگوند و ئەندامان و ڕیزی ئەو کتیبانەی کە لە شانەکان دە یانخوێننەوە داهاتی مانگانە و ناوی کتیبەکانیش بنێرن ".

کەم لە کوێ کە وتوە و گوندە لە کوێ دراوە . ئێمە ئەوە برادەران بوخەباتی چەکدار ئامادە دەکەین و حیزبی تودە داوای شانەی وەرزێران دەکات . نامەیەکی دوور و درێژم نووسی و لەناردنی ئەم جورە بەیاننامانە بۆکوردستان ڕەخنەم گرت و نووسیم مەسەلەی شانەی وەرزێران وخوێندنەوەی کتیب لەشانەکان دا بۆکوردستان وەك ڕاوی سەر کاغەزوایە و خەلك لێسارد دەکا .

خەبەرم دا بە مەهاباد کە برادەرێك بنێرن دایم لەگەڵم بێ . حەمەدە صینی برای حەسەنی سەولودیان نارد بوو. حەمەدە مێنم ناردە نەغەدە . نامەم بەو برادەرانی نەغەدە نووسی و سەبارەت بە شێوەخەباتی نهێنی هێندێ ڕێنوێنیم کردن . نامەم بو دایك وبابم نووسی . هاوەڵەکەی تارانم لیباسی بوکچەکەم کریبوو لەگەڵ هێندێ پول بۆم ناردنەوە . بۆخۆشم چووم مەحالی شازادەم . دووسێ ڕۆژ لە گوندەکانی مەحالی شازادە برادەرانم کۆکردەوە . ڕەمز وپارۆڵی تازەی پێوەندیم لەگەڵ دانان و گەڕامەوە بۆ گەزەلین . پاش چەند ڕۆژ نامەیەکم بۆهات کە بچمەوە مەهاباد و بە ڕێپرسی

کومیتەی‌شار وە ئە ستۆ بگرم . ئیوارەیەك لە گەل دووبرادەر چـــووینە سەر ریگای ماشین و سوار بووم بۆمـە هاباد . لە نیزیك‌شار دابەزیم. بە تە نیشت باغی‌سەعدا و بـە قـەراخ چـەم دا تا بە ردەرگای‌ماڵە پیشەوا . لەوێ‌برادەرانم گیراوە و خۆم چـوومە ماڵە قازی . بە خیر هیناںن وریزلیّ گرتنی خانمو کچە کان باسی ناکرێ و لە نووسین نایە .

کە من‌چووم عـەولا بارزانی‌تێنراوە بوو. برادەرانی لە شارێما بوون و دە بوایە هاوکاریم بکەن کۆم کردنەوە. وەزعـی شانەکان و بەر پرسی برادەران و ریگای پەیوەندی و هاتو چۆیان دامـەزرانە . بریار درا حەوتووی دوو جار بە نۆرەلە شانە کان دەرس بلیێمەوە میزووی‌حیزبی کومونیستی یە کیتی‌سوویتی و ئـە سولی تە شکیلاتی حیزبیم دەربردەکوتەوە . لە هێندێ‌حەوزە نەیان دەناسیم . گوتبوویان رووسە هاتوە لێرە کار دەکا .

چونکە عـەولا بارزانی لە ماڵە پیشەوا بوو وا بە مە سلەحەت زانرا کە من بگوێزمەوە بچمە ماڵە خانمە خانمی کچی شە هید سەدری‌قازی . لە ماڵە خانمە خانم ناوم سمایل بوو. لیرە دا قەلەمـەکەم لە توانایدا نـیە باسی ئینسانیە ت و ئە رافەت و پیاوەتـی ئازایەتی ئەوشیرە ژنـە بنووسی . لەوهـەل وەـەرجە دا کە تارمایی پولیس و رووکنی ٢ عاسمانی مـە هاباد‌ی‌تاریك کرد بوو. خەلك لە سیبەری خۆیدە رە ویەوە . پولیس و ـــ لە شکر چـەند جار لە دوایان نارد بوو هەرمشەیان لیّ کرد بوو کە لە سیاسەت و لــە ئە فرادی ( ئاژاوە چـی ) بە دوور بیّ‌ئە ئەوژنە روناکبیرە • لە هیچ یارمە تیەك دریخـی نە دە کرد . هاوکارەکان زور جار دە هاتنە لام وکۆبوونەوەمان لە وێ‌دە بوو. جاریك نیو چاوانی تیك نە نا و نە ژاکا .

کە میوانی دە هاتن من هەلدەستام دارم دە شکاندن . دەمیگوت رە عیەتـــی خومانە وەلە گوێجە لی یەوە هاتوە . دووکەسی کە زور بە دەستەوە بوون و هەمیشە لە هاتوو چوداوبوون و نامەم بەوان‌دا بۆ برادەران و شانەکان دە نارد کاك‌جەـە لیلی‌گادانی وخوشکە سەعادەتی کچی پورە توبا بوون . ئەم‌دوانە بە راستی زە حمە تیان دە کیشا و بە بەفر و سەرما لە هاتوو چۆدا بوون . قاسمی سولتانیان عـەولای‌حەکیم زادە یونسی بلوریان وەك ئەندامی کومیتەی‌شار، هاو کاریان دە کرد . کوریکی کرماشانیش‌حیزبی تودە بۆیارمە تی ریکخراوی‌لاوانی نارد بوو لەکۆبوونەوەکان دا بەشدار دە بـوو.

پانزکوژیتا کە برادەران پەرە وازە دەبن وهەر یەکە روو دەلا یە ك‌دەکەن غە نـی بلوریان لەگەڵ ئە سعەدی‌خودایاری دەرون بۆکوردستانی گەرمین . لە زستان دا ئە سعەد لەگوندی ( قە رەچەلان) نامە یە کی بونووسیبووم و داوای‌کرد بوو کە دەبـی

بۆخۆم بچم بیبینم . زستانێکی‌سارد و بەفر زۆر . چار نە بوو کاڵە وکورپەم هەڵکێشان و برادەریکم سازکرد وچومە قەرە چەلان . ئەسعەد نامەی کاك غەنی هێنا بوو — سیزدە هەزار تمەنیشی پول نارد بووەوە . پارەکەم لێ وەرگرت و نامەم بۆکاك غەنی نووسیەوە و ئەسعەد گەراوە .

دووی‌ریبەندان نیزیك دەبووەوە . بۆشکاندنی‌ساسی‌کود بتا چیەکان و زیندوو بوونەوەی‌وەی‌خەڵك دە بوایە بەبوونەی‌دووی‌ریبەندانەوە چالاکیەك‌نیشان‌بدەین . هاوری‌یانی‌کومیتەم بانگ‌کرد کە لەسەر چونیەتی چالاکی دووی ریبەندان قسە بکەین . پاش‌باسێکی زور هاتینەسەر ئەوباوەرە کە ئالای‌کوردستان سازبکەین و شەوی‌دووی ریبەندان لە سەر داشانەی جیهەوقولقولاخ وکێوەکانی‌دەوروبەری مەهاباد بیچەقینین . لە دیوارەکانی نێو شاریش‌شوعار بنووسین .

برادەری‌کرماشانی کە حیزبی توودە بۆکاری ریکخراوی‌لاوان ناردبوو . وەدەنگ‌هات وگوتی . " دووی ریبەندان فیکرەیەکی ناسیونالیستی یە . ئێمە گشتمان ئیرانین و نابێ بیری‌جیوازی‌خوازی بلاوبکەینەوە . لەم بارەوە لە لایەن حیزبی توودەوە شتێك بۆمن نە نووسراوە ." . زورمان قسە لەگەل کرد فایدەی‌نە بوو . گوتم :

— تۆ وەك پارمەتی دەر بە ریکخراوی‌لاوان هاتوویە ئێرە . لێرە کومیتەی‌حیزبی دیموکرات بریار دەدا .

— حیزبی دیموکرات چیە سرا؟ من هەووەل جارە ئەم قسەیە ئەبیسم . من‌تەنیا حیزبی توودە ئەناسم .

— باشە توهەر حیزبی توودە بناسە . بەلام لێرە حیزبی دیموکرات یادی دووی‌ریبەندان زیندوو دەکاتەوە .

هەستا وکوبوونەوەی بەجێ هێشت . شەوی‌دووی‌ریبەندان بریارەکانی کومیتە هاتبوونە دی . ئالای‌کوردستان لە سەر بەرزاییەکانی دەوروبەری‌مەهاباد هەڵکرا بوو . دروشمی ( بژی دووی‌ریبەندان ) لە دیواران نووسرا بوو. پولیس و لەشکر هار بوو . دەستیان‌کرد بە گرتنی خەڵك . زور کسیان لە لاوان‌گرت و ئازار و ئەشکنجە یان دان . لە نیوگیراوەکان دا مەحمودی‌خوسرەوی شپرزە کرا بوو . هەموو لە شیان داخ کرد بوو . لەبەر ئەوە کە نە کوبەری لە زیندان رایان نەگرتبوو نارد بوویانە وە مال . ویستمان بهێنێرینە‌دەرەوە لە دەروازەدا ریان پێشی‌گرت ونە یانهێشت‌لە شار بچێتە دەر .

عــه ولای‌حه کیم زاده هاتوو چۆی‌ده کرد و ده‌رمان و ئامپولی پیویستی بو ده‌برد
هه‌ر چــه ند هێند ێ‌له لا وه‌کان وخه‌لك گیران به لام له نیو شار ته ئسیریکی باشی هه‌بو.
براده‌رانی چووبوونه نیۆمــه نگوران ده یان‌نارد لیباس‌و سیغار وگوره وی و شتی دیکه
یان بۆ بنیرین . عــه‌ولای‌حه کیم زاده وجه لیلی‌گاد انی ئه‌د‌کارانه‌یان به باشی راده
په‌راند . شه‌ویك هاتمه ده‌ر وچووم سه‌ری‌حاجــی مــه‌لا خالیدم دا . دوای کود یتای
٢٨ی‌که گویژ حاجی مه لا خالید یشیان چــه ند روژ گرتبوو. پاشان به ده‌ست به‌سترا
وی به نیو بازار وشه‌قا م دا گێرا بوویان . که چووم یه‌کجار زور شاد بوو . که شاوه .
توزیك‌گریا . پاشان‌فه‌رمووی من هه‌ر دوعاتان بو ده که‌م که به ئاوات بگه‌ن . کورد له
چنگ‌ئه‌م زالم وزور دارانه رزگار بــێ . پێم‌گوت نامه‌یه‌ك بو‌بابم بنووسی و یا خه به‌ری‌بــو
بنیری بیته مــه هاباد چاوم پێ بکه‌وی . باوکم هات و دوای‌شه ند مانگ چاوم پێ‌که وت.
دلخوشیم‌دا وه . زوری‌گله یی له براده‌رانی حیزبی هه‌بوو که جاریك سه‌ریان نــه داوه .
بابم چــووه نه غــه ده و پاشان دایکیشم هات وچــه ند روژ له لا م بوو.

زستانــی ١٣٣٢( ١٩٥٤) به فریکی زور باری‌و سه‌رمایه‌کــی سه خت بوو .
براده‌ری‌کرماشانی هه‌لی پێچابێ وگوتی . " له مــه هاباد گیر نابم وئه شێ بمنێرنه وه
تاران . نه یده توانی له گاراژیش‌سوار ماشین بــێ . قاچیکیشی شه‌ل بوو به زه‌حمه تێ
ده رویشت . سولیمانی موعینیش‌تووشی نه خوشیه کــی بوو له مــه هاباد چاری نه ده
کرا و ده بوایه بینێرینه ته‌وریز . ئه‌ویش‌نه ده‌کرا بێته ده‌ر وبه ئاشکرا سواری‌ماشین بێ .
هه‌ر دووکیان هه لیان‌پێچا بووین که به رێ یان بکه ین .

ناچار روژیك دوای‌نیوه روو جلیکی دیهاتیانه‌م کرده به‌ر و تــه وه‌ر داسیکی دار
شکاند نم له سه‌ر شان دانا و له ماله خانمه خانم هاتمــه‌ده‌ر و ئه وانیشم نارد بــوه
ده‌ر له شار وه دوای‌خوم دا ن بۆ گوندی ( قــه ره بلاغ ) .

کاد ری‌کرماشانی نه یده توانی بروا . تا وه سه‌ر هه‌ورازی ( به سری) که وشــین
تاریك داهات . بوو به کریوه و سه رمایه ك پیش‌خوّمان نه ده دیت . هه‌ر چــونیــك
بوو ده‌رنگ خوّمان‌گه‌یانده قاوه خانه ی به سری . له ده‌رگامان دا قاوه چــی ده‌رگای
نه ده کرد‌ه‌وه ده یگوت ده‌زین و تالانم ده که‌ن . پاش‌هه‌رایه‌کی زور گوتم :

ــ من فلانکه سیکم . ده‌رگا بکه‌وه سه‌رما ره قمان ده کا .
ــ سویند بخوّ تو که ریبی‌حسامــی ده‌رگا ده که مــه وه .
ــ سویندی‌ناوی هــه‌موم. ده‌رگا بکه‌وه ده مــامی .

پاش چەقەیەکی زۆر دەرگای کردەوە . سەرما لە پێ خستبووین . زۆری بەخێرهاتن کردین و مریشکێ کوشتەوە و تەندووری هەڵکردەوە و گەرم بووینەوە و نانێکی باشمان خوارد . سبەی کە هەستاین بەفر باریبوو ڕێگای پڕ کردبۆوە . چەندی گوتی نابێ بڕۆن کەوتینە ڕێ . ڕێمان لێ گۆڕا . بەڵام من بە نیشانەی کێوەکان دەمزانی گوند لە کام ئاقارە . لە پڕ دیتمان چووینە سەر کێوی پشت قەرەبلاغ و گوند لە ژێر مانەوەیە .
بەربووینەوە بۆ نێو گوند و ماڵی (وسێنی حەمەشێخم) پرسی . کە چووینە حەسار و لێمان وەدەرکەوتن ئیدی بەخێرهێنان و خزمەت باسی ناکرێ . دایکی کاک وسێن کە لە تەوریزم هێنا بۆوە بەدەورمدا دەهات و دوعای بۆ دەکردم .
گورج کیسکیان کوشتەوە . جیران وکە بخودا لیمان هالان و دایکی بۆی باس دەکردن کە چۆن تەدبیرو نە ناسیو دەفریایکە وتووم . شەوێکی خۆشمان ڕابوارد .
بەیانی گوتم : " دوو ولاخی سواری زین کەن . ئەم دوو کوڕانەم بۆ بگە یێنە گوندی سارو قامیش ماڵە کاکە ڕەحیمی جەوانمەرد کوڕی ئەلغای ساڵار .
وەك پیاوان بە براکانی گوت دوو ولاخیان زین کەن . هەر لە ماڵی خۆیان دووماین زین کران و سولێمان و کرماشانیم سوار کرد و دوو برای کاک وسێن وەپێشیان کەوتن .
نامەیەکم نووسی بۆ کاکە ڕەحیم کە ئەم دوانە بەڕێ بکا بۆ تەوریز .
دوای نیوەڕۆ کاک وسێن لە گەڵم هات بۆ شار و تا دەرکی خانمە خانم هات وگەڕاوە .

## حەسەنی سەیفی قازی

ئەم ساڵە حەسەنی کوڕی خانمە خانم سێهەمی یەکی سەرەتایی بوو . منداڵێکی وریا ، ژیر ، لە ژێر تەربیەتی دایك دا گەورە دەبوو دەیخوێند .
حەسەن جۆرێك وەگری من ببوو زۆر جار نیوە شەو یا لای بەیانی لە کن دایکی ڕادەپەری و دەهاتە لای من و دەیگوت قسانم بۆ بکە . شتی سەیری دەپرسی و پرسیاری ئەوتۆی دەکرد کە بۆتە مەنی ئەوتە دەبوو . من لە گەڵ ئەمیری کوڕی کاکە ڕەحیم لە زووریك دەنوستین . دایکی زۆر جار دەیگوت : " حەسەن کاك سمایل نارەحەت نەکەی " . لە پێنڕا هەر وای دەزانی کسمایلم و خەڵکی کۆیجەلیم . ڕۆژێك سجلەکەم لە بەر دەستان بوو تەماشای کرد بوو . بیستبووی کە من چووەمە فیستیواڵ .

من كە باسی فیستیوالم دەكیراوە وام باسردەكرد گویا یەكی دیكە بئوی گیراوەتەوە .

رۆژیك لە سەر نانخواردن هەرچارێ لێ دەكردم و پێدەكەنی . دایكی گوتی :

ــ حەسەنائەوە چی یە ؟ بۆنان ناخۆی ؟ .

ــ نا خۆم . . بو كاك سمایلی بە قەستی بروا بە من ناكا ؟

ــ ئەوقسانە چن نانەكەت بخۆ .

ــ ئامە ئەوە كاك كەریمی حسامی یە . چۆتە فیستیوال . خۆمن لە كن كەس باسر ناكەم . تازە نە دەكرا بیشارینە وە . گوتم . "حەسەنئاغا باسی هەموو شتێكت بۆ دەكەم . نا بێ بارێكە ی . " ئیتر حەسەنئاغا زمانی بێ كێشا بووم . هەزارجور پرسیاری دەكرد . ئەوەندە ژیر و بە ئەدەب بوو دەلم نە دە هات دلی بشكێنم .

رۆژیك لە مەدرەسە هاتەوە وگوتی :

ــ كاك سمایل ئەم رو یەكێكم بینی حەتمەن تودەیی بوو .

ــ بە چی دە زانی ؟

ــ هەمردە رویی و ئاووی دەداوە . !

هەموو رۆژێكە لە مەدرەسە دەهاتەوە سلاوی دەكرد و دەهات لە كن من دادەنیشت . رۆژیك هاتەوە سلاوی نەكرد . كیفەكەی فرێدا وبالتویەكەی بولا یەك فرێدا و چوو لە قوژبنیك دانیشت .

دایكی وەدەنگ هات . " ئەوە چی یە حەسەن ؟ بۆ شیت بووی ؟ چیت لی قەوماوە ؟ بۆ سلاوی ناكە ؟ .

ــ ئاخر ئامە لە حەیفی ئەوێ شەرمە هەموو شتم لە بیر چوتەوە .

ــ لە گەل كێتە ؟ بە كێ دەلێی بێ شەرەف ؟

ــ بە كوری رەش ئاغا دەلێم .

ــ ئەی . . تۆ غەلەت دەكەی قسە بە كوری رەش دەلێی

ــ ئامە خۆ لەمخۆرا نیە . غاری دا گوفاری ( تەرەقی ) چاپی تارانی لە كیفەكەی دەرهینا ودای بە من گوتی : " هانی كاك سمایلی بە قەستی . چاوی لێ بكە . دەستی كە سیك ماچ دەكا كە بابی كوشتوە .

پاشكودینا عەلی قازی چوو بووە كن شا و دا هاتبووە دەستی حەمەرەزا شای ماچ كرد بوو . لەم كاتە دا وینە یان لێ هەلگرتبوو وینەكیان لە پشتی

گـوڤاری تـه ره قـی چاپکرد بوو . له گمراتموی‌مـه د رمـه د ا روژنامـه فروشـه‌كان دانمیه‌کیان د ابوو به حـه سه نی کوری‌خانمه خانم .

## عـه ولای‌ره شـیـد ی گـولــی

سالی ۱۳۲۹ ( ۱۹۵۰ ) که مالم له گوندی ( مه مه لیان ) بوو له گوند ی گولێ چوسـه‌لان ، کوریکیان بێ ناساندم به ناوی ( عـه‌ولا کوری‌کاك سمایلی گول ) له‌تایفه‌ی قازیان . ئهم کوره خوی‌کرد بووه ئه‌ندامی حیزب . کوریکی خوێن گمرم . به قسه خه‌بات کمر وهمر ئاوری د ێنان . نیوانمان له راده به د مر خوشو هاتوو چومان زور بوو .
دوای‌کودیتای ۲۸ ی‌گه‌لاویژ زور لمو گه‌نجه قیت و قوزانه که له کاتی ئمرحانی د ا ئاگر خوّر بوون، ئاوی سارد یان بێ د اکرا بوو بایان‌دا بـوه و له خشته ده سله مینه . یه‌ك له وانه عـه‌ولا یره شید ی گول بوو . کاتیك له ماله خانمه خانم بووم روژیك له حمسار ده هاتم و د ه چووم و د مرگا د انه خرا بوو . عـه‌ولا یره شید ی بێ ئموه له د مرگا بد ا د مرگای‌کرد ه‌وه که بێته ژوور . که چاوی به من کموت و ناسیمی ، همر وه ك به سمر مارد ا بکه‌وێ ره ویه‌وه ویاشمو پاش‌گه راوه . راست‌چوو بوه ماله پیشه وای شه هید . د مستی کرد بوو به قور پیوان . " جا ئموه‌کاره، بوّواده کمن، تایفه ی قاوی تیه‌دا ده چـن . پولیس بزانی ئاورمان له مال به رده دا و . . . .
عیسمه‌ت‌خانمی کچی پیشموا وه د ه نگه‌هاتبوو گوتبووی .
ــ میرزا عـه‌ولا ئه وه له گمل کێته وده لێ‌چـی ؟
ــ چوّن ؟ . د ه چوومـه ماله خانمه خانم که ریی جمسامی لمحه‌ساری ئموان بوو . چون واده بێ . له شکر بێ‌بزانی ئێمه چده کمین ".
عیسمه ت‌خانم‌گوتبووی کوره شمرم بکه . تو تا د ویێتی ئاگرت د ێنان . خوێولیمر بشزانـی هیچ له تو ناکا . تولـه گوند ی بوّچـی وا زراوت‌چـوه ؟ . عـه یبه . خو تو له هممو که س زیاتر د وستی حسامـی بووی . "
عـه‌ولا سمری بمرد ا بـووه و ئیتر تا سالی ۱۳۵۸ ( ۱۹۷۹ ) عـه ولا مه د یته وه . ئه‌ود ه میرلا ی‌خوێ پیمه وه هاتبوو د مستی بێ‌کرد بوو که حیزب زه‌وی‌ده دا به خه‌لك و کرمانج لیمان هه‌لگمراونه وه . بریکم به سمر و گوێیان د ا د ا و رویشت .

## سەفەری سەقز

لە مانگی رەشەمەی ئەوساڵە دا خەبەریان دامێ کە بچمە تەوریز . کە چووم هێندێ لە برادەران لە تەوریز کۆ ببونەوە . غەنی بلوریان هاتبوە تەوریز وعەزیزی یوسفی و قادری یوسفی و سولیمانی موعینی و یەك دوو کەسی تر بوون . دوو سەعات لە کۆبوونەوەدا باسکرد . یەکیان دەرکردنی رۆژنامەی کوردستان و دووهەمیان ریکو پێك کردن وزیندوو کردنەوەی رێکخراوەکانی حیزب . بریار درا من سەفەرێك بۆلای بانە و سەقزبکەم و رێکخراوەکانی ئەو ناوچانە دامەزرێنمەوە .

لە تەوریز گەراسەوە نە چوومەوە مەهاباد راست چووە بوکان . برادەرێکی حیزبیمان قاوە خانەی هەبوو . میوانی ئەو بووم . چەند رۆژ سەحتەل بووم لە بوکانە و ەچیب نە با ماشین بۆ سەقز دەرنەدەچوو . بەفرما بوو . دەبوایە لە گەڵ کاروان بروم . کاروانیش نە بوو . رۆژێك لە چایخانە دا نیشتبووم چیپێك هات . لەبەر دەرکی چایخانە رایگرت وکابرایەکی تەپلە بە سەرعەلی هاتە دەر . تفەنگێکی برنوی سەرتوپی بە دەستە وە بوو، تە نکێکی زەردی لە قونداخی درا بوو لە تەنەکە نووسرا بوو ( هدیه لعلیحضرت همایونی ) .

کابرا ئاغایەکی تیلە کۆیی بوو . چوو بومخزمەت حەمە رەزا شا و دیاری وەرگرتبو هاورێ چایچی گوتی . " ئەوسە گبابە دەچیتەوە سەقز . ئەگەر لە گەڵ خۆت بیبا زور بانی دەبێ . با پێی بلێین . بە شکم پیاوەتی هەبێ .

چوومە پیشرو سلاوم کرد وگوتم رەنگە تەشریفت بۆ سەقز بچی .

ــ بەلی دەچمەوە سەقز . جا نازانم ریگا چۆنە ؟

ــ منیش ئەوە دوو رۆژە لیرە ماوەمەوە . بە تەمام بچمە سەقز . بەلام وەسیلە نیە . هاتم خواهیشت بکەم ئەگەر زەحمەت نە بێ لە گەل خۆتانم بەرن . زور مەمنوون ئەبم ."

ــ قەی ناکا . چایەك ئەخۆینەوە و دەروین .

سوار بووین لە ریگا پرسی . " بۆ ئەچیە سەقز؟ .

ــ کابرایەکی بانەیی چای پێ فروشتووم . پێر لە مانگێکە پارەی لێ وەرگرتووم و تا

ئیستا دیار نیه . وەدوای دەکەوم و بزانم چی لێ هاتوە .

ئیوارە درنگ گەیشتینە سەقز . لەدەروازە کە ئەودەم بە توندی دەیانپرسی ، لە بەر کابرا پرسیاریان نەکرد . گوتم : " من شارەزا نیم . قەت نەهاتوومە ئەم شارە . تکایە لە موسافیرخانە یا کاروانسەرایەك دام بەزێنن سوپاستان دەکەم .

کابر گوتی : " من ماڵم لێرە یە . برازام لێرە دەخوێنن . ئەم شەومیوانی ئەوان دەبین سوزی خوت برو جیگا بەوزەوە و وەدوای کاری خوت کەوە .

چوینەماڵی کابرا . دوو کوری هەرزەکار لە پولی ناونجی دەیانخویند . مزلیکی گەرم و خاوین . پیشخزمەت و ژیانیکی دەرەبەگی . نان وچیشتیکی باشیان ساز کرد بو نانمان خوارد و برازای ئاغا دەستیان پێ کرد . ماسیان هەلپیچا :

ــ زور شەرمە ئەو کەچەتە تفەنگت وەرگرتوە . جنیویان بە شا دەدا .

ئەوپتر ، ە یگوت ئێوەمنالن ، نازانن . شا لەمصدق زور باشترە . دنیا دەبوە کومونیستی . باسە گەیان توند بوو . منیش خوم سەلاسدا بوو دەنگم نەدەکرد .

ئاغا رووی کردە من وگوتی : " ئەری کاکە قادر تو بو هیچ نائیژی ؟ . ئەم کوراتە منالن . سەریان لە کار دەرناچی .

ــ منیش سەرم لە سیاسەت دەرناچێ . ئەگەر باسی چا فروشتن بایە قسەم دەکرد .

ــ وانیە . ئەم زەمانە هەموو کەس سەری لە سیاسەت ئەخوری . ئەمانە لەجیاتی دەرس بخوێنن وەدوای ئەم قسانە کەوتوون . باوکم بەخوا مصدق مابایە کەس خاوەنی هیچ نە دەبوو . دا تو خوا تو پێیان بڵێژە .

ــ من میوانم . پاشان توچاکت لە گەل من کردوە . دوو روژ بوو لە بوکان کە وتبووم توێنە بایەی نەدەگەیشتمە ئێرە . جا لە بەر ئەم پیاوەتیە ناتوانم قسە بکەم . لە بەر ئەمە نەمێ بە خوا کورەکان هەقیانە . ئاخر تفەنگێك بوئاغایەکی وەك تو نرخی چیە؟ . تاکەی کورد بەتفەنگ فریو دەخوا . شا ئەمەریکا سی هینا یانەوە و حکومەتی مصدقیان رووخاند . شا بە تفەنگێك سەرولکەشیرەتی کورد دەکرێ . شا دوژمنی کوردە .

ــ دەڵێخوا موبارەکی کا . سەد رەحمەت لەکورەکانی خوەمان . باوکم بەخوا تو لە چا کرین ناگەریێ . توەنتە ماشا کە بە دەستی خوم گورگم خستوتە کوزی خوم .

ــ قوربان راستە . بە دەستی خوتان گورگ بەخیو دەکەن . ئەوگورگە شایە .

ــ باوکم جیگای خوت دەوزیوەتەوە . لە گەڵ کورەکان باش ریك ئەکەوی .

بەیانی کورەکان گوتیان : « ماموەمان ئەمڕوا . تولای ئێمە بمێنەوە . ئێمە ئەچینە مەدرەسە و تۆش ئەگەر دەمردەچی پاشان وەرەوە .

چوومە نێو بازار، دوکانی قادری دەبباغی م دیتەوە . قادری دەبباغی بەر لە کودێتا بەرپرسی ڕێکخراوی سەقزبوو . بەخێرهاتنی کردم و پێم گوت کە برادەرانی کومیتە کۆبکاتەوە تا ڕێکخراوی تازە بە گوێرەی وەزعی ئێستادا بەمە زرێنینەوە . گوتی :

ــ ئاگاداریان دەکەم و جێگا وکاتی کۆبوونەوە دیاری دەکەین . مزلێکی پێ نیشان دام گوتی : « لەم مالە بمێنە وە کەس فیکرت ناکا . مالە ژنێکی سەقزی بوو دیار بوو وەك کاروانسەر ومزل خەلکی دەهاتی . بەلام پاك و خاوێن بوو . پیرێژن کچێکی هە بوو بەناوی مەستورە . لیك ولوربوو هێندێ ئاغای بەگزادە دەهاتن لە وێ قوماریان دەکرد بە ژنەکەم گوتبوو خەلکی کەلبە رەزاخانم . هاتووم چادەکرم . سەرە بەهارێکی سارد بوو کە منو وەدەمردەکەوتم . ژنە تێو پرسیاری لێ دەکردم و قسەمان دەکرد و لە پرــ دەیگوت . « بەخوا دوور لە تۆ دزۆ ئەکەی . تۆ لە چاکرین ناگەرێیی ) ؟

حەوتویەك لە سەقزمامەوە . هەموو ڕۆژ دەچومە دوکانی قادری دەبباغی لە وێ نەدەبوو کورێکی مێرمندال لە سەر دوکان دەیگوت نەهاتوە . بەخوا تا سالی ١٣٥٨ کە لە ئوروپا دەگەرامەوە میرزا قادری دەباغیم نەدیتەوە .

چوومە مالە رابیعە خانم خوارزای پیشەوا . ئەم کیژە لە برایانی جیا ببوەوە و لە سەقزدەژیا . کیژێکی بەڕێزتێکەیشتوو لە کولی دەرەبەکایەتی هاتبوەدەر وەك روناکبیرێك دەژیا . زۆری پێ ناخۆش بوو کە لە مزلی ژنە سەقزیم . گوتی پێویستە لێرە بمێنیەوە . جێگا هەیە . بەلام ئیتر نەدەکرا بمێنمەوە . ڕێگای بانە گیرا بوو هاتووچو بەکەلی خان دا زەحمەت بوو . چەند لاویپولی ناونجیم دیتنەوە . زۆر روون بوون . ئامادەیی خۆیان بوهاوکاری دەربری . هێندێ قەراروەدارم بودانان و گەرامەوە بوسەهاباد .

صیرزا رەحیمی سولتانیان

رەحیمی سولتانیان وەت باسمان کرد مەسئولی یەکەمی کومیتەی کوردستان لە مەهاباد بوو . پاش کودێتا ئەوینزوای کرد بوو لە ناوچەی محال و بەشی ئەختەچی

له دیهات دەسوراوە و کاری حیزبی دەکرد . لەو ناوچانەی ئەولێ ی بوو ریکخراوە کانی حیزبی ساخ ما بوو نەوە و وەی خەلك بەرز بوو . رۆژیك تە ماشا م کرد نامە یە کی کاکەرە حیم هات . لە نامە کەدا نووسیبووی : " خوتان دەزانن مال وەند الم هەیە . ناتوانم هەر ئاوا دەستیان لێ هەلگرم . ئەگەر مال وەند الم بە خێودە کەن یا خانمە خانم لە گویکچە لی خانووم دەدا نێ و بە خیوم دەکا ئەوە دەمێنمە وە دە نا دێمە وە خوم تەحویل دەدەمەوە " .

رەحیم وەزعی ژیانی باش بوو . فەقیر نە بوو . مال وەند الی موحتاج نە بوون . بە تایبەت مە سئولی یەکم بوو . من بە نامە کە زور تیکچووم . بوم نووسی کە چاوە روانی نوسینی شتیکی وام لە تونەدەکرد . ئیستا نووسراوە ستە تا برادەران ئاگادار دەکەم .

ئەوەندە ی پێ نە چوو، خە بەرهات کە رە حیمی سولتانیان چوتە باجە وەند مالە شیخ ـــ رە حیمی شەمسی بورهانی و بە وەسیلەی خەزووری حاجی عبد الخالق تە ئمین بوتەوە و ـــ هاتوتە وە مە هاباد .

ئەم کارەی رەحیم لە نیو برادەرانی حیزبی دا تە ئسیریکی زور خە رابی کرد . ببوو بە جیگای باس و رەخنە لە شانە کانی حیزب دا . رۆژیك خە بەری نارد کە دە مەوی چاوم پێ بکەوێ . گوتم با پێ بیبینم . میرزا رە حیم هاتە لام . باسیکی توند و برایانەمان هەبوو . هەنگاوەکەی ئەوم مەحکوم کرد . گوتی :

ـــ لە توانام دا نە بوو خە بات دریژە پێ بدەم . ئیستا هاتوومە وە دە چمە وە سەر کاری خوم . خە یانەت ناکەم . خوم هەر بە دوستی ئیوە دەزانم . بەلام خەباتم پێ ناکری . دە مانچە یەکم لە لایە لە گوندی سەهولان دامناوە . نیشانەی دا سی کە بنیرم وە ری گرمە وە .

چەند رۆژ دوای هاتنە وەی، رۆژیك لە کولانی مزگەوتی عە جەمان ئاژان ـــ پیشی پێ دەگرن . ئەوەند ەی لی دە دەن هە موو گیانی دە شکینن . کومە لانی خە لك ئەولێدانە یان زور پێ نا خوش نە بوو.

## دیمان مه سه له ی ژیانی دایك و بابم

له نه‌وروزدا ئیجاره‌ی‌خانووی باوکم له سه‌غه ده ته‌واو ده بوو . بیکار و کاسبی ما بوونه وه و هیچیان نه بوو. ده بوایه فیکریك بۆ ژیانی ئه وان بکه مه وه .

روژیك مینا خانم خیزانی پیشه‌وا له دوای ناردم و گوتی : "ئیمه کسمان نیه به سه‌رملکه کان رابگا . که سی له تۆش ئه مین تر و باشتر وه گیر ناکه وی . پیم خوشه ماله که ت به ریه قارنجه هه‌م له نه‌غه ده دوور ده که ویه وه و ره نگه ده وله تیش له به ر ئیمه خوت تۆی نه گه یه نی . له‌ویش کویخا و کزیر و کاردارت له به‌ر ده ست ده بن و یارمه تی به برا ده رانی حیزبیش ده که ی ".

پیشنیاری مینا خانم به دل بوو. هه م ژیانم دابین ده بوو هه‌م ده متوانی خه‌بات دریژه پی بده م . دیاره مه سه له‌ی‌ژیان وه ریچوونی دایك وباب وژن ومندالم بۆ من هه میشه مه سه له یه کی گرنگ بووه و به داخه وه له سه ره تای تیکوشانی سیا سیه وه قه ت نه متوانیوه دابینی بکه م. من له ژیانی سیاسی دا هه میشه واقیعی بیرم کرد وته وه . من بوّیه خه‌باتم کرد وه له ژیر ده ستی و برسیه تی نه جاتم بی . بوّیه نه چوو بووه ریزی تیکوشانه وه که له برسان بمرم . لام وایه خه‌باتی هه موو کومونیستیك وتیکوشه‌ریکی راسته قینه هه ر بۆ ئه‌وه یه که نه ته وه کەی له ژیر ده ستی ولـه هه ژاری و برسیه تی رزگار بی و بگاته ریزی گه‌لانی پیشکه و تووی جیهان .

من به پیچه وانه‌ی ئه‌وکه سانه که به فیشال و ئیحساسات به قسه ده لین هه موو شتیك ومال و مندال فیدای حیزب ده کەن، هه میشه گوتوو مه مال ومندالی خوّم پیش هه موو شت له هه موو کەس خوشتر ده وی . ئه‌گه‌ر مندالی خوّم خوشنه وی درو ده که م چون مندالی خه‌لکم خوش ده وی . ئه‌و که سانه‌ی له ژیر ناوی ئینترناسیونالیستی دا واز له مه سه له‌ی نه ته وه‌ی خوّیان دینن درو ده که‌ن . که سیك بۆ میلله تی خوّی خه بات نه کا و بۆ ئازادی نه ته وه ی خوّی تی نه کوشی، چون بۆ ئازادی نه‌ته‌وه‌یه‌ی بیگانه خه بات ده کا . راست نیه . ئه‌وکه سانه م زور دیون که به قسه هه موو شتیکیان فیدای حیزب کرد وه . به‌لام به زوریش ته نیکیان بۆ حیزبله ده ست نه‌هاتوته ده ر .

مەلا عەولای حەیاکی (حەسەن زادە) نموونەی زیندووە . دەیگوت : " بە ئەرەف پێنج مندالم هەن حیزب بلێ هەر پێنجیان سەر دەبڕم . بەلام لە سەر پێنج دینار کە حەمەدەمینی سیراجی لە مەعاشی گیرا بوو ە لە ئەندامەتی دەفتەری سیاسی و کومیتەی ناوەندی ئیستعفای دا و تەلاقی خوارد هەتا هەیە لە حیزبی دیموکراتدا هیچ مەسئولیەتیک قبول ناکا . دیارە ئەو ویشی هەر راست نە بوو . تا بووە بە ئەندامی کومیتەی ناوەندی کە ویشی دادەنان .

بە مینا خانمم گوت : " پێمخوشە بە دوو شەرت . یەکەم دەبێ پرسی برادەران بکەم و پاشان بڕیاری ئەوان بچم . دووهەم دەبێ دەسەلاتی تەواوم هەبێ " .

ـ دەسەلاتی تەواوت دەبێ وکەرلێت ناپرسینەوە . برادەرانیش نابێ دژی ئەوە بن چونکە لە وێش یارمەتیان دەکەی " .

لەم کاتەدا عەولای ئیسحاقی هاتبووە نێو شار . مەسەلەکەمان باس کرد .

عەولا گوتی : " ئەگەر بچیە قارنجە دەترسم یەکی تێکوشانت بکەوی . ئەگەر نەچی وەزعی ژیانی دایک و بابت ناخوشە وئیمە هیچ یارمەتیمان نەداون . با راوەستێین تا پرس بە برادەرانی دیکەش دەکەین .

ـ زور باشە . بەلام ئیستا با من مالەکەم بنێرمە قارنجە با لە نەغەدەوە دوور ــ کەون . ئەوە بۆخۆی نوایە کە . پاشان بڕیاری برادەران چ بوو وا دەکەین .

سەید عەولای ئیسحاقی موافیقی ئەم پیشنیارە بوو . گوتی ئیستا دەراومان هەیە دووسەد و پەنجا تمەنت دەدەینێ بو مالی بنێرە . لام وایە هیچیان نیە . "

دایکم هاتبوو سەرم بدا . ناردمەوە نەغەدە و گوتم ئەگەر وێشترم ناردن بار کەن وەرنە قارنجە . لە مەهاباد خوا حافیزیم لە برادەران کرد و لە گەل پیاوێکی مالە پێشەوا چوومە قارنجە . لە گوندی ( ئاغەلیان ) لە مالە سەلیمی غە تاج شیرخانی دەژیام . مالیك دەولەمەند ، گەورە مال ، سەر ئاوالە . کاك سەلیم پیاوێکی تیگەیشتو ئەندامیکی دلسوز و چالاکی حیزبی . روژانە دەچوومە قارنجە و شەودەهاتمەوە ئاغەلیان . سەریکی ئاغای سالارم دا . گوتی زورم پێخوشە هاتوویە ئیرە . بەلام دەترسم شەپتان و شوفار لیت نە گەرێن . بە پنیك خوَ مات کە . کارە سیاسیەکان بە هی دیکە بکە . لە گەل کاك حەسەنی سرپلاوا کە ئەندامیکی دلسوزی کوردایەتی بوو هاتوو چومان خوَش بوو . شانەیە کی حیزبیم لە سی برادەری تیگەیشتوو پیک

هینا و ریگای کار کردن و هەلسورانم بۆ دامەزراندن . ناردم لە کن میرزا رەحیمی گویکچەلی دەمانچە یەکی چاردەخورم هینا . ئەسپیکی زور شاز و کەحیلم کری . خانم بیاویکی ناردە گوندی و بە رەعیە تەکانی راگەیاند کە بۆ هیچ کاریك نە یە نە شار کاك کەریم ئیختیاری تەواوی هە یە . وشترم ناردن لە نەغەدە مالە کەیان بار کرد و هینایانە قارنجە . دایك و بابم وخیزانیشم بەماشین هاتیوونە مەهاباد ولە ویشە وە هاتنە قارنجە و پاش حەوتمانگ هەمووما لە خانوییك دا لیك کو بووینە وە . بەلام بەداخەوە ئەم کوبوونەوە زوری نەخایاند و ئەم جارە بۆ هەمیشە لیك جیا بووینە وە و قەت یەکترمان نەدیتە وە .

دەمویست توزیك خوّمات کەم و لە گەل ئاغاکانی دەور و بەر کە ناجسن وسەر بەریژیم بوون مودارا بکەم . قارنجە بەرەمەزرایەکی هەبوو ئاوە نە یدەگرتەوە . بەلام بە ئاوی گوندی (سمایل مامە) کە ملکی سمایلی بایپرئاغا وبراکانی بوو ئاو دەدرا . بۆ چەوەندەر خاکیکی بێ وینەی هە بوو . سالەکانی پیشوو مالە برایمی بایپرئاغا کرد بوویان چەوەندەر و بە رەعیە تەکانی خوّیان رەعەمەلیان هینا بوو پولیکیان دابوو بە مالە قازی . ئەوسالیش دەیانویست هەر بەم جورە بیکە نە چەوەندەر . من کویخام ناردوکوتم نەیکیّلن تا دەچم لە کارخانە پەیمان دەبەستم و رەعیە تەکانی قارنجە ئی دەیکەن بە چەوەندەر و لە گەل ئەوانیش ریك دەکەوین .

قەرەوە شایی قارنجە زوریان پێ خوشبوو دەیانگوت بیکارین و ئەو مەزرا یە بکە ینە چەوەندەر تەواوی دەکا .

ئاغاکانی سمایل مامە دەیانویست بە ناوی خوّیان پەیمان ببەستن و لە ملکی قارنجەش چەوەندەر بکەن . ئیوارە یەك سمایلاغا لە دوای ناردم و بوّشەوبانگیشتنی کرد بووم . سێ کەسم لە گەل خوّ برد وچوومە سمایل مامە . زوریان ریّزلیّ گرتم و گوتیان :

ــ پێمان خوشە هاتوویە ئیرە . هیوا دارین جیرانە تیمان خوش بێ . پاشان باسی چەوەندەر و ئەو مەزرایەیان هێنا گوریّ . گوتم : "زورم پێ خوشە پیکەوە بیکەین بە چەوەندەر . بەلام من پەیمان دە بەستم و ئیوە بەشە دراوی خوتان لە من وەرگرن . زوریان شیر وریوی هیناوە فایدەی نە بوو . لە سوار بووندا کە دەگەرامە وە سمایلاغا گوتی ــ ئەوە دەچیەوە لە گەل ئیمە ریك کەوی قازانج دەکەی . ".

قسەکانی بونّی هەرەشەی لیّ دەهات . زانیم لە راپورت وشەیتانی کە شوغلی دایی

ئەوانە بوو راناوەستن . پاش چەند رۆژ ئاغای سالار تەشریفی هات . باسی مەزرا و قسەکانی سمیلاغام بۆ گێراوە . فەرمووی : "زۆر کارێکی پیاوانەت کردوە . ئەوانە کاریان نۆکەرییە جا مانە لە جیاتی چەوەندەر مەزراکەشیان بدە بەیەوە واز لە راپۆرت نا هێنن ."

لەم بەینەدا برادەرانی حیزبی لە مەهاباد قارنجەیان کردە قەلەمدارە . بۆ هەر کوێ چوو بان سەرێکیان لە قارنجە دەدا . کرد بوویانە رێگای ئێوارە و سبەینان بوتەوریزوتاران وشوێنەکانی تر .

مالێکمدیاری کرد کە ئەگەر بێنە قارنجە لەوێ بن . مالەکەی من هەمیشە پڕ بوو لە خەلك . بەلام دەست بەینی لە پڕ وە زۆور دەکەوتن و دەستیان دەکرد بە قسە کە نەدەبوو بیکەن . غەنی بلوریان وقادری یوسفی لە تەوریز رۆژنامەی کوردستانیان چاپ دەکرد . لە هەموو دەورانی حکومەتی مصدق دا نەمان کرد رۆژنامەی کوردستان یا نوسراوێکی کوردی بە ناوی حیزبی دیموکرات بلاو بکەینەوە . ئێستا لە دوای کودێتا باسی ئیمپریالیزم وئاشتی وکودێتامان دەکرد . ناچار نامەیەکم نووسی بۆ برادەران کە هیچ کەرەسە نێرن بۆ قارنجە . لە مەودوا هەر کەس دێ بێتە ئاغەلیانکە بەلاوەیە . برادەری وا هەبوو گویا بۆکارێکی حیزبی هاتوە بەلام چەند رۆژ دەمایەوە کە گویا بحەسێتەوە . ( هیوا دارم تا ئەوکتێبە چاپ دەکری ئەو برادەرانە هەر لە ژیان دا بن جا وە بیریان دێتەوە ودەزانن چەندە بێکار لە قارنجە و ئاغەلیان سوراونەوە . )

تەنەك هەر ئەوە رۆژێك عەولای ئیسحاقی نامەیەکی نارد بوو داوای کرد بوو کە ولاخێکی سواری بۆ بنێرم دەچێتە نێوکەورکان . منیش نامەیەکم بۆ سەعدون ئاغای قورغان نووسی و خواهیشتم لێ کرد کە ئەسپێکی سواریم بۆ بنێری چەند رۆژ کارم پێ یەتی . سەعدون ئاغا بارگینێکی بە زینەوە بۆ نارد بووم . بارگینم نارد و نوسیم تکایە لە پێنج رۆژ زیاتر رای مەگرن ئەمانەت ومرم گرتوە .

پازدە رۆژ پێ چوو بارگین نەهاتەوە . من بە سەر دا گیرام . لە زیندان بوو م سەلیمی مامەفەتاح هات کوتی : "بارگینی سەعدون ئاغا توپیوە ."

بارگین کە وتبوە دەست عبداللە سابلاخیان ، بە قەولی خویان ئەوەندەیان ( ماین مانین ) پێ کرد بوو بارگین لەکولتە یەی کەورکان تۆپی بوو . بە هەزار حال تا زینەکەیان وەگیر کەوتبوە . لە زیندان بووم کاکە رەحیمی سالار هاتە لام . تکام لێ کرد بچێتە کن سەعدون ئاغا ومەسەلەی بارگین عیلاج بکا .

کاکە رەحیم چوو بوە لای سەعدوون ئاغا و گوتبووی کارە هاتوە و فلان کەس ئێستا لە زیندانە . چەندی دەلێی دەیدەین لە جیاتی بارگین . "

سەعدوون ئاغا گوتبووی : " خولا دەکا ئەو ئازاد دەبێ ، بارگین بە قوربانی ئەو بێ . " نامەیەکیشم بۆ سەعدوون ئاغا نووسی و سوپاسم کرد و پیاوەتی ئەوم هەر لە بیرە و لە بیر ناچێتەوە .

غەنی بلووریان لە گەڵ چەند کەس لە تەورێز خەریکی رۆژنامەی کوردستان بوو. پێنج ژمارەی لی بلاوکردەوە و رۆژنامە کە گیرا جێگای دەرزراوە و بەکێ کەوت .
هەوەلین جار پاش کودەتای ٢٨ی گەلاوێژی ١٣٣٢ ( ١٩٥٣) نێوی حیزبی دیموکرات دەهات و رۆژنامە وەك ئۆرگانی حیزب بلاو دەکراوە . بەلام بەرنامە یەك و تاکتیك و ستراتیژیەك لە گۆڕێدا نە بوو . هێندێ برادەر بۆ بەرنامە لە کوردستان دەسوڕانەوە . و هێندێکیش لە تەورێز و تاران خۆیان حەشاردا بوو .

منیش لەو کاتەدا کە لە سەر ملکی مالە شێخ هێدی پێشەوا ئاغا بە تێم دەکرد کارم ئەوە بوو کە برادەران بۆ تەورێز و تاران و سەقز بەرێ بکەم و یا ئەگەر دراو یا بارگین یا شتێکی دیکە یان پێویست بایە لە سەر حیسابی مالە قازی جێ بە جێی بکەم .

# زیندان و رووداوەکانی حەپسخانە

رۆژی ١٥ ی مانگی پوشپەری ١٣٣٣ (١٩٥٤) بە یانیەک پاش نان و چا خوا
ردن سوار بووم کە بچم سەری مەزرا بدەم . پیاوێک هات گوتی : " هیندی عەجەم
لەو بەری چۆم راوە ستاون و داوا دەکەن لوتکە بچێ بیان پەڕێنێتەوە ".
کە راهەت چوومە سەر چۆم . دیتم سە رهەنگ شکوهی کوڕینە . لە نەغەدە
یەکترمان دەناسی . لەوبەری چۆ مەوە بانگی کرد :
ـ ها . . . ئاغای حسامی ئەو بەر خانەی مالە قازی بە تەنیا دەخوێ و ئێمە شت لە
بیر کردوە . چون وا دەبێ . ئەگەر میوان رادەگری لوتکەیەک بنێرە بپەڕینەوە .
بە کابرای لوتکەوانم گوت : " بچوو بیان هێنە . خۆم کە راسەوە مال هیندی کاغەز و
کتیبم لە مالێ هەبوون رام گویزتن و دە مانچەکم دا بە پیاوێک بیشارێتەوە و چوومە وە
سەر چۆم و جە ناب سەرهەنگ لە کەل یازدە سەرباز پەڕینەوە .
باوکم نە ساخ بوو لە ژووری دریژ بوو . کە چاوی بەعەجەمان کەوت ئەوەندی
دیکە ترسی تیکچوو . دایکم و خیزانم زەرد هەلگەران و تا هە قیتیان نە بوو . پاش ئەو
هەموو دووری و ناڕەحەتیە تازە پشویەکمان دەدا و هەموومان لە خانوویەک دا کۆ
دە بووینەوە و ژیانیان ریک و پیک دە بوو . دایکم و خیزانم دلخوشی دانەوە .
سەرهەنگ چایەکی خواردەوە وکوتی ئیمە بۆ نانخواردن گیر نابین . ستادی لە شکر
لە مەهاباد داوای تۆی کردوە . بە داخەوە کاتیکی خەراپ هاتوم . باوکت نەخوشە
بە لام هیچ نیە سوژی دە گەڕی یەوە . با بڕوین وەدرنگی نەکەوین . "
گوتم : " ناکری تۆ بچیەوە من بە بانی خۆم دەچمە مەهاباد و باوکیشم دەبەمە

سه ر د وکتور .

ــ سەرهەنک کیسرا سەروکی ستاد داوای کردووی . با بروێن .

چار نه بوو . دایك و بابم دلخوشی دانەوە . سواری لوتکە بووین و لە چومی

پە رینە وە ماشینە کەیان راوە ستا بوو سوار بووین چووینە حاجیابات مالە قازی بابی

کاك ئه میر . لەوێ هەستمان بە مە ترسی کیران کرد . بە لام نە بوونی بە رنامە یەکی

شورشگیری ، نه بوونی سیاسه تیکی روونی حیزبی . دیار نه بوونی شیوه ی خه بات ،

سەر لێ شێواوی کادر و ئەند امان لە سەرە وە بۆ خوارێ ، منی دەست ویی بە ستە لە

بەر دە ستی سەرهەنک نا بوو . کاك ئه میر بە باوکی گوت بزانە چەند بەرتیلی دە وی

بیدە یە با کاك کەریم نە با . جەنابی قازی قسەی لە گەل کرد بوو گوتبووی کاتی کار

و کاسیبە . کارەکانی کوندی پە کیان دە کەوی . . . تەنەت دە دەمێ حسامی مە بە .

ئەم سەرهە نگەی دە مناسی و لە تە نیکینی بە ند بوو قبولی نە کرد بوو .

رویشتین . لە ریانە وا کوتی : " کەرمایە . تۆ بچوو لەموسافیر خانە ئیستراحەت

بکە . دوای نیوە رو وە رە لای من سلاویکیش لە خانم بکە و نامە یەك دە نووسم بچو

مە هاباد . سەعاتی سی چووم مالە سەرهەنگ و چایەکم لای خانم خوارد ەوە و خانمی

سە رهەنگم لە نفە دە دە ناسی . لە گەلم هاتە سەر شەقا م و ئوتو بوسیك بۆ مە هاباد

دە چوو . بانگی دژبانیکی کرد گوتی : سوار بە لە گەل ئەوە بچۆ مە هاباد . زیندا

نی نیه ها . . " .

رویشتین ئیوارە گە یشتین . چووینە موسافیر خانەی کەریمی خوسرە وی . بە کابرا

کوت تولیرە بە من تا مالی قازی دە چم و دێمە وە . قبولی نە کرد . چووینە ستادی

لە شکر . ئە فسەریك لە دە فتەری ستاد بوو ناوی پرسیم . تە لیفونی کرد بو شارە

وانی گوتی : " جەناب سەرهەنگ کوتوو یە رایکرن " .

بردیانم بوشارە وانی و بێ سەر وسەدا دایان کردم . بە یانی سەر گورد

وە کیلی سەروکی شارەوانی مە هاباد هات . لە گەل سەر گورد وە کیلی ناسیاریمان

هە بوو . ئیسانیکی باش و ئازاد یخواز بوو . بانگی کردم بو دە فتەر . کە چوومە ژور

پیکەنی گوتی : " چیت بێ بلێم ؟ . ئیوە ش دە لێن شورشگیرین . ئیوە ش خه بات

دە کەن ؟ . وەك سەر دەکەونە بەر دە ستی ئەوانە . چۆن تولە کوند ناتوانی خو

وە بەر دەست نە دەی ؟ . بەرت نادە ن . دە میکە پێوە ن بتگرن " .

دوو روژ بۆ پرسیار له زیندان دا بووم .پاشان بردیانمه کن سەرهەنگ کەمرا سەرۆکی ستادی لەشکری مەهاباد . گوتی : "خانمی قازی ناردوویەتە لام کە ئازا دت بکەین . لە بەر مالە قازی نامانەوێ بتگرین . بچوو بە شیمانسی و تنفر نامەیەك لە حیزبی تودە بنووسە و وەفا داری خوت لە حاست ئەعلا حەزرەت رابگەیینە تا بنووسم ئازادت بکەن و بچو خەریکی ژیان و کاری خۆت بە".

گوتم : "من تودەیی نە بووم وکارێکی واشم نە کردوە لێی پەشیمان بم و پەشیمان پەشیمان نامە بنووسم . من بە هیچ وخۆرایی گیراوم ."

ــ بەرۆ بیری لیّ بکەوە دە بۆ ئەوشتانە بنووسی .

چەند روژ بۆ چوو دوکتور شیرازی هاتە لام و گوتی : "خانمزوری هەول داوە کە تۆ ئازاد بکرێی . سەرۆکی ستاد قەبولی داوە. بەلام دە بێ شتێك بنووسی . من دەیبەم بو سەرۆکی ستاد وئازاد دە کرێی ".

گوتم : "هیچ نانووسم . خە تاییەکم نە کردوە کە پەشیمان بمەوە . تا پازدە روژ هیچیان لیّ نە پرسیم . پاش پازدە روژ لە باز پرسی لەشکر بانگیان کردم . سەرهەنگ خواجە نووری دەستی کرد بە پرسیار و لیکولینەوە .

ــ بۆ چوویە شوورەوی ؟

ــ من چوومە فیستیوال وبە ئیجازە و پاسپورتی ئیرانی چووم . ریگامان بە شوورەوی دا بوە . لەسەرە تا گوتی بنووسە هەر چی لیّم دە پرسی راستی دە لیّم . ئەوەم نوسی . گوتی : "چەند زمانی بیگانە دە زانی ؟

ــ دوو . . . دوو زمانی بیگانە دە زانم

ــ بیان لیّ بزانم کامانەن؟

ــ فارسی وتر کی .

ئاگری گرت . راست بووە توورە بوو . "مەگەر تو ئیرانی نی ؟

ــ بە لیّ ئیرانیم بەلام کوردم . زمانی فارسی و ترکی بۆ من بیگانەن .

ــ هەر ئەوە ندە بۆ تاوانباری تو بەسە .

هیندی پرسیاری دیکەی لی کردم هیچیان شتیکی وا نە بوون کە بۆ دادگا ببن . گیرایانەوە بۆ زیندان .

## دیمەنیکی دلتەزین

لە بازپورسییان دەگێڕامەوە ئاژانێك و دوو سەرباز لەگەڵم بوون . کە پشتمە بەر دەرگای شارەوانی، تەماشام کرد بابم بە رە و رووی دەرگای شارەوانی لە بن دیوار لە سەر عەرز دەرێژ بووە . بە جارێك دنیام لە پێش چاوان تاریك بوو. رویشتم بۆ کن بابم . هەر چەند سەرباز و پاسەوان دەنگیان دام جوابم نەدانەوە. چووم دەستم گرت و راستم کردەوە و هێنامە دەفتەری زیندان . بابم پێشتر نەخۆشی پشت ئێشەی هەبوو زۆری لە بەر نارەحەت بوو. بە نەخۆشی هاتبووە مەهاباد کە چاوی بە من بکەوێ . لە زیندان گوتبوویان بردوویانە بۆ باز پورسی . ئیتر خۆی پێ رانەگیرا بوو روو بە رووی زیندان لە سەر عەرز راکشا بوو. من زۆر تێکچووم و پێم گوت نە دە بوایە بە نەخۆشی خۆت ئەزیەت بدەی .

گوتی پێیان گوتووم نامە بۆ سەر لەشکر موقبیلی بنووسم.

ـ هیچ فایدەی نیە . دەلێن دەبێ تەنفر نامە بنووسی . منیش ئەوە ناکەم. دەزانم ئێوە زۆر پەریشان و نارەحەتن . بەلام تکا دەکەم بم بەخشن . من نەمتوانیوە بو ئێوە خزمەت تکارێکی باش بم . بەلام تازە رابردووە . ناتوانم لەو رێگایە بگەڕێمەوە کە خۆم هەڵم بژاردووە . . پێم خۆشە بچیەوە . باز پورسێکی وای لێ نە پرسیوم . لە وانە یە ئازادم بکەن . بچولای دوکتور و پاشان گیرمەبە بچووە ."

هەستا بە چاوی بە فرمێسکەوە ماچی کردم و رویشت . ئەوە ئاخرین دیداری ئێمە بوو تاڵترین رۆژ بوو لە ژیانم دا . جارێکی دیکەش بردیانم بۆ تەحقیقات و باز پورس گوتی : "دەوسیەکەت دە نێرم بۆ دادگای لەشکر .

## سەرگورد وەتەمینی و سمایلی ئاژان

لەم ماوەیەدا سەرگورد وەکیلی سەرۆکی شارەوانی مەهاباد یان کۆڕی و سەرگورد

وەتە مینی سابلاخی یان کردە سەرۆکی شارەوانی . کابرایەکی بێ شەرەف ، بێ حەیا ، کۆنە پەرست و بێ هەموو شت . زۆریش لە برادەرانی دیکەگیرا بوون ولە دوو زوردە ژیابین . رۆژێك لە گەڵ میرزا حسینی فروهر رۆژنامەمان دەخویندەوە .
سمایلی حسامیش برنجی دە بژارد ولە بەر خۆیەوە گۆرانی دەگوت . سمایلە کە چەلی ئاژانیش لە حەساری زیندان بوو . هاتە بەر دەرگا و گوتی : " بوکیمدی ئیشك کیمی ئانگرر " . ( واتە ئەوە کێ یە وەك کەر دەزەرر ێنێ ) .
من راست بوومەوە ولە پێشەوە شەقێکم لە گوندێنی دا . پاشە وپیانۆکە وت وسەری شکا بوو بە هەرا و ئاژان هاتن و کە چە لیان بردە دەر . زۆری پێ نەچوو بانگیان کردم و بردیانم بۆلای وەتە مینی . سلاوم کرد ودانیشتم . وەك سەگی دڕ بە گژم داهات :
ـ کێ ئیجازەی داوە دانیشتی ؟
ـ ئیجازەی کەسی ناوێ . تونارد وونە بێمە لات. دادە نیشم . ئەگەر کارت نیە ئەوە رۆیشتم . هەستام کە برۆم گوتی :
ـ وەرە . . راوەستە . . کارم پێتە . . تۆلە زیندان دەتەوێ هار بی ؟ . چاولی کە من سەر گوردم . .
دانیشتمەوە وگوتم هەرا هەرای ناوێ . سەرگورد بی یا نە بی فەرقی نیە . دەلێ ی چی ؟
ـ بۆلە پاسەوان دەدەی ؟ دنیا بێ حاکم و دەولەت نیە . نازانی ئەو هەموو تودەیی یە لە خارك و فە لە کلکە فلاك دا ئەوە دەرزن . بۆ خارکت دە نیرم .
ـ لە خارك و تە بعید ناترسم . پاسەوانی بێ شەرەف و بێ حەیا دە بێ لێ ی بدەری بە پاسەوان بلێ بە ئەدەب بێ جنیو نەدا کەس لێ ی نادا . ئیوە بزانن ئیمە زیندانی سیاسین . دەزانی لە سەر چی گیراوین ؟ . ئیجازە نادەین کەس لە حاست ئیمە بێ ئەدەب بێ .
کە وا بە توندی وەلامم دا وە دا یمنواند وگوتی :
ـ هەستە برۆ خۆت تووشی تە بعید مەکە .
من هاتمەوە ژوور و سمایلە کە چەل ئیتر نە هاتەوە زیندان . لە پیش ئەوە دا کە بچمە دادگا هاورێ یانی حیزبی و دوست و برادەر دە هاتنە لام و زۆر جار لە مالە پیشەوارا نان وچیشتیان بودە هینام . لەگەل برادەران پیکە وەمان رادە بوار . چەند

لا وی غەیرە سیاسی گیرا بوون بریارمان دا دە رمیان بیّ بلێین . سەلیلی حسامی ئەو کارەی‌وە ئە ستو گرت و دەرسی بیّ دە کوتن . میرزا وسینی قروهر کتیبیکی قانوونی سزای گشتی لە لا بوو گیراوەکانی رێنوێتی دەکرد نامەی بوّ دە نووسین . زیندانسمان کرد بوە مە درە سە . تاقە ناخوشیەك ئەوە بوو برادەرانی مەهابادی جار وبار بە کیشە دە هاتن . وشمرەندوکمیان دە بوو . پێویستە بلێم گشتیان بە چاویکی ریّز و ئیحترام چاویان‌لە من‌دە کرد . زور جار ئیواران لە حەساری زیندانی شایی و هەلپەر کیّمان ساز دە کرد وگیراوەکانمان دلخوشی دە داوە .

کاکە رەحیمی جەوانمەردی‌قازی یەك دوو جار هاتە لام . سەلیمی مام فەتاحی ــ ئاغە لیان رانك‌و چوخە یەکی سیی جوانی بوّ هێنا بووم . مینا خانم پیاوی‌نارد بوە لای شیخ محەمەدی شیخی برهان کە لای سەر لەشکر موقبیلی تکا بکا ئازادم بکەن . بەلام شیخ‌وتکا و پارانەوە لای زور داران ود اگیر کەران نرخی نییە .

لە مانگی‌کە لاویژدا برادەریکی خەلکی‌قارنجە هات‌ونامە یەکی بوّ هینا بووم دایکم خە بەری کوچی دوایی باوکی بوّنووسیبووم . زور نارەحەت‌و پەریشان بوم دایك و ژن وکچیکی دوو سالەم بیّ کەس و بیّ سەر پەرشت‌دە مانەوە . برادەران مجلیسی فاتیحەیان دانا . مەلاغەفووری‌حافزیان هینا قورئانی‌خوێند . زور کەسی‌خەلکی ــ قارنجە وئاغە لیان و پیر وەلی باخی و سرێلاواە هاتبوونە سە رە خوشی . جیرانە کانی قارنجە گوتیان لە خەمی دایکت وخیزانت‌دا مە بە، وەك دایك و خوشکی خوّمان خزمە تیان دە کەین .

هیچ نە دە کرا . راست پاش‌دە روژ نامە یەکی دیکەم بوّ هات نوسرا بوو خیزانیشم مردوە . ئەمجارە شی‌مەلا غە فوور هاتەوە زیندان وخەمی تەنیایی دایکم وکیژولیکی منال، جەرگی ریك دە کوشیم . ئاموزایەکم هەبوو تازە دە کە پشتیّ ئەو پش دایکی بەجیّ هێشت بوو رویبوو . نامە یەکم بوّ دایکم نوسی کە بیّتە مەهاباد و کچە کەش‌لەگەل خوّ بێنی، با چاوم بیّ یان بکەوی . روژیك دوای‌نیوە روّ ئاژان‌بانگیان کردم گوتیان دایکت هاتوە . کە چوومە دەر دایکم وخوشکم لە وێ‌بوون . هەستان ماچیان کردم . کە روانیم کە لاویژم نە دیت .

دایە گیان ئەدی کوا کە لاویژ ؟

دایك لە پرمەی‌گریانی دا . « کە لاویژ دوێنی مرد . مالی لیّ چول کردم »

بە پێوە ڕاوەستا بووم . خورپە یەکم لە دڵی هات . دایکم دڵخوشی داوە . هەستم بە خەم و خەفەتیك کرد، بوّم نەدە چوە سەر یەك ، بوّچی خورپەم لە دڵی هات و ئەو خەمە بوّ دایکرتم؟ .

داینێشتم . دایکم وخوشکم پستر دڵخوشی دانەوە . بە دایکمگوت : " توّناتوانی بە تەنیا لەمخانویەك دا بژی . مالەکەت بارکە و بچوّوە کن خوشکم . نامەیەکم بوخانمە خانمنووسی کە پولیك بدا بە دایکم تا مالەکەی پێ بار بکا و بچێتە وەلای خوشکم . زور سوپاسی دەکەم چلەتەنی دابوویە . زاوەکەمان هاتبوو مالەکەی بارکرد بوّ بوّلای خویان . ( ئەو دوعایەم لێ گیر ببوو کە دەلێ ( مالت بشتەوە سەر بەشی دەمالان)

پاترچە ند روژ دادگای سوپای مەهاباد نامەی بوّزیندان نووسیبوو کە پەروەندەی فلان کەس هاتوتە دادگا و پیویستە بوّ خویندنەوەی پەروەندە و دیاری کردنی پاریزەر، بینیّرنە دەفتەری دادگا لە سەر بازخانەی مەهاباد .

لە دەفتەری زیندان بانگیان کردم . گوتیان خوّت سازکە دەبێ بچیە سەر بازخانە بوّ دەفتەری دادگا . چوومە وە ژوور بە برادەرانمگوت پەروەندەکەیان داوە بە دادگای نیزامی و ئە شێ بچمە سەر بازخانە بوّ خویندنەوەی پەروەندە . برادەران نارەحەت بوون . هەموو کەس بووم لە مەهاباد بە تاوانی سیاسی لە دادگای نیزامی دادگایی دەکرام .

رانك وچوخەی سپی خاوێنم کردە بەر و هەر وەك بوّ سەر شایی بچم خاوین ، قوز و شیك ، هێندێ کلّەو و گوڤارم بە دەستەوەگرت و هاتمە دەر . دوو سەر باز وئاژانیکیان رەگەڵ خستم و بەرەو سەر بازخانە . زیندان و سەر بازخانە ئەو سەر وسەری شار بوون . دەبوایە بە نیوە راستی خیابان و بە کوّلانەکانی شاردا بروّم . شارەوانی ماشینی نە بوو . من بە خەباتی رابردووە بە سەفەری فیستیوال لە نیّو مەهاباد ناسرا بووم . بە تایبەت لاوانی کوردستان پیش کودیتا بە رنامەی پیشوازی منیان ریکخستبوو سەفەری من بوّ فیستیوال دەنگی دابووەوە . لە ئەوسەرەو بەری شەقام دەست و لایەنگرانی حیزب کە دەیان دیتم هەلدەستان و لە بنەوە سلاویان دەکرد . لە کوّلان کیژ وژنی مەهاباد کوّ دەبوونەوە و تەماشایان دەکردم و بەدەنگ دوعایان بیدەکردم . بەفیزە وهەستم بە شانازیەك دەکرد .

کە چومە دەفتەری دادگا، پەروەندەیان لە بینرانام و گوتیان دەتوانی بیخوینیەوە و یاد داشتی لێ هەلگری . پیویستە بوّ دیفاع پاریزەریك دیاری بکەی .

لە بارەی پاریزەرەوە گوتم : " من پارەم نیە پاریزەر بگرم . دادگا کێ دیاری دەکا خۆی دەزانــی . لە پەروەندەدا هیندێ شتم بۆ روون بــووە کە پێشتر بیرم لێ نەدەکردەوە . راپۆرتێك درا بوو بە روکنی ٢ ی سوپا کە گویا من مەسئولی کومیتەی وەزیرانــی کوردستان بووم . لەکاتی گەرانەوەدا هاتوومەشامات . لە (دێمەسور) میوانــی مارفاغا بووم . روژێك لەشامات لەگەڵ مارفاغا چوو بوومە راوە کە رویشك . روژی چوونە راو ، جل وبەرگم چوونم بۆ محالی شازادە ، سەفەر بۆ سەقز هەموو بە روکنی ٢ گوترا بوو . ئاگایان لەوە نە بیبوو کە لەمە هابادم . نووسیبوویان ما وە یەکە ونــە .

هــەموو هەر راپورت بوو بە لگەیەك نە بوو کە تیکۆشانم ســابیت بکا . دەمتوانـــی یەك روژ پەروەندە بخوێنمەوە بەلام بۆ ئەوە پتر بە نیو شاردا هاتوو چــوبکەم نووسیم دەبــێ پینج روژ بێمە دەفتەری دادگا تا پەروەندە تەواو بخوێنمەوە و خۆم بۆ دیفاع لە دادگا ئامادە بکەم . چوونم بو سەر بازخانە بەو شیك و خاوێنی و سەر بەرزی٬ خەلکی توزێك وریا دەکردەوە و غیرەتیکی وەبەر دەنان .

دەفتەری دادگا نووسی کە پینج روژ بیهێنن بۆ دەفتەر . دادستانــی دادگا لە ئیدیعا نامــەدا نووسیبووی : " عبدالکریم حسامی لە تیکۆشانــی دژی دەوڵەت دا ئەوەندە بە ژیری و وریایــی جولاوەتەوە کە بە لگەیەکی بە دەستەوە نەداوە . بەلام راپورتەکانی بە روکنی ٢ و شارەوانی کە پشتوون نیشانی دەدەن کە یەکێك لــە مــەسئولەتیکۆشەرەکانــی حیزبی تودە بــوە . هەر بوویەش نارد وویانە بۆ شوورەوی . نازانین لە شورەوی چاوی بەکێ کە وتوە و چــی کردوە بەلام هەر ئەوەندەی نیشانـــی دەدا کە چەندی باوەر پیکراوی حیزبی تودە بــووە . لەتەواوی تیکۆشانــی خــوێ دا بو رووخاندنــی ریژیمی پاشایەتی و جیا کردنەوەی کوردستان لە نیشتمان خەباتــی کردوە . بە گوێرەی مادەی ٣١٧ ی قانونــی موجازاتی کشتی سزاکە ئیعدامــە . داوا لە دادگای بەرێز دەکەم لەبارەی عبدالکریم حسامی یەوە ئەم مادە یــە لــە بــەرچاو بگری " .

لە ئیدیعا نامــەی دادستان روو نووسیکم هەلگرت وگــەراسە وە . لە گەرانەوە دا لەبەرامبەر ستادی سوپا تووشی کاك ئەحمەدی سەرووکانی وچــەند ئاغایــەکــی ماســەنی بووم . ئەوئاغایانەی کە پیش سەفەرم بۆ ئوروپا دەهاتن ولە خولا یان دەویست قسە یان لە گەل بکەم و لە دوورەوە سەریان دادەنواند . کەچاویان بە من کەوت سلّ بوون ووەرگەرانەوە سەریان لە بەر خوّنا و لا یان دا . جاریکی دیکە ش ترسە نوکــی و

بێگانە پەرستي و هیچ و پوچـی ئەم چینە چـە وسێنەرەم بۆ دە رکەوت و کزەم لە جەرگی هات بۆ ئەوە کە زەحمە تکێشانی کورد لە بەر دەستی کێ دا رە زیلن .

گەیشتمە وە زیندان براد ەران نانیان نە خوارد بوو چاوە روان بوون . کە دەرگایان کـردە وە و چـووم ـە ژوور بەجارێك گیراوە کان دەورە یان دام و دەستیان کرد بە پرس و باس. .

ـ بۆمان بگێڕە وە چ بوو؟ دە لێن چـی ؟

ـ هیچ نە بوە. دادستان بە گوێرەی ماد ەی ٣١٧ داوای ئیعدامی کـردوە .

هێندێ لەزیندانیە ئاسایی یەکان قوت بوون . "جا چۆن ؟ ئیعدامت دە کـە ن؟ .

ـ داد ستان وا دە لـێ . جا ئەگەر ئیعدامم کـرام رانك و چوخـە کانم بدە بـە رە سوول .

رە سوول کـێ بوو ؟ . ڕۆژێك کورە جحێلە یەکی هەمزەکاری شازدە سالەی ڕوت و کز ود اماویان هێنا زیندان . رە سوو خە لکی سە رکە پکانی بیتوێن کورد ستانی گەرمـێن بوو. لە گەل شێخ عـەلی چـە تە بۆ ڕێکرد هاتبوونە ئێران و لە نێزیك شاریکەند ژاند ا رمـە دەوریان دا بوون . چـەتەکان پێنج کەرکوژرا بوون و ئەم مند المش کە بێ چـەك ببوو نانی بۆ هە لگرتبوون گیرا بوو . لە زیندان دە گریا . دلخۆشیم داوە و لیباسم بو کری و کتێب و دە فتە رم بۆکرین و دە رسم پێ دە گوت . ڕۆژێ دەهات لە کن ئێمە بێدەنگ دادەنیشت .

گوتم ئەگەر کوژرام رانکو چوخەم ئی رە سولن . دوو ڕۆژی دیکەش چووم ـە داد گا و سەر ڕێگام لە کولانە کان وەك جورە خۆپیشاندانێ لێ هاتبوو . بۆڕۆژی چـوارەم بەهانـەی چیپیکی ئە رتەشی هات و سواریان کرد م بو داد گا . لە ڕوکنی ٢ نوسیبویان حسامی بۆخو پیشاندان دە نێرنە سەر بازخانە . ئیتر نە یانهێشت بە پێ بچم . تا داد گا تە واو بوو بە ماشین دە یان بردم .

## دیسان حاجـی سەید عـەولا ئەفەندی

لەم سەروبەندەدا حاجـی سەید عـەولا ئەفـەندی تەشریفی هاتـە مـە هاباد . دایك وباوکە سروکاری گیراوسیاسیەکان چوو بوونە لای و داوایان لـێ کرد بوو کـە

لەکن سەر لەشکر موقبیلی تکایان بۆبکا و بەلکوو ئازاد بکرێن . سابلاخی زوریان ـ مریدی نەهری و حاجی سەید عەبدولا ئەفەندی بن . برادەران هاتیان دام کە منیش نامە یەکی بۆ بنووسم . نامە یەکم بۆ نارد و نووسیم من لە سەر قەول و تووسراوەی جەنابت هاتووسەوە و ئێستا تەرگیراوم و لە دادگای نیزامی موحاکەمە دە کریم . هیوا دارم هەر وەك بۆت نووسیبووم کاریکی وابکەی ئازاد بکریم .

بە خوا وەك پیاوان هیچ وەلامی منی نەدابووە . بە کەس و کاری هاورێ گیراوەکانی گوتبوو . " مندالە کانتان نەسیحەت بکەن وە دوای کاری بێجێ نەکەون ".

هەلوێستی حاجی سەید عەبدولا ئەفەندی لە نێو برادەران بووە باس و دەم بە دەمە . هێندی لاوی خوێن گەرم قسەیان پێ گوت . میرزا وسینی فروهەر توورە بوو دیفاعی لێ دە کرد . منیش گوتم ئەوە کێشە و نا خوشی ناوی . ئەویش وەك هەمو شیخ و دەرە بە گیك قازانجی چینایەتی خوێدە پاریزی . هەر کەس توانا و دەستەلاتی هەبوو لە گەل ئەوە .

میرزا وسین بە کزمە اهات و گوتی : " هەر کەس قسە بە مالە نەهری بلێ خائینە ـ دەك خوا موبارەکی نەکا . تو ئەوە لە سەر سیاسەت لە وانە بە ئیعدام بکەن و ـ تازە دیفاع لە مالە نەهری دەکەی ؟ ".

لە گەل میرزا وسین بە کێشە هاتین . برادەران توند بە سەری دا هاتن و ئاشت بوو ینە وە .

پاش ئەوە کە خوێندنەوەی پەروەندە تەواو بوو دەستم کرد بە نوسینی دیفاع و بریارم دا بە توندی دیفاع بکەم . میرزا وسین لە نووسینی دیفاع دا یارمەتی دام و یوسفی ریزوانی کە خەتی خوشبوو دە ینووسیەوە . دیفاعیاتەکەم بە خەتی یوسفی ریزوانی تا رویشتنم بۆعیراق هەر مابوو . پاشان لە گەل کتیب و بەلگە و نووسراوە هەموو لە بەین چوون و نەمان .

لەلایەن دادگای نیزامیەوە ستوانیکی ئەرتەشی کرا بوو بەپاریزەرم کە لە دادگا دیفاعم لێ بکا .
روژیك هاتە زیندان وبانگی کردم . گوتی : " چووم پەروەندەکەم تەماشا کردوە . دادستان ئیدعا دەکا کە تۆتودەیی بووی . بۆوخانی ریژیمی پاشایەتی هەولت داوە . ئەوە تاوانیکی گەورە یە . تۆپێویستە هێندی سەنەد وبەلگە پەیدا بکەی لە دادگا ئیمە نیشانی بدەین کە تۆئەندامی حیزبی تودە نەبووی . !

گوتم : "جەنابی سەتوان وا دیارە تو سەرت لەقانون و کاری قەزایی دەر ناچی من دە لیێم تودەمی نیم . لەنیو چاوانیشم نە نووسراوە . دادستان کە ئید یعایەکی ئاوا دەکا دەبێ ئیسپاتی بکا وسەنەد و بەلگەی هەبێ کە من ئەندامی حیزبی تودە بووم . بێجگەلە راپورتی بەدرۆ، بەلگەیەك لەسەر تێکوشانی غەیرە قانونی من بەدەستەوەنیە ."

زورم قسە لەگەل کرد، بۆم حالی نە بوو کە دادستان دەبێ سابیتی بکا من تودەیی بووم . ئەفسەری شاهەنشاهیم بۆحالی نە بوو.

لەم بەینەدا رەسول هەموو روژێ دەیپرسی : "کە نگی دادگا کەت دەست پێ دەکا ؟"

روژێك لەحەسارشە ترنجمان دەکرد وتیندانی لیێمان کوببو نە وە تەماشایان دەکرد . رەسول هات و پرسی : "کاك کەریم نە چوو یە دادگا ؟ .

کابرایەك گیرا بوو بە ناوی سەحمود چاردا وروو. لە سەر دزی گیرا بوو . هەموو مانگێك بە ریان دەدا و دەگیراوە . سەحمود لێی ی راست بووە وغاری دایە :

ـ سەگباب دە تەوی ئیعدامم بکرێ تا رانك و چوخەت وەگیر کەون ؟ . بە هەزار حال سەحمودیان لە کۆل رەسوو کردەوە .

روژی دادگا ماشینیان هینا سواریان کردم و بۆسەربازخانە . لە دەرگای ژوورێك نووسرا بوو دادگای ئاشکرای حسابی دەست پێدەکا . دووسی سەربازو گرویانی عەجەمیش هاتبوون دانیشتبوون . سەروکی دادگا ئەفسەریکی ئەرتەشی رایگە یاند ئەگەر تاوانبار یا پاریزەری لە ئاست سەلاحیتی دادگا قسە یان هەیە بە بیگەن .

پاریزەرەکەم دەنگی نە کرد . من هەستام وگوتم :

ـ بە گوێرەی قانون دادگا سەلاحیەتی نیە بە تاوانی من رابگات . دادستان لەنامە خوێدا منی تاوانبار کردوە کە بۆ تیکدانی ریژیمی پاشایەتی هەولم داوە . کەوا بوو تاوانەکەم تاوانی سیاسی یە . بە گوێرەی قانون پێویستە دادگوستەری وهەیئەتی منصفە بە تاوانی من را بگەن . ئیوە نووسیوتانە دادگا ئاشکرایە . بەلام کێ دەزانێ ئەورو من لەسەربازخانەدا دادگادەکرێم . ئیوە ئەگەر روژێ دادگاتان لەشار راگە یاند بایە ئیستا لەوانە بوو سەدان کەس هاتبانە دادگا . من کەسێك بووم بە نوینەرایەتی هەزاران لاوی کورد لەگەورەترین فیستیوالی لاوانی جیهان دا بەشدار بووم . ئیستا

بە نهێنی لە سەر بازخانە موحاکەمە دەکەن . داوا لە دادگا دەکەم نەبوونی سەلاحیەتی خۆی رابگەیەنێ و پەروەندەکەم بدەن بە دادگوستەری .

پاش قسەکانی من، ئێمەیان وەدەرنا و دوای بیست دەقیقە بانگیان کردینەوە و رایان گەیاند کە دادگا سەلاحیەتی هەیە . بە یانی دادگا کاری خۆی دریژە پێ دەدا .

کە راسەوە بۆزیندان جارێکی تر بە کومەل چاوێکمان لە لایەحەی دیفاع کرد وهێندی لە برادەران بۆیان وابوو توندە و پێویست ناکا وا بە توندی جواب بدرێتەوە .

بە یانی سواری جیپێکی ئەرتەشیان کردم و بۆسەر بازخانە . دادگا بە خوێندنەوەی ئیدیعا نامەی سەرگورد رەمزی دادستانی سوپای مەهاباد دەست پێکرا .

لە ئیدیعا نامەدا بیجگە لە هێندی قسەی بۆجسێ شتێک نەدەبینرا . سەروکی دادگا رووی کردە ستوانی پاریزەر کە هەستێ دیفاع بکا . ستوان هەستا هێندی قسەی کردن، لە قسەکانی دادستان بێ تامتر بوون . من داوام کرد کە رێگا بدەن خوم دیفاع بکەم . هەستام و گوتم : "

ــ ئیدیعا نامەی دادستان ئەوەندە دور لە واقعیەتە و بێ سەنەد وبەلگە منی تاوانبار کردوە کە پێویست بە دیفاع ناکا . چاوەروانی ئەوەم دادگا ئیدیعا نامە رەت کاتەوە و حوکمی بێ تاوانیم بدا . دە بوایە سەنەد و بەلگەیەك هەبایە تا من دیفاع بکەم . مەعلوم نیە دادستان بە گوێرەی کام بەلگەمن تاوانبار دەکا ؟ "

دادستان هەستا گوتی : " راستە کە کە رێبەرحسامی لە ماوەی تێکۆشانی خۆی دا بەلگەیەی دەستەوە نەداوە، بەلام هەر لە رەنگ وروی دەم و چاوی دیارە ئەوە سەر بە رووسانە و کوموونیستە ".

کە دادستان وای گوت هەستام وگوتم : " داوا لەدادگا دەکەم لەم قسەی دادستان بکۆلنەوە . لە کام ولاتی دنیا بە تاوانی رەنگ و روخسارە خەلك موحاکەمە دەکەن ؟ ئەگەر رەنگ وروخسار بەلگەی کوموونیستی بێ، جەنابی ئاغای سەرگورد رەمزی دادستان دەبێ موحاکەمە بکرێ و ئیعدامیش بکرێ . چونکە لەم سەفەرەدا بە هەزاران روسم دیوە راست رەنگیان وەك دادستان سوورە . ( دادستان وەك چەوەندەری سوور وابو) ئیستا کەچارەنووسی من کەوتۆتە بەر ئیدیعا نامەی دادستان رێگا بدەن با لایحەی دیفاعیاتی خوم پێشکێش بکەم . دەستم کرد بە خوێندنەوەی دیفاعەکەم و لا موایە

سه عاتیك قسه م كرد . كه تهواو ببووم گوتیان بچنه دهر . پاش پازده ده قیقه بانگیان كردینهوه و نووسهری دادگا حوكمی دادگای خوێندهوه . لهحوكمی دادگادا نووسرا بو:

" له بهر ئهوه هیچ سهنهد و به لگهیهك به دهسته وهنه بوو كه تاوانبار كراو بو روخانی رژێمی پاشایهتی ههولی دابێ سزای ماده ٣١٧ له بارهی ئهوهوه راست نیه و رهت دهكرێتهوه . بهلام له بهر ئهوه ناو براو ئاماده نه بوو له دادگادا وه فاداری خوێ لهحاست ئهعلا حهزرهتی هومایونی شاههنشا را بگهیهنێ ، به ههژده مانگ حهكوم دهكرێ . تاوانبار كراو و دادستان ههقی ئیعترازیان له حكومی دادگا ههیه ."

كهرامهوه بو زیندان وله حكومی دادگا ئیعترازم كرد و داوای چاوپێخشاندنهوهی حوكمی دادگای ئیزامیم كرد . به ١٨ مانگ حهكوم كرام ورهسوول رانك و چوخهی وهگیر نهكهوت . چهند جار نامهم بو میرزا قادری لاوهی كه نووسهر و پاجیگری بازپورسی مههاباد بوو، نووسی كه رێگایهت بو ئازادی رهسوول بدوزێتهوه و ئازادی بكا . ئاخره كهی رهسول به ئیلتیزام ئازاد كرا .

## زیندانی شارهوانی ورمێ

پاش ئهوه كه له دادگا حهكوم كرام ئیتر كهمتر هاتهلام و سهری نه دام . دایكم جار و بار ده هاته لام و له ماله خوشكم ده ژیا . پاش دوو مانگ بو دادگای چاو رپخشاندنهوهی ئیزامی بردیانم بو ورمێ . ئهو روژهی كه ده بوایه بروم، خوم كوكرده وه و له گهل برادهران به گریان ماچ كرد وهاتمه دهر . له دهفتهری زیندان سێ سهربازی دژبان، چاوهرێیان دهكردم . ئه فسهری كیشك گوتی : " تو ناسراوی . باسنیه دهستانت با نه به ستن . پێنج تمهنیان بدهیه و برون ".

ـ هیچیان نادهمێ و با دهستم ببهستن ." كه زانیان پول نادهم رویشتین و له گاراژ سواری ئوتوبوس بووین . هیشتا ئوتوبوس نهكهوتبوه رێ، سهرههنگیكی ورك زل پهیدا بوو . كوپه ترشیاتیكی كه ورهی به دوو سهربازان ههلگرتبوو دهیبرده ورمێ .

ته ماشایه كی نێو ئوتوبوسی كرد و بهسهر بازهكانی له گهل من بوو ن گوتی : " به كیكتان ئهوكوپه ترشیاته له پێش خو دابنێ ".

سەر بازگوتی : "جەناب سەر هەنگ ئیمە زیندانیمان بۆ یە ناتوانین کویە رابگرین .
ـ کە وایە بیدەن بە زیندانی با لە پێش خۆی رابگری
گوتم بە داخەوە من لەو زیندانیانە نیم ، کویەی سەرهەنگ رابگرم .
چاویکی لیٚ کردم وگوتی : هەر لە سەرئەوزمان دریٚژیە گیراوی
ـ نە خێر! لە سەر ئەوە گیراوم کە نە هێلم توکویە ترشیات لە خەلك بستینی . بۆ خوت کویەی خوت چاکتر بۆ هەلدەگیری . من زیندانی سیاسیم ، زیندانی سیاسی کویەی سەرهەنگ راناگریٚ ." بوّم هەلکو تبوو لە نیو ئوتو بوس و لە گاراژ قسە بکەم .
سەرهەنگ لە خولای دەویست بیدەنگ بم . کویەی لە سەر کوشی خوّی دانا و ئوتوبوس کەوتە ری .
کە یشتینە ورمێ و راست چووینە زیندانی شارەوانی ودایانم بە بەندی سیاسیان . نیزیکەی دە کەسی ئازربایجانی گیرا بوون . سمایل ئازرش، یوسف عەلیار، عەبدولا تەئیبەدی، حەمزە ئەسل داشچی، و هیتر کە پیشتر دەمناسین و پیکەوە لە ورمێ کارمان کرد بوو . چونم بۆ زیندانی ورمێ، بۆ گیراوە کانی ئەوێ ببوە جیژن .
ئەو هەموو لیم کوٚدە بوون وە باسی فیستیوال و یەکیتی سوویتیم بوٚدە کردن . ئازرش دەرسی ئابوری سیاسی بۆ دە گوتین . من لە سەر جولانەوەی کورد وخەباتی حیزبی دیموکرات قسەم دە کرد . زوری نە خایاند برادەرانی مەهاباد یشیان هینا . صدیقی خانەمێ ، یوسفی ریزوانی، میرزا وسینی فروهەر، محەمەدی کە رباسی، کە ریمی وەیسی، سمایلی حسامی، هاشمی وسین زادە وچەند کەسی دیکە . بە داخەوە لە زیندانی ورمیش سابلاخیە کان زور جار کیشە یان دە بوو بە شەردە هاتن .
روژیك سدیقی خانەمی ومحەمەدی کەرباسی کیشەیان ببوو . سدیق زور ناڕەحەت بوو ، سفرەمان داخست و بانگی سدیقمان کرد بۆ نان بخوا . گوتی نایەم .
پاشان من چووم و هێنام . لە سەر سفرە هەستا و دیخوتی کردەوە .
ـ هەستیو ئەوە چ دەکەی . نان دە خویٚن ؟
ـ لیم گەری کاك کە ریم لیم گەری خوٚم وا لیٚ دەکەم . چوٚن من وام لی هات محەمەد قسەم پیٚ بلیٚ .
روژیکی دیکە، لە دیوی محەمەدی کە رباسی و وسینی فروهەر بوو بە هەرا . کە چووین

محه مه د خوێنی له باسکی ده هات . فروهر به ئاسنێکی تیژ له باسکی دا بوو . میرزا وســین یان برده زینده انی تەنیایی و پاش چه ند روژ تکام له سه روکی زینده ان کرد ــ هێنایانه وه . جاریکی دیکه سەر گورد وه کیلی کراوه به سه روکی زینده ان .

پەلا ماری پولیس و ئه رتەش بۆ سەر هێزه سیا سیه کان ، به تایبەت ریکخراوه کانی حیزبی توده که وتبوونه به ر هێرشێکی درنده انه . له کوردستان هەر کەس ده گیرا به ناوی توده یی دادگا ده کرا و پرسیاری لێ ده کرا . هه ر چه نده له دەرەوه پتر حیزبه ئازادیخوازەکان که وتبانه بەر پەلامار فشاریش له سەر زینده انیه سیا سیه کان زیاتر ده بوو . له پیش دا کتیب وروژنامه یان بۆ ده هینایین پاشان لیّمان قه ده خه کرا . ده ستمان کرد به شکایەت و نووسین وئاخره کەی سەروکی زینده ان پولیسیکی را سپارد که هــه موو روژێ روژنامه ی که یهان و یا ئیتلا عاتمان بۆ بێنی .

روژیك روژنامــه ی نه هینا . سەروکی زینده ان هاته ژوور و پێیمان گوت : " ئــه وروژ روژنامــه یان بۆ نه هینا وین . بانگی پاسه وانی کرد وگوتی : " بۆچـی روژنامەت نه هیناوه ؟ "

ــ دەستی هەلینا وقاچـی لیکدا ن وگوتـی " جه ناب سەر گورد ( باشنی گرمزینان یاز مینه یلار ) . واته سه ریان به سوور نووسیبوو ) .

وه کیلی رووی له من کرد وگوتـی : " حسابی ئیوه له گەل ئەوانه روو به روون " . به پاسەوانی گوت : " به سووریش نووسرا بێ روژنامــه یان بۆ بێنه . "

له مانگی خرماناتی ١٣٣٢ دا ژمارەی گیراوه سیا سیەکان له زینده انـی ورمـــێ که یشته ١٠٠ که س . ورده ورده لێیان ده پرسین و ئازاد ده کران . پاشان ٦٢ کەس مانەوه . کومیتەی به ریّوه به رایه تی زینده ان له پینج که س هه لبژیردرا . منیان کــرده مه سئول و وته ویژی زینده ان . جوره شانه به ندیەکمان دا مـه زراند که هەر چەند کەس پیوه ند یان به براده ریکی ئه ندامی کومیتەوه هه بوو . هه موو مان به کومـه ل دەژیاین و سند وقی هاو یەشمان دانا هه ر کەس هەر پولیکی بۆهاتبا ـ ده یدا به سند وق و ئه گەر شتی ویستبای به قسەی کومیته بوّی ده کردرا . کەس هیچی بۆ خو هه لنه ده گرت .

## دادگای چاو ڕێخشاندنەوەی نیزامی

لە مانگی ڕەزبەری ١٣٣٣ (١٩٥٤) لە لایەن دادگای چاو لاپخشاندنەوەی نیزامی پێم ڕاگەیەنرا کە دادگات دەستێی دەکا و پێویستە پارێزەرێك بۆ خوت دیاری بکەی.
دەبنا دادگا پارێزەری ئیجباریت بۆ دیاری دەکا. لە وەلامدا گوتم من ناتوانم پارێزەر بگرم.
لە لایەن دادگاوە سەروان حەسام کابرایەکی سنەیی بۆ پارێزەر دیاری کرا. ئەم سەروان حەسامە کاتی خوی پارێزەری پێشەوا قازی محەممەد یش بوو. سەروان حەسام دەگرا بە پارێزەری زور بەی سیاسیەکان. کابرایەکی دەلال و جاسوسی ڕوکنی ٢ بوو.
لە جیاتی دیفاع هەمیشە هەولی دەدا کە گیراوی سیاسی لە بیر و باوەڕی خوی پەشیمان کاتەوە. زور جاریش لەم ئیشەدا سەرکەوتبوو. سەروان حەسام چەند جار هاتە لام و گوتی ئەگەر تەنفیر نامە و پەشیمان نامە بنووسی حەوت هەشت دەکرێتە شەش مانگ و ئازاد دەبی.
لەم ڕوژانەدا کە قەرار بوو بچمە دادگا دایکم هات گوتی: "دەلین حاجی سەید عەولا ئەفەندی لە ورمێیە. نامەیەکی بو بنووسە دەچم بوی دەبەم."
دەم زانی فایدەی نیە بەلام لەبەر خاتری دایکم کە تەنیا لە سەر مالان و دل بریندار بوو نامەیەکم بو نووسی وە بیرم هیناوە کە بە نامەی تو و لە سەر قەولی تو هاتووموە کوردستان و ئیستاش لە ورمێ دادگایی دەکریم. تکایە کارێکی وا بکە بەلکو ئازاد بکریم. دایکم نامەکەی برد بوە موسافیرخانەی جیهان نوما و کەس جوابی نەدابووە.
لەو سەروبەندەدا ڕێکخراوی لاوانی حیزبی تودە لە ئازربایجان نامەیەکی نارەد زیندان و نووسرا بوو بەهەر وەسیلەیەك بی ئەنانەت بە نووسینی تنفر نامەش کارێکی وابکەن لە زیندان بینە دەر. لە زینداندا لە سەر ئەوە ڕوکنی نامەکە بوو بە باس و دەم بەدەم. ئەوانەی ئەندامی ڕێکخراوەی لاوان بوون پشتیوانیان لە نووسراوەکە دەکرد. بەلام ئەندامانی حیزب دژی تنفر نامە بوون. لەوێ بومان دەرکەوت کە لە حیزبی تودەدا ناکوکی هەیە و ڕێکخراوی لاوان خەریکە سەربەخو کار بکا.
کومیتەی زیندان بریاری دا کە ئەوانەی ئەو کەسانەی دەچنە دادگا دەمی دیفاعەکەیان

دەرکەوت کە لە حیزبی تودەدا ناکوکی هەیە و ریکخراوی لاوان خەریکە سەر بە خۆ کار بکا . کومیتەی زیندان بریاری دا کە تەواوی ئەو کەسانەی دەچنە دادگا دەبی دیفاعەکەیان کومیتە ببینی .

روژی ٢٧ ی رەزبەر ئەوروژەی کە هەوڵین دەستەی ئەفسەرانی حیزبی تودە گوللە باران کران بردیانم بوّ دادگا . لە کوریدوری ستادی لەشکری دوەمیّ تووشی سەید موسا و ئەمیرخانی کوری رەشید بەگی هەرکی و برازای نووری بەگ و چەند شکاکی دیکە بووم . پیشتر دەمناسین . سلاو و ئەحوال پرسیان کرد وگوتم ئەورو دادگا مّن دەست پێدەکا . پێم خوشە بێنە دادگا و ئاگاتان لە رەوەندی موحاکەمە بیّ .

دادگا ئاشکرایە ودەتوانن تەشریف بێنن . زوریان پیّ خوش بوو . چوون ئیجازەیان وەرگرت وهاتن لە سالونی دادگا دانیشتن . سەروکی دادگای نیزامی کابرایەک بو بە ناوی سەرهەنگ هادەوی . موسیقا چی بوو، سەروکی دەستەی موزیکی لەشکری چوار بوو . زەنگی دادگا لیّدرا . سەروکی دادگا رایگەیاند وگوتی :

ـ دادگای چاو رێخشاندنەوەی نیزامی بوّ پیّ راگەیشتنی تاوانی عبدالکریم حسامی دەست بە کار دەکا . ئەگەر تاوانبار یا پارێزەر ئیعترازیکیان هەیە دەتوانن قسە بکەن ."

سەروان حسار هەستا وگوتی : " من قسەیەکم نیە . دادگا دەتوانی کاری خوّی درێژە پیّ بدا ".

من هەستام وگوتم لە سەلاحیەتی دادگا ئیعترازم هەیە . یەکەم ئەوەیە تاوانی من تاوانیکی سیاسیە . بە گوێرەی قانون دادگای نیزامی ناتوانی بە تاوانی سیاسی رابگا . دووەم دادستان ئیدیعا دەکا کە گویا من بوّ روخانی ریژیمی پاشایەتی تیکوشاوم . دەزانن سەروکی دادگا سەری لە موسیقا دەردەچیّ . چون دەتوانی لە تاوانیک بکولێتەوە کە ئامانجی گورینی ریژیمی ولات بووە ؟ . کە وابوو داوا دەکەم کە دادگا نەبوونی سەلاحیەتی خوّی رابگەیەنی و پەروەندەکەم بدا بە دادگستەری .

دادگا ئیمەی وەدەرنا و پاش پینج دەقە بانگیان کردینەوە و رایگەیاند کە دادگا سەلاحیەتی هەیە و کاری خوّی دەست پێدەکا .

دادستان هەستا ئیدیعا نامەی خوێندەوە و رایگەیاند کە سزای حسامی زور کەمە و پیویستە بە توندی سزا بدریّ .

پاشان دادستان سەروان حساس هەستا و بە ناوی پاریزەر دەستی کرد بە دوعا بۆ کیانی شاهەنشا و قسەی قۆڕ. ئەمن هێندێ قسەکانی تەواو بکا رووم کردە دادگا و گوتم :

ــ لە بەر ئەوە جە نابی سەروان حساس نایەوی باسی ئەسلی تاوان و مەسەلە بکا و قسەکانی بە پێچ و پەنا لە تەئییدی دادستان دان، من لە پاریزەری خۆمی دەخەم و ئیجازە دەخوازم خۆم دیفاع بکەم . سەروان حساس دانیشت و من دەستم کرد بە رەتکردنەوەی قسەکانی دادستان و دیفاعەکەی خۆم لە سی و پینج لاپەرەدا خویندەوە . کە تەواو بووم سەروکی دادگا وتی :

ــ پرسیاریکم هەیە دەمانەوی بۆك و راست وەلامم بدەیەوە . بیر و باوەڕت سەبارەت بە ڕژیمی پاشایەتی چۆنە ؟ . ئەگەر بروات بە ڕژیمی شاهەنشاهی هەیە وەفاداری خۆت بە شاهەنشا دەربرە . لە پەروەندەدا بنووسری .

ــ ئیرە دادگای پشکنینی بیر و باوەڕ نییە . ئیوە دەبی لە سەر سەنەد و بەڵگە قەزاوەت بکەن . من بە هەموو سوننەتەکانی میللی خۆم وەفادارم "

سەروکی دادگا کۆتایی دادگای راگەیاند . ئیمەیان وەدەرنا . کوردەکان هاتنە دەروەدەستیان لە دەست ناو پیروزبایی یان کرد و رویشتن . پاش چارەکە سەعاتیك بانگیان کردینەوە . حوکمی دادگا خویندرایەوە . لە پینج ئەندامی دادگا ۳ کەس بە ۳ سال دەنگیان دابوو . دووکەسیش بە ۱ سال . حوکمی ۳ سال حەپسیان بۆ ئیمزا کردم و بردیانمەوە زیندان .

## بیرەوەری و رووداوەکانی زیندان

ساڵەکانی زیندان هەرچەندە بە ناخۆشی گوزەران . باوك و ژن و منداڵم مردن و دیدار ئاخرەت بووم . دایکم بێ کەس و تەنیا لە سەر ماڵان دەژیا . بەڵام ریز و حورمەت و موحیببەتی هاوڕێیان تا رادەیەك تۆڵەی ژان و میحنەتی زیندانی کرد بووە . ئەوەی لە رادە بەدەر خەفەتباری کرد بووم وەزعی دایکم بوو . زۆر بێ کەس و بێ پەنا بوو . لە زیندان زۆر بێ پوول بووم و هیچ کەسم نە بوو جارێکیش بێتە مولاقاتم .

کاتێك لە دەرەوە بووم خەنجەرێك دەسکی لە رادە بە دەر جوان و جەوهەردار و باشم هە بوو . پێموابوو قیمەتی تەواو نابێ .

نامەیەکم بۆ دایکم نووسی کە خەنجەرەکە بفرۆشێ و بێتە لام . دایکم خەنجەرەکەی دابوو بە کاك ئەحمەدی حاجی رەستەفا و ئەویش بە شا محەممەدی خەڵکی قارنی فرۆشت بوو بە ٩٠ تمەن . دایکم هات و زۆر نارەحەت بوو پەرۆشی خەنجەرەکەی بوو . پێویستە سوپاسی سەرگورد وەکیلی بکەم هەرچەندە نەماوە . تا دایکم دەهات بێ سنوور دەیبردە دەر و هەرچەندی ویستبام لە لای دادەنیشتم .

سمایلی حەسامی کە زانی دایکم هاتووە هاتە لام وگوتی : " وەزعی ژیانی دایکم و خوشکم زۆر شپرزە یە . هیچیان نیە . پێم خۆشە نامەیەك بۆ خانمە خانم بنووسی بەڵکوو یارمەتیەکیان بێ بکا و لانی کەم هێندەی ئاردیان بداتێ .

نامەیەکم بۆ خانمە خانم نووسی و ئەو چل تمەنەی بۆ بار کردنی ماڵ دابووی بە دایکم بۆم ناردەوە و بۆشم نووسی تکایە بە گوێرەی ئیمکان یارمەتی بە دایك و خوشکی سمایلی حەسامی بکە . دایکم ناردەوە مەهاباد و نامەکەم پێدا نارد .

دایك چوو بووە ماڵە خانمە خانم . پوولەکەی دابووە . جارێکی تر کە دایکم هاتە لام گوتی: ئیتر ناچمەوە ماڵە خانمە خانم . بێجگە لەوە پوولەکەی لێ وەرگرتمەوە زۆریشی لێ لووت بوو . بەڵام بەو حاڵە سوپاسی دەکەم یارمەتی بە ماڵە سمایلی حەسامی کرد بوو .

## مانگرتنی ١١ ڕوژه

پاش کەشف و دیتنەوەی ڕیکخراوی ئەفسەری حیزبی تودە و ئیعدامی ئەفسەران، کونەپەرستی ئیران لەدەرەوە و لە زیندان هیرشی بو سەر ئازادیخوازان توندتر کرد.
لە پیشدا بە زیندانی سیاسی حیساب دەکراین و ڕوژی نەفەری ١٧ قرانیان دەدا پێی لە زیندان خومان نان و چیشتمان ساز دەکرد و زور بەباشی دەژیاین.
جیرەی نەغدیان لێ بڕین و پێیان ڕاگەیاندین کە وەك زیندانی عادی دەبێ لە چیشتخانەی زیندان خوراك وەرگرین. شکایەتمان کرد و نامەمان نووسی فایدەی نەبوو.
کومیتەی زیندان پاش لیکولینەوە و پرس و ڕا بە برادەران بڕیاری دا کە مانگرتنی گشتی لە زیندان ڕابگەیەنێ. چەند نامەمان بو دادستانی لەشکر و ملکی نووسی و ڕوژی مانگرتنمان دیاری کرد. زندانیە سیاسیەکان ٦١ کەس بوون بە تیکرایی بڕیاری کومیتەیان پەسند کرد. ئیمە پێ ئەوە وەزعی سیاسی لیکبدەینەوە. ئەم واقعیە تە لەبەر چاو بگرین کە جوولانەوە لە پاشەکشە یە. دوژمن پەلاماری دەست پێکردوە. دەنگمان بە هیچ کوێ ڕاناگات. کەس نیە لە دەرەوە لە سەرمان وەدەنگ بێ. ڕوژنامە نیە بیرو ڕای گشتی لە مانگرتن ئاگادار بکا.
کومیتەی زیندان سی کەسمان لە ژووریك ڕاکشاین و دوو کەس لە ژووریك. بو ئەوە ئەگەر نەمانتوانی هەموومان کو ببینەوە سێ کەس بڕیار بدات. پیشبینیمان کرد بوو لەوانە یە ئەندامانی کومیتە ڕاگوێزن. جیگرمان دیاری کرد بوون کە کاری زیندان بەڕیوە بەرن. مانگرتن ١١ ڕوژی خایاند. ١١ ڕوژ ٦١ کەس بەبرسیەتی ڕایبوارد و هیچ خواردەمەنیەك نەهاتە ژووری حەساری ئیمە. لەم ماوەیەدا چەند تیلگراف و شکایەتمان کرد فایدەی نەبوو. زور لە برادەران هیلاك ببوون. یوسفی ڕیزوانی و عەولای عیزەت پور زکچوونی خوینیان گرتبوو. ڕوژی ١٠ی مانگرتن نامەیەکم بو سەروکی شارەوانی و دادستان نووسی و ڕام گەیاند لەوانەیە چەند کەس بمرن و ئیوە مەسئولن.

سەروکی شارەوانی ورمێ لە داویتی نامـە کە نووسیبوویەوە " زندان تحریکات ادامه دارد مراقبت کامل بعمل اید ".

بە دوای ئەم نووسراوە دا پۆلیکیان سەرباز بە موسە لسە ل وچـە کی دیکەوە ناردە زیندان و لە سەربانی زیندان دامـە زران . هەر لەوسەر و بە ندیش دا لە زیندانی رەشت پینج زیندانی سیاسیان کوشتبوو. وەزع دە هات شپرزە دە بوو. دوکتوریـکـی زیندان هە بوو ئەگەر نە ترسا بایە پیاویکی خە راب نە بوو. دادستانی ئەرتە شی دیاری کرد بوو . پازدە روژ جاریك دە هاتە زیندان . روژی ١١ ی مانگرتن دوکتور هات و چوو بوەدیوی یوسفی ریزوانی وعیزەت پور . پاشان هاتە دیوەکەی من و گوتی

ـ حسامی جوابتان نادەمەوە. ئەم دوو کەسەی زکچونی خوێنیان گرتوە لە وانە یـە بمرن . تۆ بە مـە سئول دە زانن . باشترە مانگرتنەکە بشکێنن. دە نووسم شـیرتان بۆ بینن و تا ٣ روژ بێجگە لە شیر وئاش و خواردنـی ئاوە کـی، نابـێ هیچی تر بخون .

کومیتەی زیندان پاش لیکدانەوەی وە زع بریاری دا مانگرتن بشکێنین . نامە یەکمان بۆ سەروکی زیندان نووسی . " بۆ ئەوە کە زندانیانی نیشتمانپەروەر و تیکوشەر، فیـدایـی سە رە روێ و زولم وجنایەتی کا ر بە دەستانـی ریژیم نە بن ، بریار درا دەست لـــە مانگرتن هەلبگرین . داوا دە کەین دوکتوری زیندان بـێ و بە گوێرەی دەستوری ئەو خوار دنیان بە رێتی ".

ناردیان دوکتور هات . شیریان هێنا . حـە سە نی ئەردە هالی خە بـە ری نارد کە لە مالەوە ئاش وشیر برنج بێنن . مانگرتنی یەك پارچەی ٦١ زیندانی سیاسی بیێ کە بشتن بە نـە تیجە کوتایـی پێ هات .

پاشان لە باس و لیکولینەوەی بریاری مانگرتن دا هاتینە سەر ئەو باوە رە کە بریارە کە لە جێ ی خوێ نە بوە . هینده ی تە ئیری ناله باریش لە سەر ورەی هێندە ی برادەران ببو.

لە نیو زیندان دا لایە نگرانی شەر مینی ئەندامـی ریکخراوی لاوانی حیزبـی تودە رێیە رایەتی حیزبیان پەلامار دە دا . برایانی ئازەربایجانی ناکوکی توندیان لە نـیودا پەیدا بوو . لە زیندان دا روژی دووی ریبە ندانمان جیژن گرت . لەزیندان دا کلاسی دەرسی سیا سیمان داتا . هیندیك زمانی ئینگلیزیمان دە خوێند . برادەریکی ئەرمەنی دەرسی روسی بە چـە ند برادە ریك دە گوت .

تادە هات پتر فشاریان بۆ دە هینایین . روژنامـە و کتیبمان لێ قە دە خە کـرا .

ئیمڕۆ سبەی ڕیش‌ناشینیان لە قەدەغە کرد بووین . هێندی لە زیندانیەکان لـە بیانوییەکدەگەڕان کە خۆچیاکە نەوە و یا بە جۆرێک بچنە دەر .

لەم سەروبەندەدا دەنگو باس بلاو بووە کە گۆیا سوورەیای ژنی شا کوڕی دەبێ دەیانگوت ئەگەر وابێ، فەرمانی لێ خۆشبوونی گشتی دەردەچێ . گیراوە سیاسیەکان ئازاد دەکرێن . ڕۆژێک لە نێو برادەران باسی ئەم مەسەلە بوو . سمایل ئاژش بەرپرسی کومیتەی شارستانی ورمێ، یادی بەخەیر بێ گوتی :

ـ هاوڕێیان با تۆزێک بیر لە خۆمان بکەینەوە و قوڕ وە سەرمان بکەین . ئێمەی کە ڕۆژێک دەمانویست ڕژێمی پاشایەتی دەروخێنین و ڕژێمی خەلکی دادەمەزرێنین، ئێستا چاومان دە فلان جێی سوورەیا بڕیوە کە کوڕی لێ بێتە دەر و ئازادمان کەن . "

مـقـدس

ڕۆژێک پاسەوانی حەساری ئیمە درنگ هات . پاشان خوسرەو خان کـە وەکیل داخلە بوو هاتە ژوور و ئاژانێکی وردیلەی تریاکی پیسی لە گەل خۆهینا وگوتی ـ ئەمەیان تازە بۆ کیشکی حەساری ئێوە لە شارەوانیەوە ناردوە . لای‌نێوەڕوو سەر گورد وەکیلی سەرۆکی زیندان هاتە ژوور و بە عادەتی خۆی هات لە دێوەکەی من قوونی وە سەر قەرەویلە دا و بانگی کابرای پاسەوانی کرد وگوتی . "گیدە ئیسمایل گیل بەرە" ( واتە کورە سمایل وەرە ئێرە ) . سمایل هات قاچی لیک دان و ڕووی لە من کرد و گوتی . "حسامی ئاگاتان لە ئسمایل بێ، کوریکی زفرە موقەددەسە )" .

پاسەوان سەریکی بۆ دانواند و دەستی بە سینگیەوە نا و ( ئەلا عصومر ویرسنیکی ) پێ گوت وڕۆیشت .

پاشان گوتی کە ریم دەزانـی مقدس یانی چـی ؟

ـ چۆن نازانم . بەلام ئاژانیش مقدس دەبێ ؟

ـ گوتم نازانـی . با پێت بلێم . مقدس چوار حـەرفـە . ( میم کەی یانی ماسك کیشە ، قافە کە یانی قورمساخـە ، دالە کە یانی دەیوزە ، سینە کە یانی سیگترانە ) .

ئەوسە گیابە بێ شمرە فـە جاسوسی سەروکی شارەوانیە . بە بێ پرسی من ناردوویە تە ئیرە . ئاگاتان لەخۆبێ . "

ئیسمایل وەك ڕێوی خۆی لە پشت دەرگان مات دەکرد، گوێی هەڵدەخست .
لە نۆرە کیشکی شەوانەی زووتر چرای لە سەر دەکوژاندینەوە . بە کورتی بۆ ئەزیەت دانی ئێمە ناردرا بوو . ڕۆژێك ٢٥ ی مانگ بوو دەمزانی ئیسمایل قراتیکی لە گیرفان دا تیە .
پاسەوانی ڕژێمی شاهەنشاهی پانزە ی مانگ قەرزدار بوو هیچی نە دە ما . بە تایبەتی ئەگەر تریاك کێش بایە . چومە لای ئیسمایل و سلاوێکم لێ کرد و گوتم : " چونی ؟ " دەستی پێ کرد لە ژیان گلە یی هەبوو . دەیگوت منداڵم نەخۆشن پارەم نە بوە دەرمان بکرم . لەوە دەچوو لە بەر بێ پارەیی تریاکی نە کیشا بێ .
گوتم : " ئیسمایلاغا تۆ کوڕێکی باشی . بە تایبەت سەروکی زیندان لێت ڕازیە . لە بەینی خۆمان دەرنەچی دەزانم پولت نیە. پاسەوانی فەقیر پارەی لە کوێ بوو من لێرە پارەم هەیە . دەتوانم هەتا سێ ڕۆی مانگ بە قەرز بت دەمێ " .
چاوێکی لێ کردم و وەك سەگی هار بەگژم داهات : " تو زیندانی سیاسی چون پارە دەدەی بە من . ئەوە سزای هەیە . من خزمەتکاری دەولەتم . ئێوە دوژمنی دەولەتن . ئیستا ڕاپورت بدەم دەزانی چیت لێ دەکەن ؟ " .
ـ کونی بارگینم دە گرن . من بە سێ ساڵ مەحکوم بووم . هیچ غەلەتی دیکەیان بۆناکری . من لە بەر تۆم بوو ، منداڵت نەخۆشن . ئێوە ئەوەندە فەقیرن قازانج و زیانی خۆتان نازانن . پارە شاوی بە جەهەندەم . "
چەند ڕۆژ پێ چوو ڕۆژێك ئیسمایل هات و لە حەساری زیندان هاتوو چۆم دەکرد .
سلاوی کرم وگوتی : ( ئاغا کەریم بیر عەرزم وار ) واتە عەرزێکم هەیە .
ـ فەرموو بزانم دەڵێی چی ؟
ـ منداڵەکانم نەخۆشن . ئەگەر دە تمەنم بە قەرز بدە پێی فەرمەمنون ئەبم . حقوقم وەرگرت دەتدەمەوە . بەلام لە بەینی خۆمان دابێ " .
ـ بە چاوان . دەزانم تو کوڕێکی فەقیری . ئێستا بۆت دێنم .
چومە لای مەسئولی مالی و گوتم : " دە تمەنم بۆ بێنە دەمیدەم بە ( مقدس )
ـ کوڕە لەو بێنامووسەی گەرێ تووشی بە زمیکت دەکا .
ـ بوم بێنە کارت پێ نەدا بێ . دە تمەنی بۆ هێنام و دام بە ئیسمایل . ئەلا سەنس نەجات ویرسن، ئەوەی گوت ڕۆیشت .
پینج وشەشی مانگ بوو هات و گوتی : پولەکەم بۆ هێناویەوە . زور سوپاس .

ـ من له زیندان پیداویستم نیه . ده زانم حقوقی ئیوه به شی هیچ ناکا . جاری تو خه‌رجی که . ئه‌گه‌ر منداله کانت چاك بوونه‌وه و پاره‌ت هه‌بوو بمده‌وه . "
ـ ئه‌لاعو مر ویرسنیکی گوت و رۆیشت .
٧ ۱ ی مانگ بوو به ئیسمایلم گوت .
ـ کاریکم پێیه . تیغم نه ماوه . زور مه‌منون ده‌بم ده‌سته تیغیکم بۆ بینی . له به ینی خۆمان ده‌ر ناچی . "
ـ وه‌ك سه‌گ به گژم داهات . " چلۆن شتی وا به من ده لێی؟ قه‌ده‌غه‌یه . من خه‌یانه‌ت ناکه‌م . جاریکی تر باسی شتی وا مه‌که " .
ـ باشه تووره مه‌به . پێیم وابوو هاسانه و که‌س نازانی . بێینه ده‌تمه‌نه کم بده‌وه .
ـ به چاوان سه‌ری مانگ بۆت ده‌ینمه‌وه
ـ غه‌له‌ت ده‌که‌ی . تۆ پاسه‌وانی ده‌وله‌تی ، چۆن پول له زیندانی سیاسی وه‌رده‌گری ؟ ئیستا بانگی سه‌رگورد ده‌که‌م . له جیاتی خزمه‌ت هاتووی له گه‌ل زیندانی قه‌رز و قول ده‌که‌ی . "
بزرکا . تیکچوو . ده‌ستی کرد به پارانه‌وه . " منداڵم هه‌ن به‌ده‌به خه‌تمه‌که . له سه‌رخۆ ، ده‌نگ هه‌لمه‌بڕه . له به‌ر تیغ وا ده‌که‌ی بێینه تمه‌نیکم ده‌یه ئه‌و ژاره مارت بۆ بێنم " .
تمه‌نیکم دایه و تیغی بۆهینایین . ماوه‌ی چه‌ند مانگ له گه‌ل ئیوقه ده‌ده‌س ئه‌وه به زم بوو . سه‌ری مانگ پاره‌که‌ی ده‌هێناوه لیم وه‌رنه‌ده‌گرته‌وه . ١٦ و ١٧ ی مانگ هه‌لم ده‌پێچا . هه‌رچی ویستبام پێیم ده‌هینا .

## ئه‌گه‌ر بیاو بم به‌سه

خوسره‌وخانی وه‌کیل داخیله یه‌کیك له‌و ئاژانه بێ زه‌ر و هێدی و بانانه بوو که به شازله نیوجسنی ئاژان دا هه‌لده‌کهوت . له گه‌ڵ من نیوانی خوش بوو . ده‌هاته ژوور ده‌یگوت . " حسابی شلوقی ده‌که‌ی . هه‌رچی له‌م زیندانه بکری خه‌تای تۆیه .

رۆژێك هاتە حەسار و بانگم کرد گوتم وەرە چایەك بخۆوە .

ــ لای تۆ چا بخۆمەوە لێم گەری ، چای تۆم ناوی .

ــ بریا زراوت چوو با . وەرە چایەك بخۆوە .

خوسرەوخان هاتە ژوور و قونسی وەسەر قەرەویلەکە مدا و بە یوسفی ریزوانیم گوت:
چایەکی بۆ تێکە . چایەکەی خواردەوە وهەستا .

ــ راوەستە چایەکی دیکەش بخۆوە .

ــ کیشی ئولسەم بە سەم دی . (واتە ئەگەر پیاوی بە سەمە) .

خوسرەوخان رویشت . پاش دوو روژ کە نۆرەی بوو دەبوایە بێتە وەزینداندیار نەبوو . لە دوو نۆران هەر نەهات . پرسیم خوسرەوخان دیار نیە .

ــ دەریان کرد .

پاش سێ مانگ روژێك خوسرەوخان لە حەساری زیندان وەژوور کەوتەوە . کورەکان بە گەرمی بەخێرهاتنیان کرد ومنیش چاك وخۆشیم لەگەل کرد و پرسیم:

ــ ئەوە چیت بە سەر هات؟

ــ تۆ دەزانی ؟ ئاقە چایەکی تۆ بۆ من بە پینج هەزار تمەن کەوت . ئەو روژە کە لای تۆ چام خواردەوە ئیسمایلی پاسەوان راپورتی داوە کە خوسرەوخان هەموو روژی بە یانی دەچێتە دیوی حسامی و قسان دەکەن . روژی دوایی لە شارەوانی بانگیان کردم و نامەی (چاوەروانی خزمەت) یان دامە دەست . پاش ٢٢ سال خزمەت خانویەکم پەیدا کرد بوو منداڵەکانی تیدا دەحاوانەوە . ناچار خانوەکەم لە بارمتەی پینج هەزار تمەن دانا و چوومە تاران ٣/٠ هەزار تمەنم بە رتیل داوە و دوو هەزارم خەرج بوە وهاتوومەوە . پێم نەگوتی : "کیشی ئولسەم بەسم دی)

بوتە ویلەی سەر بازخانە

لە مانگی جوزەردانی ١٣٣٤ (١٩٥٥) سەرگورد وەکیلی سەروکی زیندانیان گوری . ئەفسەریکی فارسی بێحەیا وشاپەرستیان کردە سەروکی زیندان . هەر روژی هەوڵ هاتە نێو ئێمە و بانگی کردین وگوتی:

ــ پێم خوشه بزانن من زور جید دیم له کاری خۆم . بێ ئیزیاتی قبول ناکم . ئیوه ش به زیندانی سیاسی نازانم و هێندی قسه ی بۆ جـی .

من پێم گوت . "واد یاره تو تازه کاری . ئیمه ئه رکی خۆمان زور باش ده زانین و به هیچ جور پێکانین اده بن کهس بێ قانوونی بکا . ئیمه خۆمان به زیندانی سیاسی ده زانین و تۆش باشتره هه ر ئاوامان بناسی ."

پاش دوو روژ هاته زیندان ناوی پێنج کهسیان خـوێنده وه و گوتیان ئه شیای خۆتان بپیچنه وه و ئاماده بن به رێ ده کرین ."

مه علومیش نه بوو بۆ کوێ و بۆچـی ؟

کومیته ی زیندان له پیش دا لای وابوو که پێویسته ئیعتیراز بکه ن . ئه وانه ی بانگ کراون نه چـن . پاشان لێکمان داوه فایده ی نـیه . ئه ز و یاوه ر زاده و خانه شانی و ئه سغه ری زه سووده و یه کی دیکه یان برده ده ر . له پیش دا خه به ریکی وا هه بوو که بۆ زیندانی ته وریزمان ده به ن . کاتیك وه ده ر که وتین سواری ماشین یان کردین وبرد یانین بو سه ر بازخانه . له پیش دا له عه مباریك لیباسیان لـێ وه رگرتین وته نیا بیجامه یان داینێ . له ته ویله هیستریان ده رکیشان و دوو به دوو ده ته ویله یان کـردین . من و ئه سغه ری زه سووده یان پیکه وه ده ته ویله کرد . روژی نانیکی وەك سه وله یان ده هێنا وله ناخوره کمیان داویشت . له سه ر سه ینتـی رووت پێلاومان له بن سه رداده نا و دریژ ده بووین . ئه وانی تر لێمان دوور بـوون و نه مانده توانـی پێکه وه قسه بکه ین . روژێ قاپه چیشتیکی سه ر بازخانه یان بـو ده هینا ین و پێمان نه ده خـورا . روژێ جاریك ده یان بردینه سه ر ئاو ٭ ئاو دسته کـه له ده رووی حه ساری سه ر بازخانه بوو.

له ونانه ی بۆیان ده هینایـن مۆره ی شه ترنجمان دروستکرد وله سه ر عـه رز شه ترنج مان کێشا و یاری مان ده کرد . که نانه که یان ده هینا شه ترنجه که یان ده برد . ئێمه دروستمان ده کرده وه و روژیکی تر ده یان برد .

زه سووده نه خوش بوو زکچوونی گرت . روژیك دوکتوری نیزامـی هات ته ماشای کرد . لا قینی دیتبان وروماتیزمـی بوو . دوکتور ده رمانـی روماتیزمـی بـونار د بـوو . که هینایان نووسرا بوو بیخواته وه . به لام ده بوایه ده قاچـی هه لسوێ . بـۆنـی پێوه کـرد . گوتـی : "بۆنـی زور گرانه ناخوریته وه ."

ــ کوره هیچ نــیه وه زارتـــی که ".

شوشه‌ی به زاریه وه نا خوارد یه‌وه و هینده بێ‌ند چوو وه عـــه رزی‌که وت . کرد م به هاوار و هاتن‌برد یان و ئیتر نمیان هیناوه . برد بوویانه وه زیندان .

به ته نیا له ته ویلەدا ماسه وه . تەویلە ی سەر بازخانەی ئیران دەرگا کــه هەتا سەرنیه . هەتا سینگی ولاخ دێ‌و سەرەوەی‌ئاوالّه یه . ولاخ پێدا مل دینێته دەر . روژانه له سەر سمینت دریژ ده بووم و یاله جیگای هیستره‌که‌دا هاتوو چوّم ده کرد . له بەر خوّمـه وه شیعر وگوّرانیم ده کوتن . ئه و سەر بازانه‌ی بـــوّکیشك ده یان هینا بێ یان ده کوتن نابـێ قسه مان له گەل بکه ن . نابێ رێگا بده ن‌قسان بکه ین . کاتیك شیعرم‌ده خوێنه وه سه ر بازه که ده یکوت قسه مـه که . . بێده نگ‌بـــه ". گوێــم نه ده دایه . بانگی سەر گروهبانی‌ده کرد و ده یکوت :

ــ ( سەر گروهبان بو ئویز ئویزنه دانیشر هیچ بیلەرم نه دییر ) واته له خـــوەقسه ده‌کا نازانم ده لین‌چـــی )

سەر گروهبان ده یکوت : با قسان نه کا ". گوێم نه ده دایــه . شه وانه خەوم لێ نه ده کەوت . پاش‌ماوه یەك پولیك سەر بازی‌کورد یان هێنا بوون . شەوانه کـــوّ ده بووَنه وه بلوێر یان لێ ده دا . پیلاوه‌کانم لەبن سەر ده نا و دریژ ده بـــووم له گەل ده نگ وهه وای‌بلوێره که خەیال هـــه لی ده گرتم وخــــه وم‌لێ ده کەوت.

روژیك سەر بازیك هەر دەنگی دەدام که قسه نەکەم . پێم‌گوت : " ئیوه بوّچـــی ئەوەنده فه قیرن . بوّ له گەل من قسه ناکـه ن . منیش‌وەك ئیوه ئیرانیم . له سەر دزی و پیاو کوژی نه گیراوم . دیتم گوێ‌هــه لده خا . چـه ند قسه‌ی‌دیکه م کرد . کابرا چاویکی له دەور و بەری‌خو کرد و گوتـی : به ئیمه ده لین تو دوو ئه فسەرت کـــوشتوه ئیعدام ده کرێێ . نابێ قسەت له گەل بکه ین ".

ــ درو ده‌کەن . من له سەر سیا سەت‌گیراوم . بوّئەوه که باش‌تێ بگا گوتم : " مــن فیرقه چــیم ". که ناوی‌فیرقەم هینا قوت بوو . گوتـی :

ــ به راستیته ؟ . من ماميکم فیرقــه چـی بوو . له میانه ئیعدامیان کــرد ".

ــ منیش‌وەك مامـی تو فیر قــه چیم . بوّ یه ناهێلن ئیوه‌قسەم له گەل بکه ن .

سەر باز وه ختی تەواو بوو رویشت . یه کی تر هاته جیگای . پاش‌ دوو روژ که نوره کیشکی بوو هاته وه . خه باریك و دوو ته ماشــه‌ی سووری بوّهاویشتم .

رۆژیك ١٥ كەسی خەلكی باراندوز چایی یان‌هینا ولە تیزیك من دەتەویلە یەكی كەوره یان‌كردن . دەتكمان دەكەیشتەیەك . برادەریكی ئەرمەنیان لەگەل گیرابو دەمناسی . جاریكی تر پێیكەوە لە زیندان ببووین . پێم‌گوت ( خونــە) بۆ گیراون ؟
ــ چــەمشیدی‌خوێری دوو رۆژان هاتوو چۆی‌كردبین وگیرا . ناوی ئیمەی‌گوتوه و گیراوین دەلخونیم دانەوە . غیرە تیان كەوتە بەر . حــەوتویەك لە وێرایان گرتن . هەموو رۆژ داوە تیان دەكرد .
رۆژیك داوام‌كرد بچمە ئاودەست . سەربازیكیان ناردوە پێشرخوێدام . كە لە حەساری سەربازخانە چووینە دەر، بە تركی لیم پرسی : "خــەلكی كوێــی ؟
بیدەنگ‌بوو . جوابی نەداوە .
ــ لالــی جواب نادەیەوە ؟
ــ تــوركــی نازانم
ــ كوردی . باشتر خەلكی كوێــی ؟
ــ خــەلكی چــەقەل مستە فام
ــ كوری‌كــێ ی؟ من خەلكی چــەقەل مستە فا هــەموان دەناسم
ــ نا كا تــوكاك كەریمی حەســامی بــی؟
بەلــێ هەوم . توكوری‌كــێ ی؟
خەریك‌بوو بگری . گوتم هیچ نیە نارەحەت مــەبە . كوری‌كــێ ی؟
ــ كوری‌وەستا رەحمانــی‌دارتاشم . بابم چــەند رۆژ پێش‌هاتبوو سەرم بەدا باسی تۆی كرد وگوتی دەلێن كوژراوە . دایكی هاتوتــە ورمــێ لە زیندان نەكردبوە ."
ــ گوتــم نارەحــەتمــەبــەوتە گەر كەسی لای‌خومانت دیت بلێ ماوە . دایكم لــە دورگە یەویەلكوێخــە بەری بەدەنــێ .
پاش‌دوو مانگ رۆژیك دادستانی لە شكر لەگەل یەك دوو ئەفسەران پــەیدا بوو . هاتە بەر دەرگای‌تەویلە كەوگوتی : "بۆ دەبــێ كاریكی وا بكەی جیگات ئیرە بــێ گوتم : "لە ریژیمی ئیوەدا ئەوە شتیكی سەیر نیە . بوچــی‌ئیوە ریگا نادەن سكالای خوم بو شوێنە بەرزەكانی‌حكومــەت بنیرم . ئیوە بوچــی لە كاغــەز وقــەلەم دەترسین .؟
ریژیمیك لە قــەلەم بترسی و قانوون لە ژیر پێ بنێ ئەوریژیمە راناوەستێ با سەر نیزەشی لە پشت بــێ . بە توند و بە توورەیــی قسەم دەكرد . دادستان گوتــی زمانت گری دەیە..

ئەگەر بە نووسین بە لێنی بدەی کە لە زیندان هێدی وهیمن دەبی دەتنێرمەوە شار.
ــ لە زیندان هیچم نەکردوە . ئیوە بە مەعمورەکانی زیندان بسپیرن .کە وەك ئینسان بیزونەوە . ئەوەی دەولەت بۆ زیندانی دیاری کردوە بیدەنێ لێی نەدەن . لانی کەم ئەمقانوونە چە پە لەی خوتان لە بەر چاو بگرن . روزنامە وکتیبی ئازاد بێننە زیندان .
دوای قسەکانی من داد ستان رویشت . زوری پێ نەچوو ئەفسەرێك ُچەند سەرباز پەیدا بوون . بردیانمە دەرەجل وبەرگەکمیان داسەوە و سواریان کردم بۆ زیندانی شارەوانی .
هاوڕێیان کە دیتیانم لە ئامێزیان گرتم . سەر وریشم هاتبوو . ئاوێنەیان بۆ هێنام و بۆ هەوەڵین جار تالە مویەکی سپیم لە ریشمدا دیت . بۆم بوو بە فیکر و کە لیکی پێوە نارەحەت بووم .
هەر ئەوروژە ئەوانی دیکە شیان هیناوە زیندان . باوەر زادە کەمە سئولی لاوان بووسەر وسمیلیکی زور رەش وجوانی هە بوو . ویستبوویان سەر و سمیلی بتاشن . بەر بەرەکانی کرد بوو . گروهبان هاتبوون دەستیکی باشین کوتا بوو پاشان سەر و سمیلیا جوان تاشی بوو.
وەزعی زیندان وەلنجاران نەما . هیندیك بە تنفر نامە دەچوونە دەر . هیندی لە کومەن جیا دەبوونەوە و بە تەنیا دەژیان . ئەوتەنگ وچە لە مەی کە لە سەر ــ دەمی شکانی جولانەوەدا پەیدا دەبن لە زیندانی ورمیدا سەریان هەلدا بوو.
یوسفی ریزوانیان برد بوە زیندانی تەوریز . نامەیەکی بۆ نووسیبوم کەغەنی بلوریان و سولیمانی مەعینی گیراون . عەزیزی سفیشر گیرا بوو بەلام پاش ١٢ مانگ ئازاد کرابوو. لە تەواوی ئەو ماوەیەدا هیچ پیوەندیەکی حیزبی لەگەل زیندان نەگیرا

## لە زیندانی عادی دا

لە گەڵ وەکیل داخیلە ریك کەو تبووم کە حەوتوویەك رێگام بدەن بچمە نێو زیندانی عادی . خەلکی ناوچە جور بە جورەکانی کوردستان بە تاوانی جور بە جور دەگیران وە دەیان هێنان بۆ زیندانی ورمێ . دەمگوو باسی ناوچەم دەزانی . نامەم بۆ فەقیر وەهە ژاران دە نووسی . فێریان دەکردن لە دادگا وباز پورسی چ بلێن . کوردەکان لێم کۆدە بوونەوە و هەر کەس دەردی دڵی خۆی دە کرد . نەتیجەی گشت باس وقسەکانیش هەر ئەوە بوو (ئێمە لا ئازاد دە بی ) .

رۆژێك گوتیان کابرایەکی پیری خەلکی نێو مەنگورانیان هێناوە . ئیجازەم وەرگرت وچوومە بەندی عادیەکان . کاتێك دە چووم لە ژووری عەولای برای عەویز دادەنیشتم ، عەولا خەڵکی زەرگەتەن بوو ، لە سەردەمی کوری سەیدمارفی نالبەندی کوشتبوو بە حەبسی ئەبەد مەحکوم کرا بوو . لە دەولاوان وەختی خۆی جیران بووین و یەکترمان دە ناسی . عەولا لە زیندان فیکری گۆڕا بوو . توزێك خوێندن فێر ببوو . بیری کوردایەتی وژیر دەستی چوبوو دە مێشکی ، ببوو مرۆڤێکی ئازادیخواز . لە زیندان پارەیەکی کۆکرد بووە و دەستی فەقیر وهەژارانی دەگرت . حەوتوو رۆژێك شێی بانگ دەکرد ، نان وچێشتی باشی سازدەکرد .

لە ژوورەکەی عەولا دانیشتم و گوتم دەلێن یەکی مەنگور گیراوە بانگی کە بێ . پیرە پیاوێکی ریش سپی روتە کە کورێکی مێر منداڵی لەگەڵ بوو هات دانیشت .

بە خێر هاتنم کرد و لێم پرسی : خەلکی کوێی وناوت چیە ؟ .

ــ خدرەکە چەلی سوستانیم پێ دەلێن . ئەوهەلەش خوارزامە .

ــ مام خدر لە سەر چی گیراوی ؟

دەستی بۆ خوارزاکەی راداشت وکوتی . ° دەلێم لە ژنی من بیپرسە لە بۆ لە من دە پرسی ؟

دەستمان کرد بە پێکەنین . مامخدر گوتی :

ـ جا بە ئاغای خۆم بڵێم لە پشتی شنۆیە لە کوێستانی رەشۆڵی زەرزان پاریزم لە بۆ ماینی مام سالاّن برد . ماینێکم گرتوهێنام وە ژنی خۆم دا . ( بە خوارزاکەی دەگوت ) . گوتم بیگرە تا دەچم یەکی دیکەش دێنم . ماین لەدەست ژنی من بەر هەڵ بوو . چووە سیو رەشماڵان . لیمان وەدەر کەوتن گرتیانین ودایانین بەژاندارمەی شنۆیە . لەوێ دووروژ رایانگرتین و ئیستا ئەوەدەگونە رەشیان کردووین .«

گوتم : « مام خدر کاغەزت لە بۆ دەنووسم وئیشەڵا بەردەبی . بەلاّم ئیتر دزی مەکە . لە باز پرسیشرا حاشا بکە بڵێ درۆ دەکەن » .

ـ ئەگەر ئەوجار نەجاتیم دەبێ . هەر سێك تەلاقم کەوێ دەبمە تاژی بایزە روتێ تازە قەڵەتی لە بۆناده‌م » .

یەکدوو جار نامەم بۆمامخدر نووسی و بە ئیلتیزام بەریان دا .

## بابە کر چاوشین

روژێک گوتیان دوو کەسی خەڵکی شنوگیراون . تکام لە وەکیل داخیلە کرد کە ئەو دووکەسەم بۆبێنێتە حەساری ئێمە لە شنۆیە را هاتوون رەنگە خە بەرێکی دایکم بزانن. وەکیل داخیلە چوو هێنانی . کە هاتن یەکیان بابکر چاوشین بوو پێشتر دەمناسی پیاوێکی قسە خۆش و سەیر بوو . جار وبار نوکەری ئاغایانی دەکرد وهێندێ جار عەدار وخوێن نوشینبوو . جاری واهەبوو قاچاخی دەکرد . کە هاتە ژوور وچاوی بە من کەوت کە نەیووە . بە خێر هاتنم کرد و دانیشتن . تەماشای کرد دیوەکەی من پاك وخاوێن و قەرەویلە و شتی تری لێ بە پێی سەیر بوو گوتی :

ـ ئەوە تۆش زیندانی ؟ . ئەدی بۆچی دیوی ئێمە دە لێ ی نە ویلە یە . تەلاقم کەوێ ئەو دەولە تەکەرە . تو ئەوە دە یرووخێنێ شاوات رادەگرێ . منیش هیچم نە کردوە دە تەویلەی کردووم » .

ـ جاری پێم بڵێ لەسەر چی گیراوی ؟ تۆ و زیندان ؟

ـ جا ئیستا چت پێ بڵێم لە وکاندەرەی بپرسە ؟

هـــه تیویکی له گەڵ بوو دەستی بوراد اشت .
هـــه تیو وەدەنگ هاتوگوتــی : " بابەکر نا بــێ ئاگات لەزاری خوێت بــێ .
ــ چۆن ئەوە زمانیشت دەگەری ؟ ژنی من تۆدەچــیە زگ کچــە رەعیەتی فــە قیر و بیناموسی دەکەی من تووشی زیندان دەبم .
کوتم مــە سەلە چــیە بومپاسرکە " .
ــ ئەو خوێریە کوری قە رەنیا غای زمر زایە . برای مستەفا خانە . ژنی من شەو چــوّتــە زگ کچە رەعیە تیك . کچ هاواری کردوە وبابی کیژە کە چــوە لە شنو شکایە تــی کــردوە ئەو هەتیوە یان بردوە ولە وێ گوتوویە بابەکرم لە گەڵ بــوە . شیرم لە سەری نود ابــێ ئاگا وخە بەرملێ نە بــوە . رووی لە هەتیوکرد وگوتــی : " جا بۆ عــە دەبیە لە خزمــە ت کاك کە ریم بە لا م تۆئەوخود ایە لە کەلت بووم ژنی من؟ " .
ئیتە پیدە کە نین وهە تیو سەری دە بەرخونابوو . گوتم جاری با چایەکت بۆ ساز کەم لیرە رەعیە ت زور گیراون بۆیان بلێ تولەی لێ بکە نە وە . بە یوسفی ریزوانــیم گوت :
ــ یوسف گیان چایەك بو بابە کر سازکە ین . یوسف پە رەمیزی هینا . یەك دوو ناسوسی لی دا وشە مچەی پێوە نا وکرەی لیّوە هات . بابەکر چاو شین زور بە سەیرە وە تەماشای کرد وگوتی ئە وە چیە ؟ شتی سە یرت لە کنە .
ــ چون ئەو پە رامیزە و زور بە هاسانی نان وچیشت وچای لە سەر سازدەکــرێ .
ــ جا ئەوە دەزانی بۆچــی چاکە ؟
ــ بۆچــی ؟
ــ جا کاکی خوم ئەومت لە مالی هــە بێ . جا بلێ دەی . نیوە شــە و میوانت لــێ وە ژوور دەکەون . دەتەوی ژنە تیوی هەلبستینی چایەك سازکا . وە خە بەرنایە وراست نا بێتە وە . ئەوەی بینی لە پیشخوت دا بینێ ی وچای خوت سازکەی و دایەی وا لــێ بکەی بە شی نەدەی .
بابەکر کە هە موو ژینی لە گەل میوان وقاچاخی وشتی ئاوا برد بوە سەر ، هە موو فیکر وبیری لە بارەی پەرامیزە وە لە سەرئەوەندە ساخ بــبووە .

## خۆ لە سەر پیاوکوشتن نەگیراوین

ڕۆژێک سەرگورد وەکیلی سەروکی زیندانی شارەوانی ورمێ بانگی کردم وگوتی
دەمەوێ تکایەکتان لێ بکەم . دوو هەتیوی حیزلە سنووری تورکیا گیراون . باندێکی
قاچاخ وەستوویە بیانبا لەتورکیە بیان فرۆشێ . دادسەرا ناردوونیە ئێرە تا دەیان
نێرنەوە بۆ تاران . ناوێرم بیاندەم بە زیندانی عادی . لەگەڵکیان دەکەن . لە
حەساری ئێوە دەیویک چۆڵە ریگا بدەن دوو سێ ڕۆژ با لە وێ بن تا دەڕۆن».
سەبارەت بە دوستایەتی وەکیلی گوتم با بێن بە لامەوە برادەران نەزانن کە
شوغلی ئەو ریفیان چیە .
هەتیویان هێنان وچوونە ژوورە بەتالەکە . لە گەڵ کچان فەرقیان نەدەکرا .
لە زیندان دا هیچ شتێک وون نابێ . ئاشکرا بوو کە لە سەر چی گیراون و شوغلیان چیە
چەند ڕۆژ لە حەساری ئێمە مابوونەوە و سەرەدایان لە سەید حەسەن کرد بوو .
سەید حەسەن خەڵکی سەرایی ئازربایجان بوو. لە زەمانی حکومەتی میللی ئازربا
یجان دا لە سەراب بەرپرسی تەشکیلاتی فیرقە ببوو. کاتێک حکومەتی ئازربایجان
تێکچوو بوو، دەرەبەگ و شاپەرستی ناوچە چوو بوونە سەری بیکوژن . سەید حەسەن
وەک شۆرشگێرێکی راستەقینە دەستی نەدا بوو . شەری کرد بوو ١٧ کەسی کوشتبوو
تا ئەرتەش گەیشتبوویە . خۆی تەسلیمی ئەرتەش کرد بوو. سەید حەسەن لە دادگای
نیزامی مەحکوم کرابوو بە ئیعدام . دادگای چاو ریخشاندنەوەی نیزامی بەو
دەلیلە کە دژی دەولەت شەری نەکردوە وتەسلیمی ئەرتەش بوە . شەری پێشی دیفاع لە
خۆی بوە حکومی ئیعدامی کرد بە ئەبەد و بە زیندانی سیاسی دەناسرا .
لە زیندانی تەوریز لەگەڵ زیندانیە سیاسیەکان لەمانگرتن وهەرا دا بەشداری کرد بو
هێنا بوویانە زیندانی ورمێ . گەلێکمان ڕێزلێ دەکرت. دوکانێکی دانا بوو بریارمان دا
بوو هەموو شت لە سەید حەسەن بکرین . لە جیاتی سەید پێمان دەگوت ( میری )
ڕۆژێک ئەودوو هەتیوە نازانم لە سەر چی لە گەڵ میری بە شەر هاتبوون . هەتیو
کە لە سەر حیزی گیرا بوو بە سەید حەسەنی گوت :

ــ بیّ شه رەف خوّ من وەك توّله سەر پیاو كوشتن نه كـیراوم "

میری ئاكری‌كرت . هاواری‌كرد . " كوره وەرن بعكوژن . كورّی ١٧ كەسم گاوه .
چــه كد اری سەراب وئەرەه‌مویلم وسەرگەراون تەسلیم نه بووم ئیستا گاند مریك پیّم د ەلیّ
،،وەك‌توّله سەرپیاوكوشتن‌نه كیراوم .،،

میری‌كوتی : " یولد ان‌كه ریم تا د وو سه عاتی د یكه ئەوانه لیّره وه د ەر نه نـیّی
هەر د وو كیان‌د ه كوژم ". كوره كان گالته یان‌لەگەل میری هه بوو كوتیان میری تـوّ
ئەوه چــەند ساله له زیندانـی با د ه ریان‌نه كەین و شەو بینەلات .
وه كیل‌د اخیلەم بانك‌كرد وكوتم ئەوانه لیّره راكویزن . هه تیویان‌برد نه د ەر و لـه
ژووریك پاسەوانان چــه ند روژیك رایان‌گرتبوون .

بـز م پایـی ( واتـه بـه شـی ئیمـه)

له به ند یخانه‌ی‌ورمـیّ زستانان بوگەرم‌كرد نـی ژووره‌كان له شەو وروژ د ا ٣ كیلوـ
خــه لوزیان د ه د ا . عــه مباری‌خــه‌لوزه كه لەحەساری د ەرێ‌بوو . د ه بوایــه بــه
سەر پینج د ەركا وقەرەول د ا رویشتیای تا د ه چووی خــه لوزت‌د ه هیّنا . خەلوزیان بوّ
د ه كیشای و پاسەوانیكی لەوی‌را‌وەستابوو د ەیگوت . " بزمكینی ئات ". واته هی‌ئیمه باوّی
ئەوه ووكلوّخه لوّزی‌د ەبرد . له گەرانەوە د ا له چوار جیگا پاسەوان‌ریگایان‌د ه گرت وهەر
یــه كه د وو سی كلوّخه لوزی د ەبرد و به زه حمه تێ نیوه ی د ه گه یشته وه زیند ان .
یا براد ەر د ه هاتن میوه، شیرنـی، باشتی تریان‌د ه هینا . هەر پاسەوانیكی د ەیشبای
به شی خوّی‌د ه ویست . خوّیان‌به شەریك وبرابەشی زیند انیان د ه زانـی .

كــــه راتـه وه بـــوّ زیندانـی مـه هاباد

بەهاری ١٣٣٥ (١٩٥٦) چەند نامەم بۆ دادستانی لەشکر نووسی کە بم نێرنەوە مەهاباد و پاشماوەی زیندانیم لە وێتەوا دەکەم . سەرۆکی شارەوانی مەهاباد موافەقەتی کرد بوو بردیانمەوە مەهاباد . هەوەل ڕۆژ سەرۆکی شارەوانی بانگی کردم کوتی : " لێرە زیندانی سیاسیمان نیە . جێگامان تەنگە . تکات لێ دەکەم لێرە بە هێدی و هێمنی بژی . با ماوەی مەحکومیەتت تەواو بێ و ئازاد بکرێی . "

پێم کوت : " من زیندانی سیاسیم . ئەرکی خۆم پاش دەزانم . دوو خواهیشتم لە جەنابت هەیە . یەکەم، من لە نێو زیندانی عادیدا نازیم . بفەرموو ژوورێکی بە تەنیام بدەنێ با لەگەڵ زیندانی عادی تێکەڵ نەبم و کارم بە کەس نەدابێ . دووەم من بێ خوێندنەوە ناتوانم . بفەرموو ئەو کتێب و ڕۆژنامە و کۆڤارانەی کە لە وڵات چاپ دەکرێن و بڵاو کرانەوەیان ئازادە بۆم بکڕن " .

سەرۆکی شارەوانی کابرایەکی بەساڵاچوو بوو . کونەژنی سمایلاغای سمکۆی مارە کرد بوو و کچێکی سمایلاغا لە کن ئەو دەژیا . کەیفی بە خەراپەنە دەهات.
ئەفسەرێکی کێشکی بانگ کرد . کوتی : " ژووری ژمارە ٢ چۆڵ بکەن . خاوێنی بکەنەوە . حەسامی بە تەنیا بژی . زیندانی دیکە مەدەن بە ژووری ئەو . کۆڤار و ڕۆژنامەچی دەوێ بۆی بکڕن " .

یەک دوو سەعات لە دەفتەری زیندان دانیشتم تا ژوورەکەیان خاوێن کردەوە و شتومەکیان بردە ژوور . قەرەوێلە و پەڕامێز و هەموو شتی پێویستیان بردە ژوورەکە و چوومە زیندان . میرزا قادری لەلعەبباسی و چەند کەسی تر کە بە ئەبەد و دە ساڵ مەحکوم کرا بوون و پێشتر دەمناسین هاتنە لام و بەخێر هاتنیان کردم .
زیندانییەکانی تر واقیان وڕما بوو دەسڵەمینەوە . برایم خەلیلی پاسەوان کە بە چاخان و درۆزن و بەرتیل خۆر ناسرا بوو، لە مەهاباد کەرنەما بوو کە برایم خەلیل بە جۆرێک ڕووتی نەکا . چووبوە ژووری زیندان و بە زیندانییەکانی کوتبوو هەر کەس بچێتە لای حەسامی و قسەی لەگەڵ بکا ئیتر نەجاتی نابێ .

ئێواری زیندانییەکان گشتیان لە حەسار کۆبوونەوە و چوومە نێویان . ئەحوال پرسیم کردن و پێیانم کوت : " هەر کەس کارێکی ئیدارەی هەبێ، نامە بنووسێ، شکایەت و سکاڵای هەبێ بێتە لای من . هەرچی لە دەستم بێ یارمەتیتان دەدەم ، کەس شەرم نەکا .

هەر کەرکاریکی بە من هەبێ ئامادەم خزمەت بکەم . ڕۆژنامە گیراوەکانم دەدواند تا بزانم خەڵکی کوێن، لەسەرچی گیراون تاوانیان چیە . نامەم بۆ دەنووسین . بە شانازیەوە دەتوانم بڵێم کەم کەس هەبوو لە زیندانەکاندا ئەوەندە ڕیزی لێ بگیری . ناتوانم لە بیرم بچێتەوە . ٩ کەس زیندانی عادی نەخوێندەوار، هەموو جۆرە، لە زیندانەکاندا بوون . لەزۆروکەی خۆم نێوە ڕوویان دەزیز دە بووم . بە زۆورەکان دا دەگەران دە یانگوت: " هەمرا هەرا مە کەن کاکە ڕیم نووسیوە " .

هەر ئەو ڕیزو حورمەتی زەحمەتکێشان و وەفاداریان، پردی پشتەوەی لێ ڕوخاندم و لە پێناوی ئازادی و خیروخۆشی و ڕزگاری زەحمەتکێشانی کوردستاندا قەت لە ڕێبازی ڕاستی خەبات لا مەدا .

ماوەی زیندانی مەهابادم بە خوشی گوزەرا . دایکم لێم نیزیک بوو دەهات سەری دەدام . یوسفی ڕیزوانی کە بە پێنج ساڵ حکوم کرا بوو لە زیندانی تەوریز بوو نامەی بۆ بابی نووسیبوو کە هاتوو چۆمکا . میرزا جەلیل دەهات سەری دەدام و چێشت وخواردەمەنی باشی بۆدەهینام . پیوەندی حیزبی پچرا بوو، غەنی و سولیمانی موعینی گیرا بوون . کادرەکان هەریەکە لە لایەکێ بەرنامە دەسوڕانە وە عەولای ئیسحاقی وعەزیزی یوسفی لە دەرەوە بوون و جارو بار هاشمی حوسێن زادە لە تاران دەچوو سەری دەدان . قاسملوش پاش ئەوەی کە لە تاران گیرا بوو بە قەول و بە لینی خۆی نەجات دا بوو ڕەگەڵیان کە وتبوو پیوەندی خۆیان لە گەڵ حیزبی تودە بە جاریك پچراند بوو . ڕەحمانی قاسملو وعەولای ئیسحاقی بوو وتوو وێژ لەگەڵ ڕێبەرانی حیزبی تودە چوو بوونە ئوروپا و لەوی ناکوکی و کیشەیان لە نیودا ساز ببوو دەمیان تیك نا بوو .

## بیره وەریه‌کانی زیندانی مه‌هاباد

له زیندانی مه‌هاباد دا بیره وەریخوشم بۆماوەته وه . دوست و برادەری باشم بۆ پەیدا بوون . دەیان کەسم بۆنیوچیزی دیموکرات رینوێنی کرد و بوون به هاوریی تیکوشەر . زوروم یارمه‌تی بەزەحمەتکیشان کرد وله سەریان وەدەنگ هاتم ئەگەر نەشتوانم هەمووی بنووسمه وه بۆ جی نابی کەم وزور باسیان بکەم .

هەر چەند به تەنیا له ژووریک دەژیام بەلام له نیوخەلك دا بووم . برادەریکی خه لکی ئاخته تەر به تاوانی قه تل گیرا بوو . کوریکی سەرد و رەند، قسه خوش وشی که یشتوو . نان وچیشتی دروست دەکرد و پیکەوه نانمان دەخوارد . کاتیک نان سازده بوو دەیگوت . " کاك کەریم وەره با نانه کەمان بخوین ".

ـ هیشتا زوه کاك قادر با توزیکرا وه ستین ".

ـ " کوره وەره، ئیستا دوستیك دیی کاری دوژمنیکمان له گەل دەکا . "

### منیش له دەوله ت زه نیینم

له ناوچه‌ی سندوس کابرایه‌ك هه‌بوو به ناوی موسا شیت . وه ك دەیانگوت کار وکاسبی دزی بوو. روژیک موسا تمیتیان هینا زیندان . هەموو روژی دەهاته لام عه ریزه یه‌کم بۆ دەنووسی .ئاخره کەی بردیان بو لی پرسین . له بازپورسی له شکر لی یان پرسیبوو. له گەرانەوه دا به کسەرهاته دیوه کەی من . لیم پرسی دەی موسا ـ چی یان لی پرسی ؟

ـ کور هیچ نه بوو. سەرهەنگ گوتی . " دەولەت له تو زه نیینه ".

ــ لە وەلامدا گوتم منیش لە دەولەت زە نیتم . ھاتووەسەوە . »

## بایــزە بــۆر

رۆژێك دەرگای زیندان كـرا وە . كابرایەكـی سـەنگوریان دە ژووری كرد . ھە موو لەشی خوێن وجل وبـەرگی درا بوو . ھەر بە لادا دەھات . زاندارم ئەوەنـدەیان بە شوولكی شیلان لی دا بوو ھەموو لەشی بریندار بـبوو .

زیندان ھێندێ شتی تایبەتی خۆی ھـەیە . ئەوانەی گیراون لە رۆژەكانی ھەوەلدا مات وبێدەنگ ودامـاون . پاشان رادێن . ئەم جار گالتە وگەپ بەوكەسانە دەكەن كـە تازە دەگیرێن . یا گالتەی جۆر بەجۆر ساز دەكەن و رۆژی پێ دەبەنـە سەر .

دیواری زیندانـی مـەھاباد بەردێكی رەشی تێدا بوو . وەنەبێ بە ئانقەست لە دیوار گیرا بـێ . كاتی دیوار دانان كەوتبوە ئەم شوێنە . ئەگەر یەكی تازە گیراو دەھات، زیندانی دەیان كردە ھـەمرا و كابرای تازە گیرا وناشارەزایان دەبرد و پـێ یان دەگوت ئەو بەردە رەشە ماچ كە . ئەگەر ماچـی كەی بە حەپسی ئەبەد مەحكوم دە بی . ئەگەر ماچی نەكەی ئیعدامی .

ئەوە بـبوە بەشێك لەگالتەی زیندانیەكان . ئـەورۆژە ی بایزە بۆریان ھێنا لێیان كرد بە ھـەمرا و بەردە رەشیان پـێ ماچ كرد . بایز یەك دوو رۆژ دەستەوئەژنو لـە بن دیوار دادەنیشت ومات دە بوو . رۆژێك بانگم كرد ودلخۆشیم داوە .

بایز ھاتەوە سەر خۆ وئەم جار رۆژانە دەھات لە دیوەكەی من دادەنیشت. رۆژێك گوتی

ــ ئەری كاك كەریم راستیم پێ بلێ زیندان ھـەر ئـەوە یە ؟

ــ ھــەر ئەوە یە بایز ھیچی دیكە نیە . تازە تۆلە لیەدانی ژاندارمە نەجاتیت بـوە .

ــ جا ئەگەر وابـێ ھـەرسێك تەلاقم كەوێ لە مـەود و ژاندارمـە ی بێ ژنی خۆش نیە .

بایز كابرایەكی قسە خۆش سەبر وسـە نگوریكی تۆخ . رۆژێك كویخا مستەفا ی پیاوی قادراغای ماسوی لە ژوورە كەمدا نیشتبوو بایز ھات . دانیشت وچاوی دە كویخا مستەفا بـڕی و رووی لێ وەرتەدەگیرا .

گوتـم . « ئەوە چـیە بایز وا دەكویخا مستەفا دە روانی ؟

ــ ئـەوەھـە لە ی دەلێ ی؟ ھەرسێك تەلاقم كەوێ سی حەوتوو سەر و ردینی نەتاشم لە بازاری قـەبا كەندی بەكەلیچەی دەفرۆشم .

ڕۆژێك تەماشام كرد قادر شای ماسوی و كاك حەمە باسی برای و چەند كەسی ..
دیكەیان لەگەڵ ئەوان دە زیندانی كرد . لەگەڵ كاك حەمە باسدا دۆستی كۆن و ناسیار
هێنا مە دیوەكەی خۆم . پاشان كاك قادری كوڕی كاك حەیدەری دێبوكریان لەگەڵ چەند
كەسی دە ژووری كرد . چەند ڕۆژی تر كاك ڕەزاقی فەتاحی قازی قزلجەیان هێنا .
هەموو لە دیوەكەی من بوون . ئێواران شاییمان دەكرد و محەممەد جەمیرانی گۆرانی
بێژ گیرا بوو گۆرانیمان پێ دەگوت . هەر ناوی زیندان بوو دەنا زۆر خۆشمان ڕادە-
بوارد . پاشان لەگەڵ هەموان بووینە ئاشنا و دۆست . كاتێك ئازاد كران كاك
ڕەزاق چەند جار دەهاتە مولاقات و ماست و ڕۆن و كولێرەی ناسكەی بۆ دەناردم .
كاك حەمە باسی ماسوێ بوو بە ئەندامی حیزب و هاوكاری دەكرد و پێش ئازاد بوونم
دەستێك كوت و شالواری بۆ ناردم بۆ زیندان . كاك قادری دێبوكری دەهاتە لام و لە
كوێستانی مەیدان بە لەك بانگی دەكردم .

## فەقێ محەممەدی گاپیسی

ئێوارەیەك فەقێیەكی مێرمنداڵیان دە زیندان كرد . دایان بەو ژوورەی كە قادر ئەختەری تێدا بوو . لە فەقێم پرسی : " لە سەرچی گیراوی ؟ "
- خەڵكی گاپیسی شاری ویرانم . لە عێراق دەم خوێند . لە گەڕانەوەدا لە نێزیك -
سەردەشت ژاندارم گرتیانم . " .
تۆزێك پشكنیم بزانم داخوا ئاگای لە سیاسەت هەیە یان لە عێراق چ باسە . دیتم
كە ڕێكە لە ودەشتە و هەر تەقەی لە سەری دێ .
بەیانییەك لە خەو هەستا بووم دیتم كابرایەكی زەلام بە ناوی عەموڵا زەلامە
كە بە تاوانی ژن هەڵگرتن گیرا بوو ، خەریكە لەخەوم هەستیقی . گوتم ئەوە چییە ؟ بەو
شەوە لە چی دەگەڕێی ؟
- پەنام بۆ هێناوی . بۆ خاتری خوا ، ئەو فەقێیە بوختانم پێ دەكا دەڵێ شەو هاتویە
سەر جێگام .
- وەدەركەوە سەگباب . زیاد لە هەموو كەس بۆ بوختان بە تو دەكا . وەدەرم نا . بەیانی
فەقێ هات و دەستی كرد بە گریان . گوتی عەوڵا زەلامە هاتۆتە سەر جێگام و خەبەر هاتوم

بە یاتی فەقی هات . دە ستی کرد بە گریان . گوتی : " ئەوسە کبابە شەوهاتــە سەرجێیگام وە خــە بەرهاتم . چــە ند کەس لەحەساری زیند انراوە ستا بوون گوتــم دا لەوسەکبابە بدە ن . دایکژانیّ و باشیان گوتا ولە لید اندا سەری شکا .
پولیسرهات . کابرایان بردەدەر وخە بەریاندا بە دادسەرا . بازپورسرهات .
هاتە دیوە کەی من و رووداوە کەم بۆگیراوە . گوتم من بە خەلکم گوتوە لێ ی دەن . ئــەوە سوکایە تیە بە دین .
عــەولا زەلاســە یان پینج روژ لەژووریکی تە نیا کرد وفــە قێشیان بە ئیلتزام بەردا .
ئەوجە نابــی فەقی یە ببوە ئەم مــە لا محە مەدە ی کە لە زیندانێ لەسەر برادەرانــی حیزبی ببوەجاسوس و چوو بوو لە قــوم بــبوەشیعە و پانزەخانی ریژیمی شادژی کــورد کاری دە کرد .

لە زیندانی مــە هاباد تەواوی گوڤارە کانی ئیرانیان بۆدە هینام . یەك دوو پاسە وان هەرچــی ویستبام بۆیاندە هینام . حاجــی مــەلا خالید جار وبار دە هاتە لام برادەرانی کونی حیزبەدە هاتن و لە بێ خە بەری وراوە ستانی خە بات سکلایان بوو .
دلخوشیم دە دانــە وە دەمگوت خوتان پاكرابکرن ریگای خە بات دژوار و دریژە .

محــە مــە د جــە یــر ان

محە مەد جەمیران گۆرانی بیژێکی ناوچــەی سەر دەشت بوو روژیك دە ژووری یان کرد .
زور بۆشناغ وکەوا وپانولیکی شازلەبەردا دە یگوت دە مانچە یان لێ گرتووم . هــە مــوو ئیواران هە لپە رکیمان سازدە کرد وجــە یران گۆرانی دەگوت . حە یرانی خوشی بــۆ دە گوتین . محە مەد جە یرانیاندا بەدیجرقادر ئاختەتەری . کوتبووی چل تمە نم پول بێ بوە لەدەفتەری زیند ان رایان گرتوە . قادر ئاختە تەری بە هیوای چل تمە نــە سیغار وچاو نان وچیشتی دا بویە . جــە یرانیش بە هیوای خوا باشی خوارد بــوو.
نیوە رویە ك راکشا بووم کویم لێ بوویە کیك بە سەبروکە بانگم دە کا . کە سەرم هەلینا حە مە د جەمیران وە ك چــە لەکەی دریژ بەکراسودەرپی یەکی دە لینگ قولە وە راوە ستا

شـه ومچی یه مجه مه د .

ــ چت عـــمرزكم . كاك قادر كەواو پانتول وشمده ویشتیندی لیّ ئه ستاندووم .

ــ بۆچـــی ؟ بەکیشه هاتوون ؟ عـــه یب ناکەن ؟

ــ کیشه مان نەبوه . کلفـــه زیئازاد پم هاتـــوه . منیش ئەو ماوه یه لەسەر حیسابی کاك قادر سیغار ونان وچیشت وچـــام خواردوه . حیسابمان کرد چل تمه نـــی کەوته سەرم . پولیشم نـــیه . لیباسه کانی لەجیاتیان لیّ ئه ستاندووم . ئیستا ئاوا رووت و قووتم دەبینی . جا ئاوا چون دەچمه دەر . هاتووم عیلاجیکم بکه ی . هەر منداڵ دەکەونه دوام و دەلیّن شیّته ."

ــ ئاخر تۆنه ت دەگوت لەدەفتەر پولم هـــه یه ؟

ــ وەلا هیچم نه بوو گوتم با وا بلیّم ئاخری یه کیك وەدوام هـــەر دەکەویّ پولیکی لـــیّ وەر دەگرم . ئیستا ئازاد یان کردووم . که سیش یار نیه . هاتوومه لای تۆ . قەت ئیشه ناهیّلی ئاوا بچمه دەر . ".

زینندانی دیکه لیّی وەکۆبوون وکالته یان پیّ دەکرد .

ــ بابم خواردن ریانه وەی دەویّ .

ــ راست وچـــه پ لیّی دەدا پیّی موفت بوو

ــ رۆژ نه بوو هیلکه ورۆن نه خوا .

ــ باللی . . . ئاده من تومانی چخادلار ( واته بەلیّ دەمریّ ی پیاو دەردینن) عـــه جـــه میکیش به شی خۆی تی خست .

گوتم قادر بانگ کـــه ن

قادر هات . دیوه کەم بوو به مزگەوت . پولیس یەك دووجار دەنگی خه لکی دا .

ــ لیّ یان گەری سه یریکی ناخۆشه .

گوتم کاك قادر جا توخوا دلت دیّ جـــه یران ئاوا بنیّریه دەر . کوره بایـــی سه د تمه ن هەر حه میرانی بوگوتووین .

ــ کاك کەریم ئەوه دەمیّ هەر ئاوای لیّ بکه ی . له حه میفی دروکانی رووتم کردوه . با گوتبای پولم نیه . له کەل من ژاره ماریکی هەر دەخوارد . بەلام قه رمانی دەدا . وەلا ئاغا . . . . . وا ناخوا .

ــ ئیستا چـــی له کەل بکه ین ؟ هەر ئاوا یه رووتی بروا ؟

ـ چاوی دەری . خوکەواو پاتولەکانی چل تەمەن ناهێنن . چل تەمەنم پێ قەرزدارە .
خۆت دەزانی من بە تاوانی قەتل گیراوم . کەرتایە سەرمیدا . چل تەمەن بو من زورە "
ـ نە دەکرا بەقادر بلێم دەست لە چل تەمەن هەلگرە . پیشمناخوشبوو جەیران ئاوا
بە رووتی بچێتەدەر . ناچار کوتم : " کا قادر لیباسەکانی بدەوە . من چل تەمەنت
دەدەمێ .
محەممەد جەیران گوتی ئەوەملە گەڵ بکەی، تا مردە لە بیرم ناچێ . نا هێلم قسەت
بێتە وە سەر وئەوپولەت بۆدێنم.
قادر گوتی : " تۆ پیاوە تیت نیە . منیشئەو پولە لە کاک کەریمدەستێنم . پاشان رووی
لە منکرد وگوتی : " کاککەریم لای من بە قەت ئەوخوایە کەورەی . بەلام ئەوپولەم لە
تۆدەوێ " .
محەممەد جەیرانچووجلەکانی کردەوەبەر و هاتەوە سەر شکلی پیاوان .
لا هوایە دەپازدە روژ پێ چوو بوو لە دەفتەریزیندان بانگیانکردم . کە چوومە
دەر دیتم محەممەد جەیران لە وێدانیشتوە . بە خیر هاتنوچاك وخوشی . بە
عەمبال قەرتالەیەکی کالەك وشوتی هیناوە . کەللە قەندیك وپاکەتە چایەکی
هیناوە . گوتی :
ـ چاکەیتوم پێ نادریتەوە . ئەوقەند وچایەم بۆ قادر ئاختە تەریهیناوە . ئەوەنی چل
تەمەنە کە . بەلام بانگی ناکەم . ئەو کالەك و شوتیەشم بۆتۆهیناوە " .
ـ دەیمحەممەد ئەوە چت کردوە ؟
ـ ئەوروژەیلە زیندان هاتمەدەر لە مەیدانی ئاردەخولاسەوە . گوێملێ بوو
دووکەس خەلکی حاجیالی کەند بۆ سەرشایی لەکۆرانی بیژدەگەرین . گوتم
من گورانی بیژم . لە گەلیان چم . داوەتم بۆگیرانپولیکی باشم وەگیرکەوت . چوومە د
گوندی دەرمان لە وێش داوەت هەبوو پولیکم بۆهات . ئەوە قەرزیکاکقادر وهەتا
مردنیش چاکەی تۆم پێ نادرێتە وە .

## گروهیانی حیزو بە قەستی

ڕوژیك وەكیل داخیلەهاتە ژوور و گوتی : زیندانیە كمان هەیە تا دە ینیرینە تەوریز با لە دەیری تۆ بژی .
ــ قەی نا كا بینیرە . كە هات هەتیویكی لووسی جوان . جلی نیزامی خاوین لە بەردا وریك و پیك . پیم وابوو گروهیانی ئەرتەشیە و بە ئانقەست بوجاسوسی ناردویانە بزانی من لەزیندان چ دەكەم . جار وبار یەكدوو كەس دەهاتنە لا ئەوانیش لا یان وا بوو جاسوسە و یا بو پلانیك ناردوویانە . دەمیانگوت ئاگات لەخۆبێ .
سێ ڕوژ پێ چوو هەتیو خوێ نیشان دا . هەتیویكی بلێ وحیزو لە سەرد زی گیرابو . بانگی بەرایم خەلیلم كرد گوتم ئەو هەتیوە لێرە لا بە . بردیانە دەر و چەند ڕوژ لە دەفتەر ڕایان كرت و پاشان ناردیانە تەوریز .

## لوقمان زادەی میاندواوی

كابرایەكی ڕوتەلەی فەقیریا هێنیا وبە تاوانی تودەیی دەژووری یان كرد . تاوانبار كرا بوو گویا لە گەل موسكو پیوەندی هەیە . پیاویكی نەخوێندەوار بەلام قسە خوش و گالتەچی . دەیگوت دوو ژن وحەوت مندالم هەیە . هیچیش شك نابەم .
ڕوژیك پاسەوان بانگی كرد : " لوقمان وەرە دەر ناسیار هاتوە
ــ ئە من و مولاقات . سەیرە ، كێ سەری مندەدا ؟
لەپەنجەرەوە بانگی كرد ناتوانم بێمە دەر . كێ هاتوە با لێرە وە بزانم چی دەوێ عەجەمیكی ڕوتە لە سلاوی كرد وگوتی : " لوقمان ئەوە هاتبومە ئێرە ودەچمەوە هاتم بزانم هیچ كارت نیە ؟ .
ــ زور مەمنونم . كاری زور پێویستم هەیە . تكا یە ئەگەر چوویەوە حاجی وسین قولی دەناسی ؟
ــ بەلێ دە یناسم

ــ كە وایە بچو لەجیاتی من دوو تف دە رووی حاجی وسین‌قولی بکە . کارم ئەوەندەیە .
کە لیک‌پیکە نین وکوتم لوقمان جا ئەوەش‌بوو بە کار؟ حاجی وسین‌قولی کێ یە؟
ــ عامیلی قەند وشەکرە . سێ‌مانگ بوو قەند و شەکرینە دە دا . چووم بەری دوکانم پێ‌کرت ورد اوای قەند و شەکریدە وله تیم لێ‌کرە . چوتە شارەوانی وکوتوویە لوقمان زادە تودە یی یە . هاتن‌گرتیانم . لێ یان‌پرسیوم تولە کەل موسکو پیوەندیت هەیە!

## عەلی بەگی خوا جە میر

لە هەموو ناوچەکانە وە زیندانیان بۆ مەهاباد دە هینان . هە لیک‌بوو مـن لە گەل خەلکی‌جور بە جوری‌ناوچەکانی‌کوردستان دە بوومە ئاشنا . زور کەس قەولی هاو کاریان‌دە دا و بە وەفا دە مانە وە . جاری‌وا دە بوو زوورەکان پر دە بوون .
زور کەس بە نا هەق دە گیران و ۋاندارمە شلتاخی پێ‌دە کردن .
ئیوارە یەک‌گوتیان ئاغایەکی بانە یان هێناوە . بە کیکم نارد گوتم بچوو بزانە ئەو بانە یی یە کێ یە ؟
هاتە وە کوتی : "عەلی بەگی خواجە میرە نیزیک‌بانە . من عەلی بەگم نە دەناسی بەلام دە مزانی عەزەی‌کوری ئەندامی حیزبە . هاتمە دەر و کە چوومە ئەو دیوەی عەلی بەگیان دا بوویە دیتم لە سەر کەوشان لە بەر دەرگا جیگایان کرد وە .
دانیشتم و بە خێرهاتنم کرد . پاشان گوتم فەرموو با بچینە‌حەسار . حەساری ئیرەش ناخوش‌نیە . لیم پرسی لە سەرچی گیراوی ؟
ــ کیژیکم بە میرد بوو هاتبوە ما لێ بە میوانی . روژیک چوّتە دیوە خان و تفەنگ‌لە وی بومو خوّی‌کوشتوە . ئیستا منیان گرتوە وهیناویانمە ئیرە . "
ــ جا ئیستا تفەنگی چی ؟ توّ بوّ تفەنکت لە مال بـوە؟
ــ تفەنگی دەولە تیم لە کنە . لە ناوچەی‌بانە دە ولەت تفەنگی داوە بە ئاغاکان . بە خوا منیشروەرم‌گرتوە ".
ــ ریژیمی شا خوێ بە ئاغایانەوە را گرتوە .. کورد لە خزمەتی بیگانە چەند ئازایە . دەی عەلی بەگ تو پیرو بێ تاقەتی . لە نیّو ئەم خەلکە ناحا ویّیەوە وەرە دیوەکەی‌من .
عەلی بەگ مات‌بوو . کوتی : " توّش لێ‌ی چی ؟ . لە دەفتەر بە منیان کوت

یەکێک بە تەنیا لە ژوورێک دەژی ، هاتووچۆی مەکە با یارت قورستر نەبێ .

گوتم بە قسەی پاسەوان بێ کەس نابێ وێک بکەوێ . من خۆم ڕێگا نادەم کەسی تر بێتە لام . جاران یانەیی ئازا بوون . بەلامەوا دیارە ئەوەی تەقە نەکە لە دەولەت وەرگری ترسەنۆک دەبێ . لامەوایە عەزەی کوڕت لە تۆیە غیرەتترە "

کە وام گوت عەلی بەگ چاپکی لێ کردم و گوتی : " نازانم بلێم چی؟ باوکم بە خوا من ناوی تۆم بیستوە وێکەوتنت سەدەمەیە .

ــ دەی بڕۆ شتومەکت بێنە و وەرە لای من . عەلی بەگ هات . پیاوێکی دنیادیتوو، قسە خۆش . کاتی خۆی لەگەڵ شێخ مەحمود بوە و باسی شعری شێخ مەحمودی بۆ دەگێڕایەوە . کەم کەم هاتە سەر باسی کوردایەتی و سوتابوو . ئازادی کوردستانی دەویست بەم شەرتە عەشیرەتچە کەدار بن . ئاشکرای کرد کە هاشمی اقل الطلاب و بەگی دیکە هاتووچۆی مالی دەکەن و لەگەڵ عەزەی کوری سەرت و خۆرتیانە . کاتێک ئەوەی بۆ دەگێڕایەوە کە ناوی عەزەی دەهێنا گەش دەبوو و بزەی دەهاتێ .

ڕۆژێک بانگیان کرد . چوە دەر و کە هاتەوە زۆر مات و خەمبار و دلگیر بوو .

ــ ئەوە چییە عەلی بەگ خودا بەد نەدا بۆوا تلی هات ؟

دەستی کرد بە گریان گوتی : " شێخ مەحمود وەفاتی کردوە . مەیتەکەیان هێناوەتەوە سولەیمانی . دوکان و بازار داخراوە . خەڵک بە گشتی بە پێشوازی مەیتەکەوە چوون . بۆتە خۆپیشاندانی سیاسی . پولیس تەقەی لە خەڵک کردوە گویا کوژراو و برینداری هەیە . "

ڕۆژێک پاسەوان کابرایەکی هێنا و گوتی : " ڕەئیس گوتوویە ئەم دوکتورە با لە لای تۆ بێ تا دەینێرنەوە سنە . کابرا مرۆڤێکی ویچووخاوێن ، چەمەدانێکی پچوک بە دەستەوە هاتە ژوور . بەخێرهاتنم کرد و دانیشت . تاوێک پێچوو لێم پرسی بۆ گیراوە .

ــ لە دێهاتی دەور و بەری سنە کابرایەک نەخۆش بوە . چومە سەری تەماشای کردوە ئامپولی لێ داوە کابرا مردوە . ئێستا بازپرس گرتوویەتی .

دەرکەوت کە کابرا مردوە ئەو وەرای کردوە بۆ ناوچەی بوکان . لەوێ گرتوویانە . کابرا چەمەدانی کردەوە و لە نێو کتێبێک ڕەسمی شای هێنا دەر و بە پونیزێک لە پشتی چەمەدانی دا و لە تەنیشت خۆی دانا .

لیم‌پرسی ئەوە چیە ؟ . خۆشیەودوکانی عەکاسی وێنەگری نیە . ئەمەت بۆ هێنا دەری ئەمە رەسمی کێیە ؟

ـ چۆن ئەمە ناناسی .؟ ئەمە رەسمی ئەعلاحەزرەتە وئەشێ لە گشت مالێك هەبێ .

ـ تۆ پیاوێکت کوشتوە وئیستا ئەتەوێ بەم رەسمە خۆتە جات بدەی ؟ پاشان من بو نەمانی ئەم کەسەتیکوشاوم و بەوتاوانە گیراوم . تۆ چون رەسمی ئەوله ژووری من دەدەی ؟ چونکە من نامەوێ بیبینم .

ـ ئێرە زیندانە . مەردم لێرەدا ئازادن چی بکەن؟

ـ ئێرە زیندانی ئینسانانە . تۆ پیاوکوژی . ئەمەش بچیە نێو پیاوکوژان . هەستە لێرە وەدەرکەوە . پیاوکوژ .

عەلی بەگ لەم دەمەدە توزێك ترسا وپاشان وەدەنگ هات وگوتی :

ـ دوکتور تۆ ئیوانی ئەمپراطۆرەی ، هەق نیە ئەم قسانە بکەی . ئەمە ژووری ئەوە ٣٠ سالە لە زینداندایە . دەتوانی بچی لە دیوەکانی تر رەسمی شا لە سینگت بدەی .

کابرا سنە یی بوو ، دیار بوو دەیویست دڕێژە بەم چەقە کردن بدا . گوتم لە سەری مەروٚ هەستە وەدەرکەوە . تۆ پیاوکوژی چۆن دێلیم لە ژووری من بی ؟ چووپانگی پولیسی کرد . برایمخە لیل هات . گوتی : " تکایە با ئەوشەو لێرە بێ " .

ـ ئەوە پیاوکوژە ناهێلم سەعاتێك لە ژووری من بێ . زیندانی قاتلتە هەن بیبە با لە کن ئەوان بژی . بردیە دیوێکی تر کە سی و ٣ کەسی تێدا بوون . نیزیکەی دەروژ مایەوە . زیندانیم فێر کردن نارەحەتی بکەن . لێم لە هەمرا دا گوتم ئەوە کوندییە کی کوشتوە و رای کردوە . لە وێشرا یان هێشت رەسمی شا هەلاوەسی . پێم وایە خوشی لێ نەگوزەرا .

عەلی بەگ گوتی باوکم تۆ کە لە کابی ئەکەی . بە خوا ئە ترسم تووشی بەلایەکت بکەن .

شەقی سی دیناری

کابرایەکی خەلکی گوندی سەشیخ گیرابوو . دەیگوت ئاشێکم هەیە . حەمەی قادر ئاغا بۆ ئەوە ئاشە کێك لێ بستێنی ، کوڕانی کابرایەکی بە ستوی من دا هیناوە .

عەزیز زەلامێکی قەبەی زلحول، دەیانگوت شێتە . زور دەهات لە ژوورەکەی من مات دەبوو . سیغارێکم دەدایە وەقسە دەکەوت . دەیگوت :

ــ کوره تۆ نامەیەکم بۆ بنووسە با ئازادم کەن . یا خۆت لیم گەڕێ با برۆمە دەر .
دەلێن بە دەست تۆیە . بیچارە تیکچوو بوو. عەزیز کەلاشێکی لە پێ دا بوو تا
ئەودەم پیلاوی ئاوانە دیبوو.

ڕۆژێك لەگەل عەلی بەگ لەحەسار هاتوو چۆمان دەکرد . عەجەمێکی ڕووتە
لەسەر دزی گیرا بوو لە پرشەقێکی لەعەزیز هەلدا .

عەزیز کە وتە سەری و سووراندی . کە یەنتە پیشێیە وعەجەم هەلەتکوت .
عەزیز کە یەنتە سەری و شەقێکی لیّدا، بەدەم وەدەحەوزی ئاوی هاویشت .

عەلی بەگ گوتی : " ئوخەی وەلاهی وامزانی دەخۆمی هەلدا . ئەم
شەقە لەسولەیمانی برا باید ا بەبرا بە سی دینار ".

عەولای حەمەجنداری

کویخا عەولا خەلکی گوندی سەرەبانی ناوچەی سەردەشت بوو. بە تاوانی قەتل
گیرا بوو . کویخا عەولا لە ولاتی خۆی کە یخودا و ریش سپی تایفەی خۆ بوو. لە زیندان
زور کەسابوو . حەیرانی خۆشی دەگوتن . ڕۆژێك هاتە لام گوتی :
ــ کاك کەریم لە ولاتی خۆم زور پیاو بووم . خەلك بە پیاوی دەزانیم . خوێنم دەکوژاند
نەوە . مەسەلەی ژنی بە میردم دەکرد . ئیستا کە وتوومە ئیرە کەس لیمنا پرسی .
خالی دەسەگبابی زوردەولەمەندم هەن، ئەوسەر هەل نادەن . زور بێ
پارەم سیغار کیشم ئەو ڕۆ سیغارم نە کیشاوە . کەسیش نیە پولیکی لێ قەرزکەم ."

دلخوشیم داوە . هیندیکم پول دایە . ڕۆژێ دەهات لە ژوورەکەی من دا دەنیشت
جاری واهە بوو لە خووە حەیرانیکی تێ هەلدەکرد . ڕۆژێك هات دا نیشت و دەستی
دەئەژنویان وەرێنا بوون ودەکریا .

ــ کویخا عەولا بۆتوعەیبە دەکری . پیاویکی دنیا دیتووی . زیندان هیچ نیە .
ــ کوره نازانی بۆچی دەگریم؟ . بوئاینی دەکریم ئاینێ . هەرسیك تەلاقم
کەوی قوزی وەك قمیسی وایە هەر ئەوەندوکە یە . ( ئاینی ژنی بوو) .

ئیوارەیەك لەحەساری زیندان هەلپەرکیمان سازکرد و یەکیش گۆرانی دەگوت.

عەلی رەبیعی پاسەوانیکی خەلکی مەهاباد ، لەسەر بانکیشکی دەکیشا . بانگی کرد :
ــ ئەو زمرە زمرە چیە . ئەوشایی پە تێکدەن .
کوتم کورە تۆ بۆ هینندە بێحەیای . بەتۆچی ؟ تۆ کیشکی سەر بانی . بۆقسە بە خەلك دەلێی ؟
ــ قسە یان پێ دەلیم وچاویان دەردێنم .
ــ ئیمەئەوە شایی دەکەین تۆومرە مەهێلە . پاتر تاویك عەلی رەبیعی هاتە ژووری زیندان کوتی کوا ئەوسە گبابەی کورانی دەگوت؟
کوتم : " هەنیوە تو بوئەوەندە بێحەیای . تۆسەگی سەر بانی کیشکی خوت بکیشە بۆهاتوویە ئیرە . خەریك بووچەقە بکا بە زیندانیەکانم گوت وەدەری نین .
غاریان دایە وبوو بە هەرا . دووسێ شەقیان کە یان وئە فسەری کیشك هات .
گوتم ئەوە پاسەوانی سەربانە بۆهاتوتە ئیرە جنێودەدا و شلتاخ دەکا . ئیستا بۆ سە روکی زیندان دەنووسم . عەلی رەبیعی بردەدەر وتێ هەلدانی پێ ما .
زیندانیەکان بەبونەمەریەم . چاویان کرا بوو‌ە . ئەوانەی ئازاد دەبوون پاشان دەهاتنە وەسەریاندەدام .
هەرچەند لەئازاد بوون وەنیزیکدەکەوتم فیکر وخەیالم پەریشانتر دەبوو . بیرم لە ژیان لەمخەبات لەدوا روژ دەکردەوە . بێ مال وحال ، بێ پول ، پیرە دایکیك لە سەر مالان .
بیر لە نەخشەی تیکوشان ، پیوەندی گرتن لەگەل هاوریکان ، هەزار فیکر وخەیال ونەخشە . ئاخرەکەی روژی ١٦ ی پوشپەری سالی ١٣٣٦ ( ١٩٥٧ ) لەزیندان ئازاد کرام . لە زیندانی شارەوانی مەهاباد ، لە چوار دیواریکی پچوك وپەرژینی سەربازوپاسەوان هاتمە دەر وکەوتمە زیندانیکی گەورە و بەر فراوانوسەر ئاوالەی ئیران وکوردستان .

کوتایی جەلدی یەکەم

xxxxxxxxxxxxx
xxxxxxxxxx
xxxxxxxx

## پێرست

## بــه‌شــــی چــوا ره‌م

## بەشی پێنجەم

## بەشی شەشەم

## تکایــه ئــهم هــه لانــه راست بکه نهوه

| لاپــه ره | دێــر | هــه لــه | راســت |
|---|---|---|---|
| ٣٢ | ١٨ | کورده‌کان | کورد ه کان |
| ٣٣ | ١١ | نامه که‌ش | نامه که شــی |
| ٧١ | ١٨ | ئابرویان ده‌بمن | ئابرویان د ه بــه م |
| ٩٤ | ١٠ | دەرمخ | د ره بکا |
| ١٣٤ | ٧ | دیناسیم | د ه یناسیم |
| ١٤٢ | ٤ | لی وەلا کرت | لی وه ر گرت |
| ١٥٠ | ١ | بزاری کرد م | بیزاری کرد م |
| ١٦٤ | ٥ | خه ك | خــه لك |
| ١٨٥ | ١٥ | هه وا لەری | هه وا لده ری |
| ٢٠٠ | ٣ | دەکری بین ببینم | بیان ببینم |
| ٢٠٠ | ١١ | لەو بەریان | له وی به ریان |
| ٢٠٢ | ٦ | نه وچــه | نا و چــه |
| ٢٠٣ | ١٠ | کندیان | گو ند یان |
| ٢١٨ | ٤ | حــه ر مــه | حــه را مــه |
| ٢٢٥ | ٥ | ئیرن | ئیران |
| ٢٢٦ | ٣ | لا زان | لاوان |
| ٢٣٩ | ٥ | نتــوانــی | نا تــوا نــی |
| ٢٧٧ | ١٥ | قه ول | قه و لــی |
| ٢٨٠ | ٦ | خه نجه ریك | خه نجه ریکی |
| ٣٠٨ | ٢٤ | ئاشه کیك | ئاشــه کــیم |

بەرهەمە نووسراو و وەرگیراوەکانی ـ نووسەر

١ ـ کاروانێك لە شەهیدانی کوردستانی ئێران
٢ ـ وەلامێك کوردی و فارسی
٣ ـ رێنوێنی شەڕی پارتیزانی
٤ ـ لە دەوری رێکخراوی لاوانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران کۆبینەوە
٥ ـ رەخنە و لێکۆلینەوە لە سەرکتێبی کاك حسێنی مەدەنی
٦ ـ چەند قسەیەك لە گەل خەبات
٧ ـ کورد و فەرهەنگی بێگانە
٨ ـ لێکولینەوەی "کورتە باسێك لە سەر سوسیالیزم" کوردی و فارسی
٩ ـ تایبەتی کونگرەی شەشەم
١٠ ـ کوماری دێموکراتی کوردستان(١٩٤٦) یا ـ خود موختاری

---

## وەرگیراوەکان

---

١ ـ دایك ـ ماکسیم گورکی
٢ ـ وتار وکردەوەکانی لینین
٣ ـ ئەفسانە کوردیەکان ـ رودینکو
٤ ـ زەوی پچووك ـ لیونید بریژنیف
٥ ـ مەسەلەی کورد لە پارلمانی سوئید
٦ ـ قانوونی ئەساسی ئابووری سوسیالیستی
٧ ـ کومەلە چیروکێکی هەلبژاردە لە ئەدەبی بێگانە
٨ ـ حەمەچکول ( ئیجەمەدی یاشار کەمال) دراوە بە ئەنستیتوی کورد لە پاریس بو چاپ کردن
٩ ـ ئوسوولی سەرەتایی یەکانی فەلسەفە ( ژورژ پولیتزر)
١٠ ـ نامەکانی کوللە باران کراوەکان ـ لوسین شلیر
١١ ـ کورتە مێژوییکی بولغارستان ـ دیمیتر مارکوفسکی